# مێژووی
# زانایانی کورد

دانراوی

مەلا طاهیر مەلا عبد الله بەحرکەیی

بەرگی دووەم

- ناوی کتێب: مێژووی زانایانی کورد.
- ناوی دانەر: مەلا طاهیر مەلا عبداللە بەحرکەیی.
- ژمارەی بەرگ: بەرگی دووەم.
- نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم.
- ساڵی چاپکردن: ٢٠١٠ز
- ناوی چاپخانە: چاپخانەی ئاراس.
- لەسەر ئەرکی کۆڕبەندی هزری ئیسلامی چاپ کراوە.
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە.
- نەخشەسازی بەرگ: أحمد فاتح محمد.
- خەتی بەرگ: عبد الباسط ملا مسعود.
- دیزاین و سەرپەرشتی چاپ وپێداچوونەوە: أبوبكر مەلا طاهیر.

أَعُوذُ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ لَقَدْ كَانَ فِي قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِي بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَيْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾ ﴾،

سورة يوسف

- ص-

## صابیر حەسەن دارەتوویی (٥٨٤)

ناوی صابیرە، کوڕی حەسەنی کوڕی محەممەدە، ساڵی ١٩٢٠ز لە گوندی (دارەتوو)ی نزیك هەولێر هاتووتەدنیا، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، لە چەند شوێنان گەڕا: چووە (سوریژە) لای مەلا عبداللەی فەرهادی، بەشێکی تەفسیری مەداریك و سەید عبداللەی صەرف خوێند، پاشان چووە مزگەوتی حاجی قادر دەباغ، لای مەلا عبدالله بێتواتەیی ماوە، تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

ئەمجا بووە مەلا لە (سێبیران) نزیك (قوشتەپە)، دوایی چووە (گولدەرە) ناوچەی ساڵەیی، لەوێ فەقێی هەبوون، پاشان چووە کۆمەڵگای (کەلوڕ)، پاشان گەڕاوە گوندی (کونەگورگ) نزیك (هەولێر)، لە ١٤/١٢/١٩٨٤ز دوای نوێژی هەینی بە کارەساتی سەیارە لە نزیك هەولێر، لەگەڵ مەلا محەممەدی (باغەمرە)ی کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الإكليل في محاسن أربيل ٣٥٠ - ٣٥١

## صاحیب مەحمود قەرەداغی (٥٨٥)

ناوی صاحیبە، کوڕی مەحمودی کوڕی شێخ عبداللطیفی قەرەداغی یە، لە دەوری ساڵی ١٢٩٠ك - ١٨٧٣ز هاتووتەدنیا، خوارزای سیراجەدین شێخ عوسمانی تەویلەیە، لە خزمەت باوکی زانیارییەکانی عەقلی و نەقلی تەواوکرد، بەداخەوە لە کاتی گەنجی ساڵی ١٣٢٠ك - ١٩٠٢ز جوانەمەرگ بوو.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٤٥.

## صاحیب نەزیر تەویلەیی (٥٨٦)

ناوی صاحیبە، کوڕی نەزیری گچکەی کوڕی نەزیری گەورەیە، لە دەوری ساڵی ١٣٢٥ك - ١٩٠٧ز هاتووتەدنیا، منداڵ بوو باوکی کۆچی دوایی کرد، کە فەرازیی[1]

[1] فەرازی بوو، واتە: هەراش بوو، کەمەك گەورە بوو.

بوو ناردیانە خانەقای (دوورود)، ساڵی ١٣٣٧ك تەصریفی زەنجانی لای مامۆستا عبدالکریم (مدرس) خوێند، پاشان چووە ناوچەی (هەڵەبجە)، دوایی چووە (قەرەداغ) لای شێخ نەجیب و شێخ مصطفا، ماوە لەوێ تا ئیجازەی لە خزمەت شێخ نەجیب وەرگرت، ئەمجا گەڕاوە (تەوێڵە) کرا پێش نوێژ و وتارخوێن و دەرس بێژ، ماوەکی زۆر خەریکی جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی بوو، لای خەڵکان و شێخەکان زۆر بەرێز بوو، پاشان باری کرد بۆ (هەڵەبجە)، ساڵی ١٣٩٥ك - ١٩٧٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٤٥ - ٢٤٦.

٢. بنەماڵەی زانیاران ٤٢٨ - ٤٢٩.

## صادق ئەحمەد کۆیی (٥٨٧)

ناوی صادقە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەسەنە، یەك بوو لە مەلایە چاکەکانی سەردەمی خۆی، لە مزگەوتی مەلا جامی (کۆیە) دەرسی داوە، فەقێیان قۆناغی کۆتاییان لەلا دەخوێند، ماوەك کرا قازی (ڕانیە)، بەردەوام بوو لەسەر کاروباری مەلایەتی، تا ساڵی ١٩٥١ز کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی مەلای هەبوون:

١. مەلا ظاهیر: لە جێگای باوکی کرا مەلا، دەستی شیعری هەبوو، چەند نامیلکەی پەخشان و شیعری دەرکردووە.

٢.مەلا طاهیر: لە (کەرکوك) دەرسی دەدا.

سەرچاوەکان:

١. الإكليل في محاسن أربيل ٢٩٥.

٢. محمد عبدالله جلي ١٢٧ - ١٢٨.

## صادق نویهەنگی (٥٨٨)

مامۆستا صادق لە دەوروبەری ساڵی ١٣٠٠ك - ١٨٨٢ز لە گوندی (نویهەنگ) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە (سنە) لای مەلایە

چاکەکانی ئەو سەردەمی شەریعەت و زانستەکانی تەواوکرد، گەڕاوە ناوچەی خۆی، دەستی کرد بە کاروباری مەلایەتی، دەرسی فەقێیان، ئامۆژگاری خەڵکان، پێکهێنانەوەی دووبەرەکیان، لەبەرئەوەی خەڵکان ئەو کارە پیرۆزانەیان لێ دەدیت، زۆر ڕێز و حورمەتیان دەگرت و خۆشیان دەویست، لە ١٣٦٥ك – ١٩٤٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٤٦ – ٢٤٧.

## صادق حارس ماویلیان (٥٨٩)

ناوی صادقە، کوڕی حارسی کوڕی حەسەنە، ناسراوە بە عەگید، ساڵی ١٨٨٤ز هاتووتەدنیا نەوەی شێخ نەبی ماویلی یە، لە سەرەتاوە لەلای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە لای مەلای گوندەکە، پاشان چووە لای مەلا ئیسماعی ماویلی، دوایی چووە لای مەلا عبداللّٰهی (سەران) ماوەك ئاودیوی (ئێران) بوو، لە (لاجان) و (مەهاباد) و (شنۆ) خەریکی خوێندن بوو، پاشان گەڕاوە (کۆیە) لای جەنابی مەلا محەممەدی جەلی، ماوەکیش لە (بالیسان) لە لای شێخ طاها بوو، دوایی هاتە (هەولێر) لای مەلا محەممەدئەمینی کونەفلوسە، پاشان چووە (ڕواندز) لە خزمەت مەلا ئەسعەدی خەیلانی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا، لە (ماویلیان) دەرسی دەداوە، دوایی چووە (زێوە) پاشان گەڕاوە (ماویلیان)، دووبارە چۆوە (زێوە)، دیسان گەڕاوە (ماویلیان)، بەردەوام بوو لەسەر دەرسدانەوەی فەقێیان، تا ساڵی ١٩٣٠ چووە (بیارە) لە خزمەت شێخ عەلائەدین تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت، وازی لە دەرسدانەوە هێنا، دەستی کرد بە بەلاوکردنەوەی تەریقەت و ئامۆژگاری خەڵکان.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا یەحیای گەردی، مەلا شەفیعی دێلیزیان و مەلا محەممەدی زێوەیی.

خووڕەوشتی: زانایەکی بەدین بوو، هێمن بوو، سەخی بوو، خەریکی ئامۆژگاری بوو، هەموو ساڵان دوو جار دەچووە (بیارە)، دووجاریش دەچووە (موصل) بۆ زیارەتی حەزرەتی یونس پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێ) ساڵی ١٩٥٥ز چووە سەفەری (حەج).

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٧٠ز لە (ماویلیان) کۆچی دوایی کرد، لە سەر وەصیەتی خۆی لە سەر گردی ملی گەورە، بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندز ٢٠٢ – ٢١٥.

## صادق فەرهادی (٥٩٠)

ناوی صادقە، کوڕی فەرهادی کوڕی مەولودی کوڕی عوسمانی کوڕی حەمەدی کوڕی دەروێش مەمانە، لە دەوری ساڵی ١٩٠٥ز لە گوندی (هێیان) هاتووتەدنیا، لە تەمەنی دە ساڵی داری بەرخەوانی فڕێ دا، چووە لای مەلا محەممەدی برای لە هێیان دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (دالداغان) لای مەلا ئەحمەدی خەلیفە پاشان چووە (نۆغەران) لای مەلا حوسێن، دوایی چووە (باداوە) لای مەلا عبدالقادر، پاشان چووە (پیرداود) لای مەلا ئیسماعیل محەممەد، ئەمجا گەڕاوە لای مەلا محەممەدی برای، لە گوندی (خرابە)، دوایی چووە (گردمەلا) لای مەلا طەیبی دوو شیوانی، لەوێ چووە (ئاخوڕە) لای مەلا ئەبوبەکری کۆیی، پاشان دەشتی بەجێ هێشت، هاتە مزگەوتی حاجی قادر دەباغ لە (هەولێر) لای مەلا عبداللەی بێتواتەیی، پاشان چووە مزگەوتی (قەلات)، ساڵی ١٩٣٩ز لەگەڵ مەلا سەعیدی برای و مەلا محەممەدئەمینی سوێری، ئیجازەی لە مەلا ئەفەندی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (جدیدە)ی لەك، دوایی چووە (مێرخوزار) لەوێش باری کرد بۆ (خەزنە)ی شەمامك، لەوێ چووە (سێبیرانی گەورە) لە ناوچەی بەڕانەتی، ساڵی ١٩٦٥ز دەشتی بەجێ هێشت، باری کرد بۆ (هەولێر)، لە مزگەوتی حاجی حوسێن (سمۆ) کرا پێش نوێژ و وتارخوێن.

کۆچی دوایی: لە بەرواری ١٢/٣/١٩٧٩ز لە (هەولێر) کۆچی دوایی کرد، لە گۆرستانی مزگەوتی مەلا عبداللهی فەرهادی (برای) بە خاك سپێردرا.

کورەکانی: حەمە صالّح و عثمان و عبدالرحمان و عبدالرزاق.

سەرچاوەکان:

١. الإكليل في محاسن أربيل ٣٨٨ – ٣٨٩.

٢. هەولێرم وادیوە ٨٧.

٣. چاوپێکەوتنێك لەگەڵ حەمە صالّح مەلا صادق فەرهادی.

## صادق محەممەد باشوری (٥٩١)

ناوی صادقە، کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی مەلا طاهای باشورییە، ساڵی ١٩٣٤ز لە گوندی (نۆغەران) هاتووتەدنیا، لە سەرەتاوە لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە لای مەلا خضری شەمامەری، دوایی گەڕاوە لای باوکی، خوێندنی تەواوکرد، بووە مەلا لە گوندی (چاروکی گەورە)، دەرسی فەقێیانی دەداوە، پاشان باوکی و برایەکانی باریان کرد بۆ شاری (موصل) ئەویش لەگەڵیان چوو، لەوێ کرا (مدرس) لە قوتابخانەی ئاینی سەر بە ئەوقاف، پاشان لەگەڵ ئەوان گەڕاوە (هەولێر) کرا دەرس بێژ لە قوتابخانەی دواناوەندی ئەوقاف، دوایی لەسەر داوای شێخ مصطەفای نەقشبەندی کرا پێش نوێژ و وتارخوێن لە مزگەوتی (شێخ)، دەرسی فەقێیانیشی دەدا، لە بەرواری ١/١١/١٩٨٤ز بە دوو مانگ پاش کۆچی دوایی باوکی، لە هەولێر کۆچی دوایی کرد.

## صادق محەممەد سەقزی (٥٩٢)

ناوی صادقە، کوڕی محەممەدی کوڕی عەلی یە، خەڵکی شاری (سەقز)ە، زانایەکی شەریعەت زان بووە، ساڵی ١٠٥٩ك – ١٦٤٩ز کتێبی (صرة الفتاوي)ی داناوە، لە بابەت شەریعەت، سەرچاوەکانی دیار کردووە.

سەرچاوەکان:

١. كشف الظنون ٢/١٠٧٨.

٢. تاریخ مشاهیر الکورد ١/٢٠٣.

٣. معجم المؤلفین ٤/٣١٦.

## صادق محەممەد شەقڵاوەیی (٥٩٣)

ناوی صادقە، کوڕی محەممەدی کوڕی ڕەسولی کوڕی عبداللە بەگە، ساڵی ١٨٨٥ز لە (شەقڵاوە) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە شەقڵاوە دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (بجیل) لای مەلا شێخ حوسێن، دوایی گەڕاوە شەقڵاوە لای مەلا طاها ئوصوڵ و بەلاغە و مەنتیق و ڕیازیاتی خوێند، پاشان چووە (هەولێر) لە خزمەت شێخ مصطفای نەقشبەندی شەریعەت و کەلامی خوێند، پاشان چووە مزگەوتی (قەڵات) لە لای جەنابی مەلا ئەفەندی ئوسطرلاب و شەرحی مەواقیفی تەواوکرد، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: گەڕاوە (شەقڵاوە) بووە مەلا، لە مزگەوتی گەورە دەستی کرد بە دەرسدانەوە، پاشان بەشداری تاقیکردنەوەی وتارخوێن و پێش نوێژی کرد، لە شاری (کۆیە) پلەی بەرزی هینا، هەر لەو مزگەوت کرا مەلا، لە ٢٣/١٢/١٩٤٧ز بەرانبەر مووچەی پێنج دیناری ئەو سەردەمی، مامۆستا زمانی عەرەبی و فارسی بە ڕەوانی دەزانی، چەند پەراوێزی لەسەر کتێبانی خوێندنی سەرەوە هەیە، چەند ئیجازەی بە مەلایان داوە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: (مەلا محەممەدی خۆرانی) و (مەلا سەید مەحمودی بەرۆژی) و (مەلا خضری گرتکی) و (مەلا ئیبراهیم عەلی)، لە ساڵی ١٩٦٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماء ومدارس في أربیل ١٢٠.

## صالح ئەبوبەکر ژەنگاری (٥٩٤)

ناوی صالحە، کوڕی ئەبوبەکری کوڕی ئیبراهیمە، خەڵکی (ژەنگار)ە، ساڵی ٦٦٦ك – ١٢٦٧ز لە (دەمەنهور) هاتووتەدنیا، لە (ئەسکەندەریە) پەروەردە بووە، هەر لەوێ دەستی بە خوێندن کردووە، ئیجازەی مەلایەتی لە مامۆستا(دیمیاطی) و (أبن دقیق العید) وەرگرتووە، دوایی لە (ئەسکەندەریە) دەرسی دەدا، هەروەها بروابپێکراوی دادگا

بوو لە (قاهیرە)، مامۆستا (ابن حجر)ی عەسقەلانی باسی دەکات، بەڵام ساڵی کۆچی دوایی دیار نەکردووە.

سەرچاوە: الدرر الکامنة ٢/١١٨.

## صاڵح ئەبوبەکر هەرشەمی (٥٩٥)

ناوی صاڵحە، کوڕی شێخ ئەبوبەکری کوڕی مەلا محەممەدی هەرشەمی یە، زانایەکی زیرەك و زەین تیژ بووە، خەتەکی خۆشی هەبووە، لە جەنگی ڕواندز لەگەڵ مەلا و فەقێیان بەشداری کرد ساڵی ١٩١٢ز لە بەرانبەر هێرشە دڕندانەکەی (ڕوسیا) هێنایە سەر کوردستان، لە دەوروبەری ساڵی ١٩٣٥ز کۆچی دوایی کرد، وەصیەتی کرد، گۆڕەکەی ڕاست بکرێ لە گەڵ زەوی و کێلی بۆ دانەنێن، لە پێش گۆڕەکەی باوکی بیشێرنەوە، بۆوەی ببیتە ڕێباز بۆ ئەو کەسانەی دەچنە سەر زیارەتی گۆڕی باوکی، ئەوانیش وەسیەتنامەکەیان جێبەجێ کرد، بەڵام تەختەدارەکیان لەسەر گۆڕەکە دە عەردی گرت، بۆ نیشانە، پاش خۆی تەنیا یەك کوڕی هەبوو، ناوی محەممەد.

سەرچاوە: النجم الزاهر ٨٧.

## صاڵح ئەحمەد هەکاری (٥٩٦)

ناوی صاڵحە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی عوسمانی کوڕی حامیدی کوڕی عەلی یە، ساڵی ٦٣٣ك – ١٢٣٥ز لە ناوچەی (هەکاری) هاتووتەدنیا، لە شیعر و لێکدانەوەی خەونان دەستی بالابووە، زاتەکی بەدین و بێ فیزبووە، دانیشتنی لەگەڵ فەقیران پێ خۆش بووە، ساڵی ٧٢٣ك – ١٣٢٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الکامنة ٢/١٩٩.

## صاڵح ئیسماعیل حەیدەری (٥٩٧)

ناوی صاڵحە، کوڕی ئیسماعیلی، کوڕی ئیبراهیم حەیدەریە، یەکە لە زانایە بەناوبانگەکانی سەردەمی خۆی، لە خزمەت باوکی خوێندووە و ئیجازەی لێ وەرگرتیە، چەندان زانا، لەسەر دەستی ئەو پێ گەیشتینە، ساڵی ١٢٠٢ك – ١٧٨٧ز ئیجازەی بە

مەلا عوسمان ئەفەندی مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی هەولێر دایە، لەگەڵ عیصامەدینی عومەری[١] خاوەنی کتێبی (الروض النضر) هاوچەرخ بووە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٤١.

٢. عنوان المجد ١٢٨.

٣. علماء ومدارس في أربيل ١٢٨.

٤. بنەماڵەی زانیاران ٢٣٦.

٥. کاروان، ژمارە ٨٧/١٩٩٠ز.

## صاڵح ڕەحیم ئەختەتەری (٥٩٨)

ناوی صاڵحە، کوڕی فەقێ ڕەحیمی کوڕی محەممەدی کوڕی وەستا سولەیمانە، لە ١/٧/١٩٠٧ز لە گوندی (ئەختەتەر) سەر بە قەزای (بۆکان) پارێزگای (ورمێ) هاتووتەدنیا، لە سەرەتاوە لە لای باپیری دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، دوایی چووە گوندی (سەردەر) ماوەك لەوێ ماوە، دوایی چووە گوندی (بورهان) لای مەلا شێخ بورهان، پاشان چووە (هەرتەل) دەوری پێنج ساڵان لەوێ لای مەلا ئەحمەدی (تاژانی) ماوە، دوایی هاتە مزگەوتی شێخ نورەدین لە (هەولێر)، لای مامۆستا مەلا صاڵحی کۆزەپانکەیی، ماوە لەوێ تا کۆتایی بە خوێندن هینا، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت ساڵی ١٩٥٣ز.

ئەمجا بۆ جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی لە چەند شوێنان گەڕا، لەوانە: هەسنان، سیتکان، ئاکۆیان، سەربەن، شیوەلۆك، بەستێ، سەرکان، قەلات، ماونان، وەلاش، مێرگە، کانی قرژارە، گعێتل، جگە لە ناوچەی ڕانیە و قەلادزە.

---

[١] لە (١١٨٤ك – ١٧٧٠ز) کۆچی دوایی کردووە.

مامۆستا زاتێکی بێ فێز و دوور لە دنیا بوو، مەنتیق زان بوو، وەستایی خانووبەرە و دارتاشی و دوورمانی دەزانی، خەتێکی خۆشی هەبوو، بەردەوام بوو لەسەر دەرسدانەوەی فەقێیان، تۆمارکردنی ناوەکانیان ئاسان نیە.

بەڵام ئەوانەی ئیجازەیان لە لای وەرگرتووە، بەشێکیان ئەمانەن: (مەلا ئیسماعیل ئەرگۆشی) و (مەلا جەلالی تورکی) و (مەلا مصطەفا عەبباس) و (مەلا بایزی ئێرانی).

مامۆستادانراوێکی دەربارەی بڕوایی دانراوە، بەناوی (الروح)، مامۆستا لە کۆماری (مەهاباد) ئەندامی دادگا بوو، وە لە ١٩/٤/١٩٦٥ز لە لایەن خوالێخۆشبوو مەلا مصطەفای بارزانی کرا قازی ناوچەی بالەکان، وە لە ١٧/٣/١٩٩١ز ئەو بڕیارە لە لایەن کاك مەسعود بارزانی نوێکرایەوە، مامۆستا لە کۆمەڵگای (پیرزین) نزیك هەولێر، بە زۆری و زۆرداری نیشتەجێ کرا، وە لە ١٠/٥/١٩٩١ز لە (خانێ) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: خۆری ئیسلام، ژمارە ٣٠/٢٠٠٥ز، ل ٤٩ - ٥٤.

## صاڵح عەبباس حەیدەری (٥٩٩)

ناوی صاڵحە، کوڕی عەبباسی کوڕی صاڵحی کوڕی عەبباسی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەرە، لە مەلایە چاکەکانی (ماوەران)ە، ساڵی ١٢٣٥ك لە گوندی (بالەکیان) حاشیەی عبداللەی کوڕی ئەحمەدی نووسیتەوە لە خزمەت مەلا خضری (بەحرکە)ی، وە لە ساڵی ١٢٣٤ك لە (ماوەران) بووە، مامۆستا تا ساڵی ١٢٤٠ك - ١٨٢٤ز لە ژیاندا بووە، پاش ئەو مێژووە کۆچی دوایی کردووە، بەڵام کەنگێ؟ نازانین.

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٢٩١٤ - ٢٩٢.

## صاڵح عبدالقادر وەلی (٦٠٠)

ناوی صاڵحە، کوڕی عبدالقادری کوڕی خودابەخشە، عەشیرەتی ( وەلی)یە، لە دەوری ساڵی ١٣٣٨ك - ١٩١٩ز هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (بیارە) لای مامۆستا عبدالکریم (مدرس) ماوە لە خزمەتی تا کۆتایی بە خوێندن هێنا، گەڕاوە وڵاتەکەی خۆی، هەشت ساڵان لە گوندی (قەڵاتەبزان) ماوە، دوایی باری کرد بۆ

(دەربەندیخان)، خەریکی دەرس و پێش نوێژی و وتار خوێندن بوو، ئامۆژگاری خەڵکانی دەکرد، تا ساڵی ١٣٨٤ك – ١٩٦٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٤٤ – ٢٤٥.

## صاڵح عبدالكريم هەڵەبجەیی (٦٠١)

ناوی صاڵحە، کوڕی عبدالکریمی کوڕی محەممەدی کوڕی مصطەفایە، تیرەی (هەسەنی)یە، ساڵی ١٩٠٤ز لە گوندی (هەنارۆ)ی، سەر بە ناحیەی (سەید صادق) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، تا سەرکەوت لە زانیاری، چووە خزمەت شێخ عومەری قەرەداغی لە خانەقای مەولانا خالید لە (سلێمانی)، لەو کاتە سەرۆك مەلا مصطەفای بارزانیش لەوێی دەخوێند، مامۆستا صاڵح ماوە لەوێ تا ئیجازەی لە جەنابی شێخ وەرگرت.

بووە مەلا لە گوندی (تریفە)ی سەر بە (هەڵەبجە) دەرسی فەقێیانی دەدا و کاروباری ئاینی ئەنجام دەدا، زۆری پێ نەچوو باری کرد بۆ (هەڵەبجە) لە گەڕەکی (کانی عاشقان) مزگەوت و قوتابخانەی دروست کرد، پاشان چووە (باغەکۆن) تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عەلی حیسامەدین وەرگرت، دوایی وەزعی ناوچەکە شێوا، مامۆستا ڕووی کردە (ئێران) لە (سنە) نیشتەجێ بوو، هەر لەوێ لە ١٧/١١/١٩٩٩ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (بەهەشتی محەممەدی) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: خۆری ئیسلام، ژمارە ٢٠٠٧/٣٤ز

## صاڵح عبدالله کۆزەپانکەیی (٦٠٢)

ناوی صاڵحە، کوڕی عبداللّٰهی کوڕی محەممەدی کوڕی حوسێنە، عەشیرەتی (بلّباس)ە، ساڵی ١٨٩٠ز لە گوندی (گردعازەبان) هاتووتەدنیا، بە منداڵیماڵیان باری کرد، بۆ (کۆزەپانکە) لەوێ دەستی کرد بە خوێندن.

خوێندنی: ساڵی ١٨٩٨ز دەستی کرد بە خوێندنی قورئانی پیرۆز، بە ماوەی شەش مانگ خەتمی کرد، دوایی چەند کتێبی فارسی خوێند، ئەمجا چووە (بەحرکە) لای

مەلا عوسمانی شەوەکی، دوایی چووە (گردمەلا) لای مەلا ئەحمەدی ئاشۆکانی، لەوێ شەرحی شەمسییەی خوێند، چووە (مەخمور) سێ ساڵ لە لای مەلا عبدالفتاحی شوان ماوە، لەوێ ڕۆیشت، چووە مزگەوتی حاجی قادر دەباغ لە (هەولێر)، لای مەلا محەممەدئەمینی کونەفلوسە، پاشان چووە (دیبەگە) چوار ساڵ لە لای مەلا عبدالفتاحی خەتێ ماوە، ساڵی ١٩١٤ز لە بەر جەنگی جیهانی گەورە، حوجرەکانی فەقێیان داخران، مامۆستا عبدالفتاح لە دیبەگە باری کرد گەڕاوە (خەتە).

دوای جەنگەکە مامۆستا صالح چووە (خەتە)، دوو ساڵی دی لای مامۆستا عبدالفتاح ماوە، پاشان چووە (هەولێر) لە مزگەوتی (قەڵات) لای مەلا ئەفەندی ماوە تا ساڵی ١٩٢١ز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا، لە (دیبەگە) هەشت ساڵ لەوێ بوو، دوایی باری کرد، بۆ (قازیخانە) چوار ساڵان لەوێ ماوە، ساڵی ١٩٣٤ز باری کرد بۆ (هەولێر) لە مزگەوتی شێخ نورەدین بووە مەلا.

خووڕەوشتی: زاتەکی حەق گۆ بوو، لایەنگری حەق بوو، لە ڕاستی لانەدەدا، شەرمی نەدەکرد، چاوقەیم بوو، لەسەر ئایین توند بوو، بۆ کاربەدەستان ملی کەچ نەدەکرد، زەوقی شیعری هەبوو، چەند پارچە شیعری کوردی هەبوو.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا سەید محەممەدی پیرداودی، مەلا خەلیلی سنجاوی (مخلص)، دکتۆر شێخ عبداللە نەقشبەندی، مەلا محەممەدی سەلماسی، مەلا عبداللەی فەرهادی، مەلا عومەری دیبەگە، مەلا عوسمانی کوڕی، مەلا بەهائەدینی خەتێ، مەلاطاهای شێخ وەتمانی، مەلا سولەیمانی قیڕژەی، مەلا عبداللەی باداوەی، مەلا صالحی موکریانی، مەلا صالح ئاختەتەری، مەلا عبدالرحمان هەمزەکۆری، مەلا عەلی خەتی، مەلا عبداللەی پەرپیتانی، مەلا عەلی شێخ وەتمانی.

دانراوەکانی:

١. (إدراك المدارك) حاشیەکی تەواوە لەسەر تەفسیری (مدارك).

٢. الرسالة الجامعة: بابەتی بڕوایی و خواپەرستییە (عەقیدەو شەریعەت)، چاپ کراوە.

٣. تحفة الطالبين: بابەتی کڕین و فرۆشتنە، چاپ کراوە.

٤. نامیلکەی دژی وەهابییەکان.

لەگەڵ چەند حاشیانی جیاجیا لەسەر کتێبانی شەرحی مەنهەج و بورهانی گەلەنبەوی و کەمالی صەرف و ئوسطرلاب.

کۆچی دوایی: لە ٦/٢٠/١٩٧٤ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی شێخی چۆلی بە خاك سپێردرا، مەلا عوسمانی کوڕی زانایەکی بە توانا بوو، لە خزمەت باوکی خوێندنی تەواوکرد، پاشان چووە (میصر) لە زانکۆی ئەزهەر بڕوانامەی کۆلیژی وەرگرت، گەڕاوە (هەولێر) ماوەك دەرسی داوە، لە ١٠/٦/١٩٧٥ز کۆچی دوایی کرد، چەند کوڕی مامۆستای هەنە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٤٤.

٢. علماء ومدارس في أربيل ١١٩.

٣. الرسالة الجامعة / پێشەکی ٨ – ١٢.

## صالح عوسمان شەیدایی (٦٠٣)

ناوی صالحە، کوڕی مەلا عوسمانی کوڕی حاجی ئیسماعیلە، ناسراوە بە صالح بەگ، نازناوی شیعری (شەیدایی) بووە، کتێبی (غاية الإختصار)ی کردووە بە هۆنراوەی کوردی، ناوی ناوە (فرح الضمير) (١٢٠) لاپەڕەیە، لە سەرەتاوە دەڵێ:

| | |
|---|---|
| طەلەبکارمە لە توو خوداوەند | (لاشريك لك) حەیی بێ مانەند |
| هەم لە (محمد) ڕەسولی تۆیە | (خاتم النبي) مەقبولی تۆیە |

لە کۆتاییدا دەڵێ:

| | |
|---|---|
| ببەخشی گوناە (شەیدایی) حەزین | دووری کەی لە نار سەعیر و (سجّين) |
| صالحی بەگی ئیبنی عوسمانە | خاطیری هەمنام جامیع قورئانە |

دەربارەی دانانی ئەو کتێبە بەڕێز محەممەد عەلی قەرەداغی دەڵێ: {لە سەردەمی شێخ سیراجەدین دایناوە.... ڕۆژ و مانگی نوسینەوەکەی نووسیوە، بەڵام ساڵەکەی لەبیر چووە....}.

منیش دەڵێم: ئەگەر وردبینی لە بەیتەکانی کۆتایی کتێبەکە بکەین دەتوانین بڵێین مامۆستای نووسەر ئاماژەی بە ساڵی نووسینەوەی کردووە، چونکە خۆی دەڵێ:

خاتیمە جوان هات (تقبل الله) لە(کج خشت) خاطر مصطفا

ئەمەش لێکدانەوەی ئەبجەدی بەم شێوەیە: ك، ٢٠+ج ،٣+خ ،٦٠٠+ش ،٣٠٠+ت ، ٤٠٠، کۆی گشتی ١٣٢٣ کۆچی یە، هەروها بۆمان دەردەکەویت، کە ئەم کتێبە ماوەی (٤٠) چل ساڵ پاش کۆچی دوایی سیراجەدین شێخ عوسمان نووسراوە، ئەو بەیتە شیعرەش کە دەڵێ:

سێیەم هیدایەت سیراجەدین بوو شاهی ئەورامان ئەو قوطبی دین بوو.

تەنیا مانای ڕێز لێنان و بەرەکەتی جەنابی شێخە، واناگەیەنی کە لە سەردەمی ئەو نووسرابیتەوە، وەك بەڕێز محەممەد عەلی قەرەداغی بۆی چووە.

سەرچاوەکان:

١. خۆری ئیسلام، ژمارە ٣١/٢٠٠٦ز، ل ٧٧ – ٨١.
٢. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٧/٣٦٦ – ٣٧١.

## صاڵح عومەر گڕاوی (٦٠٤)

ناوی صاڵحە، کوڕی مەلا عومەری کوڕی مەلا ئەحمەدی گڕاوی یە، لە گەڕەکی (قەلات) لە (هەولێر) هاتووتەدنیا، ساڵی ١٣٤٢ك – ١٩٢٣ز حاشیەی مەلا حەمزەی سەر (سعداللهی گەورەی) نووسیتەوە، ساڵی ١٣٦٢ك – ١٩٤٣ز کۆچی دوایی کردووە، لە گۆڕستانی دەوبەستێ بە خاك سپێردراوە، لەوانەیە گۆڕستانی شێخەڵلای ئێستا بێ.

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/١٠٥.

## صاڵح مەحمود خانەقینی (٦٠٥)

ناوی صاڵحە، کوڕی مەحمودی کوڕی عبدالرحمانی کوڕی محەممەدی (ابن الخیاط)ە، باپیرەگەورەیان لە (قەرەداغ) دانیشتووە، شێخ عبدالرحمان لە (بەغدا) دەرسی داوە مەلا مەحمود لە (خانەقین) پێش نوێژ و وتارخوێن بووە، مەلا صاڵح خوێندنی تەواوکرد کە باوکی کۆچی دوایی کرد، بووە جێگری بۆ جێبەجێ کردنی کاروباری ئاینی، زۆرجار سەردانی شێخ نەجمەدینی (بیارە)ی دەکرد، لە ١٣٦٣ك – ١٩٤٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٤٥.

## صاڵح موختار شنۆیی (٦٠٦)

ناوی صاڵحە، کوڕی موختاری کوڕی صاڵحی کوڕی ئەبو فەواریسی شنۆییە، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٦٤٢ك – ١٢٤٥ز هاتووتەدنیا، بۆ خوێندنی چووە (میصر)، دەرسی فەرموودەی لە لایەن چەند زانایان خوێند، تا گەیشتە پلەی مامۆستایی، لە (مەککە)ی پیرۆز دەرسی فەرموودەی دەدا، لە ١٥ی مانگی جیمادی یەکەم ساڵی ٧٣٨ك – ١٣٣٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٤٢ – ٢٤٣.

## صاڵح نەجیبی بێژوەیی (٦٠٧)

مامۆستا صاڵح، ساڵی ١٩٠١ز لە گوندی (بێژوە)ی ئالان هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی بە خوێندن کرد، پاشان چووە لای مەلا شێخ ئەمینی بێژوەیی، دوایی هاتە (کۆیە) لای مەلا بەهائەدین، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، گەڕاوە (بێژوە) لەوێ دەستی کرد بە دەرسدانەوە و کاروباری ئاینی، دوایی لەگەڵ مەلا عبداللەی (نەلاس) و مەلا صاڵحی ئەختەتەری، لە گوندی (مارەغان) کۆبوونەوە، چوونە لای مەلا خەلیلی کۆڕەمەڕی، بوونە تاقمەك لە دژی ڕژێمی شای (ئێران) هەستان، بۆیە فەرمانی گرتنیان دەرچوو لە لایەن شا، بەڵام مەلا صاڵح خۆی نەدا دەست، ڕای کرد بۆ (پشدەر)، لە

(گەناو) بووە مەلا، دەستی کرد بە دەرسدانەوە و ڕێ و ڕەسمی ئاینی سالّی ١٩٦٤ز گەڕاوە (بێژەو) خەریکی دەرسدانەوە بوو، دوا تەمەنی چاوەکانی نەمان، یەکی دەرسانی کەت، بەلاّم پێش نوێژی هەر دەکرد، سالّی ١٩٩٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٣٠٣ – ٣٠٤.

## صالّح نەصرالله (حەریق ی شاعیر) (٦٠٨)

ناوی صالّحە، کوری مەلا نەصرواللّهیە، ناسراوە بە (نەسرۆك) نازناوی (حەریق)ە، سالّی ١٨٥١ز لە گوندی (زێوە)ی (سورداش) هاتوتەدنیا، لە لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (سلێمانی) لای شێخ محەممەدی بەرزنجی، دوایی چووە (بیارە) لەوێ بەشێکی (مینهاج)ی نەوەوی لە لای مەلا شێخ حەیدەر خوێند، دووبارە گەڕاوە (سلێمانی) سالّی ١٨٨٤ز چووە (پێنجوین) لای مەلا عبدالرحمان، بورهانی گەلەنبەوی خوێند، دوایی چووە (موکریان) پاشان چووە خانەقای (بورهان) لە خزمەت شێخ یوسف تەریقەتی وەرگرت، ئەمجا کرا مەلا و (مدرس) لە قوتابخانەی سەید حەسەن لە (مەهاباد).

ناوبراو جگە لە مەلایەتی شاعیرەکی چاك بووە، بە کوردی و عەرەبی و فارسی شیعری هەیە، لەبەر سۆز و جۆشی دەرونی نازناوی (حەریق)ی بۆ خۆی هەلّبژاردووە، نمونەی شیعرەکانی:

چاوەکەم ئەمڕۆ لە گولّشەن گولّ بە عیشوە خۆی نواند
نەك نمەك گیرىم بە مەرگی تۆ قەسەم هیچ نەمدواند
بۆ گولّی ڕووت هاتم و پەرچەم ئەبینم بۆیە دایم
ماهی نەورۆزم بە شیوەن وەك (محرم) خۆی نواند
تو لە ئەووەل گۆی وەفات هینایە نێو مەیدانەوە
ئێستە چەوگانی خیلافت، پشتی صەد وەعدەی شکاند
تو خودا قەت غیرەتە بۆ تو ئەرێ سەر ڕوی ڕەوان
گولّ بەبێ تۆ وا لە باغا خیوەتی خۆی لێ چەقاند

باوجود ئینساف بدەم چاکە گوڵیش موشتاقتە

هەر لە شەوقی تۆیە سەرپۆش و گریبانی دڕاند

لێکدانەوەی ووشەکان: (عیشوە) نازە، (چەوگان) قاشۆیە، (گریبان) یەقەی کراسە، (نمك گیر) سفرەو بێ چاوەڕوو.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٠٧ز، ماڵئاوایی یەکجاری لە دۆست و برادەران کرد، کۆچ کۆچباری خۆی تێکنا بەرەو بارەگاهی خوای گەورە، لە گۆڕستانی مەلا جامی بە خاك سپێردرا، دیوانی شیعری هەیە، ساڵی ١٩٣٨ز لە (بەغدا) چاپ کرا.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ٣٥٨ – ٣٨٥٩.

٢. مێژووی ئەدەبی کوردی ٤/٤٢٥ – ٤٥٤.

٣. ژیناوەری زانایانی کورد ٧٨٨ – ٧٩٥.

## صالح یوسف دیاربەکری (٦٠٩)

ناوی صاڵحە، کوڕی یوسفی کوڕی مصطفایە، خەڵکی (دیاربەکر)ە، نازناوی (وەهمی)یە، ساڵی ١١٤٨ك – ١٧٣٥ز لە شاری (قارص) دانیشتووە، ئەو کتێبانەی داناون: (شەرحی دیوانی فریشتە: فارسییە) و (الفوائد الأنسیة في شرح الأندلسیة).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٥/١٥.

٢. هدية العارفين ٥/٤٢٤.

## صبغةالله ئیبراهیم حەیدەر حەیدەری (٦١٠)

ناوی صبغةالله یە، کوڕی ئیبراهیم ئەفەندی کوڕی حەیدەر ئەفەندی دووەمە، ئەو زاتە صبغةاللهی یەکەمە، مامی باوکی صبغةاللهی دووەمە، لە گوندی (ماوەران) هاتوتەدنیا، کە خوایدا بابیری لە باوکی پرسی چ ناوت لێنا؟ وەڵامی داوە: (صبغةالله)، واتە: ڕازاندنەوەی ئیمان، ئەویش یەکسەر فەرمووی: (وَصَبَّغَهُ)، واتە: خوا بیڕازێنێتەوە،

لەلایەکی ترەوە وردەکارییەکی جوانی تێدا هەیە، چونکە پیتەکانی ئەو وشەیە، و ص ب غ ه و کۆبکەیەوە بە لێکدانەوەی ئەبجەدی، دەکاتە ساڵی ١١٠٩ك – ١٦٩١ز ئەوەش مێژووی لە دایکبوونی دەردەچێ.

ئەمە پێچەوانە نیە لەگەڵ ئەوەی کە محەممەد عەلی قەرەداغی دەڵێ: مامۆستا ئیبراهیم لە نامەیەك ساڵی ١١١٠ك ی داناوە بۆ لە دایکبوونی کوڕەکەی، چونکە جیاوازیان تەنیا یەك ساڵە، ئەوەش بۆی هەیە مێژووەکەی سەرەوە بەرواری ڕۆژی کۆتایی ساڵەکە بێ، مانگەکە بە سێ پڕ ژمێردرابێ، دوایی دەرکەوتووە کە بیست و نۆیە، هەڵبەت ساڵەکە نوێ دەبێتەوە.

مامۆستا صبغةالله لە خزمەت باوکی خوێندنی تەواوکرد، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، چووە (بەغدا) لەوێ ئەحمەد پاشای حەسەن پاشای وەزیر زۆر ڕێزی لێنا، فەرمانی (مدرس)ی بۆ دەرکرد، کردییە سەرۆکی زانایانی ئاینی دوایی گەڕاوە (کوردستان)، مەلا محەممەد عومەر (بانە)یی دەڵێ: {ئێمە لە خزمەت مامۆستا صبغةالله بووین، لە ترسی لەشکری (طەهماسب قلیخان) ماوەرانمان بەجێ هێشت، لە گوندی (وژنانە) خۆمان حەشاردا، لەوکاتە کتێبی (محاکەمات)م نووسیەوە، کە دانەرەکەی باپیری باوکی مامۆستامانە}، مامۆستا صبغةالله خەریکی دەرسدانەوە بوو لە (ماوەران) تا ئەحمەد پاشا کۆچی دوایی کرد ئەمجا دووبارە گەڕاوە (بەغدا).

یاسین عومەری لە کتێبی غایە المرام دەڵێ: پسپۆڕی زانستەکان بوو، مامۆستای هەموو مامۆستایەکانی (موصل) و (بەغدا) بوو، عەبباس عەزاوی دەڵێ: یەکەم کەس بوو لەوبنەماڵە هاتە بەغدا، لە دەرسی ئەستێرەناسی شارەزابوو.

بەشێك لە فەقێیەکانی: شێخ محەممەدئەمینی عومەری، شێخ خەیرەدینی عومەری، سەید حەسەنی موصلی، مەلا جەردیسی هەولێری، مەلا ئەحمەدی جەمیلی، مەلا مصطەفای زیارەتی.

دانراوەکانی:

١. حاشیە لەسەر چەند جێ لە تەفسیری (بەیزاوی) زۆرم بە دەست لەسەر شێخ زادە نووسیتەوە.

٢. حاشیە لەسەر سورەتی (فاتیحە) لە تەفسیری (بەیزاوی).

٣. رسالة في تحقيق زيادة الصفات.

٤. حاشیە لەسەر حاشیەی عیصامەدین، لەسەر (جامی).

٥. نامیلکەی (فارسی) لە باسی چەند وەزیر.

٦. حاشیە لەسەر (محاکەمات)ی باپیری باوکی.

٧. نامیلکەی (طاعون) خۆی دەڵێ: لە کۆتایی ساڵی ١١٨٦ك تەواوم کرد.

کۆچی دوایی: ساڵی ١١٨٧ك – ١٧٧٣ز یا ساڵی ١١٨٨ك – ١٧٧٤ز یا ساڵی ١١٩٣ك – ١٧٧٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ٨٨ – ٢٣٦ – ٢٤٠.

٢. معجم المؤلفين ٥/١٦.

٣. معجم أعلام الكورد ٣٦٠.

٤. الأعلام ٣/٢٨٦.

٥. غاية المرام ٢٦٢.

٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٤٧.

٧. كشف الظنون ١/١٨٩.

٨. بوژاندنەوە ٣/٢٥١ ،٤/٢٥٠،٦/١٩٠ ، ٢٢٩ ، ٢٣٠ ، ٢٣٣ ، ٢٣٦.

٩. بنەماڵەی زانیاران ٢٣٢ ، ٢٣٤.

## صبغةالله ئیبراهیم عاصم حەیدەری (٦١١)

ناوی صبغةاللّٰهیە، کوڕی ئیبراهیم ئەفەندی کوڕی عاصم ئەفەندی حەیدەری یە، ئەو زاتە صبغەاللّٰهی دووەمە، باپیری باوکی صبغةاللّٰهی سێیەمە، دەرسی لە لای مەلا صالّحی حەیدەری خوێندووە و لە لای مەلا ئەسعەدی حەیدەری تەواوی کردووە، کوڕێکی هەبوو ناو ئیبراهیم، مەلایەکی چاك بووە، حاشیەی لەسەر حاشیەی عبدالحکیم لەسەر خەیالی هەیە.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٢١.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٤.

٣. علماء ومدارس في أربيل ٤٩.

٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/٢٥٠.

٥. بنەماڵەی زانیاران ٢٣٤ – ٢٣٥.

## صبغةالله ئەسعەد حەیدەری (٦١٢)

ناوی صبغةاللّٰهیە، کوڕی ئەسعەدی کوڕی عبداللّٰهی کوڕی صبغەاللّٰهی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەر ئەفەندی دووەمە، لە خزمەت باوکی خوێندووە، پاشان لەسەر فەرمانی باوکی لە بەغدا هاتەوە کوردستان، ماوەی نۆ ساڵان خەریکی وەرگرتنی زانیاری بوو، دوایی تەریقەتی نەقشبەندی لە مەولانا خالید وەرگرت، کرا موفتی شافیعییەکان، زاتەکی خێرخواز و خواپەرست بوو، دوور لە دنیا بوو، تەمەنی نۆهەت ساڵ بوو، لەو هەموو عومرە درێژە خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆز بوو.

چەند حاشیەی بەنرخی لەسەر کتێبانی مەنتیق و بەلاغە هەیە، لەوانە:

١. حاشیە لەسەر شەرحی شەمسیە و حاشیەی داود خەوافی.

٢. حاشیە لەسەر قەرەباغی.

٣. حاشیە لەسەر شەرحی عیصامەدین، بابەتی (بەیان).

٤. حاشیە لەسەر حاشیەی سەیلەکۆتی، لەسەر (مطول).

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٢٠ – ١٢١ – ١٢٢ – ٢٣٦.

٢. علماء ومدارس في أربيل ٥٦.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٤٧.

٤. بنەماڵەی زانیاران ٢٤٠.

٥. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/٢٥٠.

## صبغةالله مصطەفا زیارەتی (٦١٣)

ناوی صبغةاللّٰەیە، کوڕی مەلا مصطەفایە، خەڵکی گوندی زیارەتی مەلا زادانە، یەکە لە زانایە هەڵکەوتووەکانی صەدەی سێزدەی کۆچی، لە (بەغدا) دەرسی داوە، داود پاشای والی بەغدا تەفسیری بەیزاوی و چەند کتێبی لە خزمەت خوێندووە، عبدالرحمان پاشای بابان زۆر ڕێزی لێناوە، ئیجازەی مەلایەتی لە مەلا صاڵح ئەفەندی حەیدەری وەرگرتووە، خۆشی دەرسی بە مەلا عبدالرحمان ئەفەندی ڕۆژبیانی و مەلا عبدالرحیمی زیارەتی داوە.

ناوبراو نامیلکەکی داناوە لە دژی مەلا صبغةاللّٰەی حەیدەری، ئەوەش وادەگەیەنی کە مامۆستا صبغةاللّٰەی زیارەتی زانیاری زۆر بەهێز بووە، دەنا کێ توانیی پەنجەشکانەوەی زانستی لەگەڵ مەلایە حەیدەرییەکان بکا؟ مامۆستا لە ساڵی ١٢٧٠ك – ١٨٥٣ز کۆچی دوایی کردییە.

سەرچاوەکان:

١. علماء ومدارس في أربيل ٨٩.

٢. مشاهير الكورد ١/٢٧٠.

٣. معجم أعلام الكورد ٣٦٠.

## صەدیق صالْح گرمکی ( ٦١٤ )

ناوی صەدیقە، کوڕی صالْحی کوڕی ئیسماعیلە، ساڵی ١٩١٣ز لە گوندی (گرمك) سەر بە (طەق طەق) هاتووتەدنیا، ساڵی ١٩٢٣ز لە (دووگرتکان) دەستی بە خوێندن کرد، لە لای مەلا محەممەد نور، دوایی چووە (کەسنەزان) لای مەلا محەممەدئەمین سوێری، چووە (باشتەپە) لای مەلا سەعید، چووە (دولەزە) لای مەلا عوسمان، چووە (ترپەسپیان) لای مەلا شێخ جەلال (مطول)ی خوێند، چووە (پردێ) لای مەلا عەلی ڕواندزی ئوصولی خوێند، چووە (کۆیە) لای مەلا بەهائەدین (قازی لاری)ی خوێند لە عیلمی حیکمەت، پاشان چووە لای مەلا محەممەدی جەلی زادە، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

بووە مەلا لە گوندی (بوگد)، دوایی گەڕاوە (گرمك) ماوەی بیست ساڵ زیاتر لەوێ مەلا بوو، پاشان باری کرد بۆ (طەق طەق)، لەوێ ماوە تا ساڵی ٢٠٠٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## صەدیق محەممەد نۆغەرانی ( ٦١٥ )

ناوی صەدیقە، کوڕی محەممەدی کوڕی یاسینی کوڕی مەلا محەممەدە، ساڵی ١٩٠٩ز لە گوندی (نۆغەران) هاتووتەدنیا، لە لای مەلا طاهیری برای دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (جدیدە)ی بەڕانەتی لای مەلا عبداللّٰهی مەحەوالی، هەر لەگەڵ مەلا عبدالله چووە (شەقلاوە)، دوایی چووە (پۆریجە) لای مەلا عبدالقادر، دوایی چووە (دێمەکار) لای مەلا محەممەدئەمینی سوێری، دوایی چووە (قەرە سالم) لای مەلا عبدالرحمانی بەگزادە فەرائیزی خوێند، دوایی بۆ دەرسی شەریعەت چووە لای مەلا ئیسماعیلی ناقیص، وە بۆ دەرسی مەنتیق چووە لای مەلا مەحمودی (ڕاجی)، ماوەکیش چووە پردێ لای مەلا عەلی ڕواندزی، ماوەکیش چووە (دۆلەزە) لای مەلا عوسمان، پاشان چووە (کۆیە) دەرسی (مطول)ی لای مەلا ئەبوبەکری کۆیی خوێند، پاش ئەو هەموو سوڕو گەڕانە چووە

مزگەوتی خانەقا لە (هەولێر) لای مەلا شەریفی دووشیوانی، دوایی چووە مزگەوتی شێخ نورەدین لای مەلا صالحی کۆزەپانکەیی، لەوێ چووە مزگەوتی حاجی قادر دەباغ لای مەلا عبداللەی بێتواتەی، ماوە لەوێ تا ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (گردەسۆر)، سالی ١٩٥٤ز باری کرد بۆ گوندی (خەریب کەیف) دوایی گەڕاوە (گردەسۆر)، سالی ١٩٥٨ز گەڕاوە (نۆغەران) لەوکاتەوە وەزعی دەشت ئالۆز بوو، باری کرد بۆ (هەولێر)، سالی ١٩٧٠ز لە مزگەوتی حاجی طاها قەساب بووە مەلا، سالی ١٩٧٧ز کرا مەلا لە مزگەوتی حاجی سەلیم لە (شەقلاوە)، پاشان گەڕاوە (هەولێر) کرا مەلای مزگەوتی حاجی نوری ناوبازاڕ، لە ١٩٩٢/٨/٣ز کۆچی دوایی کرد، چەند کوڕی هەنە، لەوانە: دکتۆر محەمەد سەرۆکی زانکۆی سەلاحەدینە، لە (هەولێر).

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## صەدرەدین عبدالملك کوردی ( ٦١٦ )

ناوی صەدرەدینە، کوڕی عبدالملك‌ی کوڕی درباسە، زانایەکی خواناس و بە دین و پایەدار بوو، یەکەم قازی بوو، سالی ٥٦٦ك – ١١٧٠ز لە لایەن سولتان صەلاحەدینی ئەییوبی دامەزرا لە (قاهیرە)، دوایی کرا سەرۆکی مامۆستایانی (میصر).

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ١/٢٧٠ – ٢٧١.

٢. معجم أعلام الكورد ٣٦٠.

## صەلاحەدین محەممەد گۆرانی ( ٦١٧ )

ناوی صەلاحەدینە، کوڕی محەمەدی، گۆرانی یە، لە (حەلەب) دانیشتووە، نووسەر و ڕۆشنبیر بووە، ماوەك کرایتە (قازی) چەند کتێبی داناون، لەوانە:

١. روائح البضائع في ذوي الصنائع.

٢. الجواري الفوادي في الجواري الغوادي.

٣. مناقب الصفا في مناقب الشيخ أبي بكر بن أبي الوفا.

٤. نور مصابيح الدجي في المعمى والأحاجي.

٥. سلاسل القرار في تقييد الغرار.

کۆچی دوایی: دوای ساڵی ١٠٤٩ك – ١٦٣٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٤١.

٢. معجم المؤلفين ٥/٢٣.

٣. إيضاح المكنون ٢/٢٠.

٤. الأعلام ٣/٢٩٨ /٦/٩٧.

٥. معجم أعلام الكورد ٣٦٤.

## صنع الله جەعفەر ئامێدی ( ٦١٨ )

ناوی صنع اللهیە، کوڕی جەعفەر ئەفەنـدی یـە، خـەڵکی ئامێـدی یـە، زانایـەکی گەورەی سەردەمی خۆی بووە لە (بروسە) کرا قازی، دوایی کرا قازی (ئەدرنە) هـەروەها سـاڵی ١٠٠٠ك – ١٥٩١ز کرا قازی لەشکر، چـوار جـاران پلـەی (شـێخ الاسـلام)ی پێدرا، لە دەوری سوڵتان محەممەدی سێیەم خانەنشین کرا، پاشان چـووە سـەفەری (حـەج) گەڕاوە (ئاستانە) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٣٦٥.

– ض –

## ضیائەدین عبدالحکیم ئەفەندی ( ٦١٩ )

مامۆستا ضیائەدین ئەفەنـدی، کـوڕی عبدالحکیمـە، سـاڵی ١٢٨٨ك – ١٨٧١ز هاتووتەدنیا، مەزهەبی شافیعی بووە، قورئانی پیرۆز و دەرسەکانی عەرەبی و شـەریعەتی لـە لایەن زانایەکانی (دیاربەکر) تەواوکرد، ئـەمجا بـۆ خوێنـدن چـووە (شـام)، لـەوێ چـووە (میصر) لە لایەن شێخ محەممەدئەمینی کوردی، فێری داب و ڕەوشتی تەریقـەتی نەقشـبەندی

بوو، جەنابی (شێخ) ئیجازەی گشتی پێدا، ڕووی کردە (حیجاز) لەوێ چەند بڕوانامەی وەرگرت، ساڵی ١٣٤٩ك چووە (مەککە)ی پیرۆز، بەردەوام لە بەیتی خوا خەریکی خوێندنی قورئانی پیرۆز و یادی خوا و خواپەرستی بوو.

زۆر بە مەراق ئامادە دەبوو لەو کۆڕانەی دەرسی ئاینیان لێ دەگۆترانەوە، پاشان گەڕاوە (دیاربەکر) ساڵی ١٣٥٤ك – ١٩٣٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: نثر الجواهر والدرر ١/٥٣٩ – ٥٤٠.

– ط –

## طاها ئیبراهیم هەولێری (٦٢٠)

ناوی طاهایە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی ئەبوبەکری (هەولێری)یە، نازناوی جەمالەدینە، دەوری ساڵی ٥٩٠ك – ١١٩٤ز لە هەولێر هاتووتەدنیا، یەك بووە لە زانایە شەرع زانەکانی مەزهەبی شافیعی، هەر لە گەنجی چووە (میصر) لەوێ خەریکی خوێندن بووە، دوایی تەواوی کرد، دەرسی دەدا، هەروەها شاعیر و نووسەر بوو، ساڵی ٦٧٧ك – ١٢٧٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٣/٢٨٦.
٢. فوات الوفيات ٢/١٣٠.
٣. مشاهير الكورد ١/٢٦٢ – ٢٧٦.
٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٥١.
٥. شذرات الذهب ٥/٣٥٧ – ٣٥٨.
٦. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ١/١٥٣ – ١٥٤.
٧. معجم أعلام الكورد ١٩٠ – ٢٧١.

## طاها ئەحمەد سنەیی (٦٢١)

ناوی طاهـایە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی قەسیمی کوڕی ئەحمەدی کـوڕی مـەحمودی کوڕی ئەحمەدی کوڕی مصـطەفای کوڕی شەمسەدینی کوڕی عبدالغفارە، باوکی لە (سنە) هاتە (بەغدا)، ناوبراو لەوێ ساڵی ١٢٣٠ك – ١٨١٥ز لە دایك بوو، دەسـتی کـرد بـە خوێندن، لە لایەن زانایەکانی ئەو سەردەمی، خوێندنەکـەی بردەسـەر، کـرا (مـدرس) لـە مزگەوتی ئیمامی ئەعزەم و لە مزگەوتی (الوزیر) لە گەڕەکی ڕەصافە، پاشان کرا (قـازی) ناردرا (کەربەلا) لەوێ بۆ (حیللە) لەوێ بۆ (بەصـرە) لـەوێ بـۆ (موصـل) دوایـی کـرا (نائیب) لە شارەزور، مامۆستا دەستێکی باڵای هەبوو لە زانستەکانی سەرەوە، بـە تایـەت (مەنطق) و (کەلام).

چەند دانراوی خۆی هەنە، لەوانە:

١. نظم مختصر المنار: زانستی (أصول الفقه)ە.
٢. هدي الناظرين: شەرحی (تهذيب الكلام)ی تەفتازانی، وشەی (هدی الناظرين)، بە لێکدانـەوەی ئەبجـەدی مێـژووی تـەواوکردنی کتێبەکەیـە، کـە دەکاتـە سـاڵی ١٢٦١ك.
٣. کۆمەڵێك شیعری عەرەبی و فارسی.
٤. شەرحی (تهذيب المنطق)ی تەفتازانی، بـۆ مێـژووی تـەواوکردنی وشـەی (حسـن الختام)ی داناوە، کە دەکاتە ساڵی ١٢٦٤ك.
٥. إثبات نبوةِ خيرِ مَن أُوتي الحكمة وفصل الخطاب.
٦. مەقام و پەخشان: لە ١٧ی ذي الحجەی ساڵی ١٢٩٩ك نووسیتیەوە.
٧. الصلوات المباركات.
٨. حاشية على المسألة الشعرية.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٠٠ك – ١٨٨٢ز لە (بەغدا) چووە (موصل) لە ڕێگادا کۆچی دوایی کرد لە گۆڕستانی (نەبی شیت) بە خاك سپێردرا.

کوڕەکانی: ئیسماعیل و عبدالحمید و عبدالمجید، وە هەروەها ئەو کوڕانەشی هەبوون:

- عبدالرەئوف: قازی بوو لە (بەعقوبە) و (ناصریە) و (حیللە).
- سولەیمان: قازی بوو لە (شەطرە) دوایی لە مزگەوتی (جدید) لە بەغدا کرا (مدرس) لە ١٤/٨/١٩٢٩ز کۆچی دوایی کرد.
- عبدالوەهاب: پێش نوێژ و وتارخوێن و دەرس بێژ بوو، لە مزگەوتی (الوزیر) لە (بەغدا) ساڵی ١٩٢٢ز کۆچی دوایی کرد.
- سامی (ڕەشید).
- ڕەئفەت: ساڵی ١٣٢١ك کتێبی (إثبات نبوةِ خیرِ مَن أُوتي الحكمة وفصل الخطاب)ی باوکی نووسیەوە.

سەرچاوەکان:


١. هدية العارفين ٥/٤٣٣

٢. إيضاح المكنون ٤/٧٢٤.

٣. مشاهير الكورد ١/٢٧٥ – ٢٧٦.

٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٥/٣٨ /٦/٣٢٨– ٣٣٠.

٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٥١ – ٢٥٢.

٦. معجم المؤلفين ٥/٤٣.

٧. بنەماڵەی زانیاران/ شێخا مەردۆخی ١٨ – ٢٥.

٨. معجم أعلام الكورد ٣٧١ – ٣٧٢.


## طاها ئیسماعیل شێروانی (٦٢٢)

ناوی طاهایە، کوڕی ئیسماعیلی کوڕی حەسەن بەگە، عەشیرەتی (شێروانی)یە، ساڵی ١٢٥٠ك – ١٨٣٤ز لە (هەولێر) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: قورئانی پیرۆزی خەتم کرد کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، دوایی چووە لای مەلا چاکەکانی ئەو سەردەمی، وەکو: مەلا محەممەد و مە ئەحمەد و مەلا ڕەسولی هەولێری، زۆربەی خوێندنی لە لای مەلا محەممەد ئەمینی قەراسنجی بوو، دوایی شەوقی تەریقەتی نەقشبەندی کەوتە دڵی، ڕووی کردە (تەوێڵە) بە شاری (سلێمانی)دا چوو، لەوێ لە لای کاك ئەحمەدی شێخ دابەزی، زۆر ڕێزی گرت، ئەمجا چووە لای شێخ بهائەدینی شێخ عوسمان، تەریقەتی وەرگرت، لە لایەن شێخ کرا (خەلیفە)، گەڕاوە (هەولێر) پاشان بۆ سەردانی شێخ محەممەدی شێخ عبدالسلام چووە (بارزان)، گەڕاوە (هەولێر) دەستی کرد بە دەرسدانەوە، دوایی بۆ پەرەپێدانی زانیاری چووە (بەغدا)، ماوەك تەفسیری قورئانی پیرۆزی لە لای مەلا محەممەد فەیزی زەهاوی خوێند، ساڵی ١٢٩٤ك – ١٨٧٧ز دووبارە ئیجازەی لە مامۆستا فەیزی وەرگرت، کۆتایی بە خوێندن هینا.

مەلایەتی: بە سەفەر چووە (کەربەلا) لە لای شێخ ئەمینی نەوەی مەلا هیدایەالله ی هەولێری دابەزی– کە لەوێ سەرۆکی دادگا بوو –، لە سەر داوای شێخ ئەمین مامۆستا طاها کرا (مدرس) لە قوتابخانەی (عەبباسییە)، هەروەها لەوێ لەگەڵ سەرۆکی زانایانی شیعە کۆبۆوە، پاش چەند کێشە لە نێوانیان، سەلماندیان کە زانایەکی بەرز و پایەدارە، زۆر ڕێز و حورمەتیان گرت، گەڕاوە (بەغدا) لە مزگەوتی (خضر ئیلیاس) ویردی تەریقەت و خەتمەی دەکرد، دوایی گەڕاوە (کەربەلا) کرا بەڕێوەبەری ئەوقاف، پاشان وەزعی شارەکە تێکچوو، دز و جەردە پەیدابوون، لە ئەنجامدا هێرشیان کردە سەر ماڵی مامۆستا، تاڵانیان کرد و کتێبەکانیان هەموو سووتاند، ناچار گەڕاوە (بەغدا)، کرا (مدرس) لە قوتابخانەی (ئەزبەکییە) هەروەها وتارخوێن لە مزگەوتی حاجی ئەمین.

کۆچی دوایی: لە سێی مانگی (محرم)ی ساڵی ١٣٥٠ك – ١٩٣١ز لە تەمەنێکی درێژ لە خزمەت ئایینی پیرۆز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (الشهداء) لە گەڕەکی (کەرخ) بە خاك سپێردرا.

دانراوەکانی: چەند دانراوی هەیە، لەوانە:

١. شەرحی (أصول النحو).

٢. كحل العيون في دفع الشبه والظنون، لە دژی وەهابیان.

سەرچاوەکان:

١. لب الالباب ٢/٢٣٩.

٢. معجم أعلام الكورد ٦٥٨ – ٦٥٩.

٣. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/٣٦١ – ٣٦٣.

## طاها بەشیر هەولێری (٦٢٣)

ناوی طاهایە، کوڕی بەشیری کوڕی محەممەدی کوڕی خەلیلی هەولێری یە، بۆ خوێندن چووە قوتابخانەی (نظامیة)ی بەغدا، لەوێ لە نێوان فەقێیانی کورد و عەجەم ناکۆکی پەیدابوو، مامۆستا طاها یەکی لەوان بە سەختی بریندار کرد، بەغدای بەجێ هێشت، چووە (مەککە)ی پیرۆز، لەوێ خەریکی خوێندن بوو، ناوە ناوەش دۆخینی دەهۆناندەوە و دەیفرۆشت بۆ بەڕێوەچوونی، تا یەك لە زەنگینەکانی (هیند) هاتە (مەککە)، مامۆستای کردە نووسەری دابەشکردنی زەکات و خێرات، بەرانبەر مووچەیەکی باش، دوایی کرا جێگری (قازی)، پاشان کرا قازی، هەروەها پێش نوێژ بوو، لە بەیتی خوا دەرسی دەداوە، ماوەی حەوت ساڵان پێشەوای حاجیان بوو، دوایی گەڕاوە (هەولێر) دەوری ساڵی ٥٧٧ك – ١١٨١ز لە گوندی (بشیریان) کۆچی دوایی کرد، منیش نازانم ئایا ئەو بشیریانەیە کە لەسەر زێی بادینانە؟ یا یەکی ترەو ئێستا نەماوە؟ مامۆستا دانراوی لە فەرائیز هەیە.

سەرچاوەکان:

١. تاريخ أربيل ١/٣٦٧.

٢. معجم أعلام الكورد ٣٧٢.

## طاها ڕەسول بەرزنجی ( ٦٢٤ )

ناوی طاهایە، کوڕی ڕەسولی کوڕی بایەزیدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی بابارەسولی گەورەیە، زانایەکی مەزن و خواناس بووە، دریغی نەکردووە لە خزمەتی ئاینی بیرۆز و موسوڵمانان، ساڵی ١٢٣٢ك - ١٨١٦ز لە (بەرزنجە) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٥٢.

## طاها شەقلاوەیی ( ٦٢٥ )

مامۆستا مەلا طاها، یەك بووە لە زانایە بەناوبانگەکانی ناوچەی خۆشناوەتی، ئیجازەی مەلایەتی لە مەلا ئەبوبەکری ئەفەندی کچك مەلای هەولێر وەرگرتووە، بەردەوام خەریکی دەرسدانەوە و جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی بووە.

چەندان مەلای چاك لەسەر دەستی ئەو ئیجازەیان وەرگرتووە، لەوانە: مەلا مصطەفای هیرانی ساڵی ١٩٣٦ز ئیجازەی وەرگرت، مەلا یاسین دێرەیی، مەلا طاهای کۆڕی، مەلا حوسێن باشوری، مەلا مصطەفای بالیسانی، مەلا ئەحمەدی صۆفی وسوو بەحرکەیی، مەلا ئەبوبەکری هیرانی.

مامۆستا لە دەوروبەری ساڵی ١٩٤١ز کۆچی دوایی کرد، چەند حاشیەی هەنە، لەسەر (تشریح الأفلاك) و حاشیەی (منه) لە کۆتاییدا دەنووسێ (یاطه).

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٥٤.

٢. علماء ومدارس في أربيل ١١٩.

## طاها عبدالرحمان مائی ( ٦٢٦ )

ناوی طاهایە، کوڕی مەلا عبدالرحمانی قازییە، ساڵی ١٢٥٩ك - ١٨٤٣ز لە گوندی (مائی) هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی بە خوێندن کرد، دوایی چووە لای مەلا قاسمی نابینای مامی، پاشان چووە (ئەتروش) لای مەلا عبدالهادی نەوەی مەلا یەحیای مزوری، دوایی چووە (موصل) لای مەلا عبداللهی عومەری سەرۆکی زانایانی شارەکە،

ماوە تا ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (مائی) کرا قازی لە (بەرواری بالآ)، هەروەها تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ محەممەدی (بامەڕنی) وەرگرت، مامۆستا کتێبی (قلائد الفرائد في العقائد) و (منهاج الوصول)ی داناوە، نووسەر و شاعیر بووە، شیعری کوردی و عەرەبی و فارسی هەنە، ساڵی ١٣٤٣ك ئینگلیز هێرشی هێنا سەر ناوچەکە، کتێبەکانی هەموو سووتان، ساڵی ١٣٣٧ك – ١٩١٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. تاريخ مشاهير كورد ٢/١٥٦ – ١٥٧.

٢. الأكراد في بهدينان ١٩٣ – ٢٠٨ – ٢٠٩.

٣. إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢٧.

## طاها عبدالعزیز قوشاغلو (٦٢٧)

ناوی طاهایە، کوڕی عبدالعزیزی کوڕی حاجی پیرداودی کوڕی عبدالغفورە، لە دەوروبەری ساڵی ١٩٠٣ز لە گوندی (قوشاغلو) چاوی خۆی هەڵهێناوە لە دنیا.

خوێندنی: لە لای مەلا مەعروف قوشاغلو دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (دیبەگە) لای مەلا عبدالفتاحی خەتێ، دوایی لەبەر کارەساتی جەنگی جیهانی یەکەم وازی لە خوێندن هێنا، پاشان دنیا هێوربۆوە چووە (باقرت) دەستی پێ کردەوە، دوایی چووە (عالـلا) لای مەلا ئەمینی هەولێری، دوایی چووە (میرەدێ) لای مەلا ئەحمەدی ڕەش، پاشان چووە هەولێر لای مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی لە مزگەوتی (قەڵات) ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: دەوری ساڵی ١٩٣٠ز بووە مەلا لە (بێستانە) ماوەك مەلا بوو، دەرسی فەقێیانی دەداوە، دوایی باری کرد بۆ (ئیلنجاغی گچکە)، پاشان چووە (قولتەپە)، ساڵی ١٩٥٧ز چووە سەفەری حەج بە ڕێگای (ئوردن)، گەڕاوە، باری کرد بۆ (دارەتوو)ی ناوچەی گۆڕانان، مامۆستا زاتەکی بێ فیز بوو، دوور لە دنیا بوو، لە خزمەت ئاینی پیرۆز بوو، تا ساڵی ١٩٦٧ز کۆچی دوایی کرد.

دوو کوڕی مەلای هەنە:

١. مەلا عبدالله: ماوەك لە (گعێتل) مەلا بوو، پاشان هاتە مزگەوتی نزیك پارێزگا لە هەولێر، دوایی کتێبخانەی دانا، بەناوی (مکتبة الغزالي).

٢. مەلا عبدالرحمان: مەلایە لە (دارەتوو).

سەرچاوە: الإكليل في محاسن أربيل ٣٥٥ – ٣٥٦.

## طاها عەلی بالیسانی (٦٢٨)

ناوی طاهایە، کوڕی شێخ عەلی، کوڕی شێخ عیسای، کوڕی ئەحمەدی، کوڕی مصطەفای، کوڕی عیسایە، لە دەوروبەری سالّی ١٨٧٨ز لە گوندی (بالیسانی) خۆشناوەتی هاتووتەدنیا، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکردن، پێ بە پێ قۆناغەکانی خوێندنی بڕین، تا سەرکەوت و گەیشتە پلەی بەرز، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت و لە (بالیسان) بووە مەلا، دەستی کرد بە دەرسدانەوەی فەقێیان و خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام و مامۆستا و تەریقەت، بۆ پەرەپێدانی زانیاری پاکسازی دەروونی تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی وەرگرت، هاتووچۆی شێخی دەکرد، تا سالّی ١٩٤٠ز شێخ کۆچی دوایی کرد، شێخ محەممەدئەمینی کوڕی لە جێ داندرا، دوای ئەو شێخ عبداللّەی کوڕی شێخ، دوای ئەو شێخ مصطەفای کوڕی شێخ، تا ئەو سەردەمە مامۆستا سەردانی خانەقای هەولێری هەر دەکرد، جارەکیش لەگەلّ شێخ مصطەفا بۆ ئیرشاد، چووە ناوچەی (قەراج) لە شاری (مەخمور) لای مەلا محەممەدی پێش نوێژ و وتارخوێنی شارەکە دابەزین، پاشان مامۆستا چووە لای شێخ نەجمەدینی شێخ عومەری (بیارە) تەریقەتی نوێ کردەوە، کە شێخ نەجمەدین کۆچی دوایی کرد، چووە لای شێخ عەلائەدینی برای، ئەوەبوو شێخ ماوەك لە (بیارە) گێڕایەوە، لای خۆی کردییە (مدرس)، دوایی ئیزنی لە شێخ وەرگرت و گەڕاوە (بالیسان).

مەدرەسەی بالیسان: بە ڕاستی قوتابخانەکی ئاینی ئاوەدان بوو، مەلّبەندەکی گەورەی خوێندن بوو، مەلایە چاکەکانی ئەو سەردەمی یا ماوەکیان لێ خوێندووە، یا

ئیجازەیان لیّ وەرگرتووە، نمونەك لەو زاتانە: شێخ مصطفەفای نەقشبەندی، مەلا ئەحمەدی ئاشۆکانی، مەلا ڕەشیدی موکریانی، مەلا ئەحمەدی توتمەی، مەلا ئیبراهیمی دۆرەبەکرەی، مەلا صادیقی ماویلی، مەلا عبدالقادری کانی دەربەندی، شێخ عبدالکریمی ئۆمەراوە، مەلا فتح الله ی هەرتەلی، مەلا محەممەدی مەخوری، مەلا ئەحمەد خدر وەرتی، مەلا عبداللهی سکتانی، مەلا عومەری تەرجانی، مەلا ئیبراهی خەتیّ، مەلا ئەبوبەکری کۆیی، شێخ عەلی کوڕی، شێخ عومەری کوڕی، شێخ محەممەدی کوڕی، مەلا عوسمانی دۆڵەزەی.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٤٧ك – ١٩٢٨ز لە ئەنجامی ڕووخانی خانووەکەی بە سەریدا کە تازە دروستی دەکرد کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی: شێخ عەلی و شێخ عومەر و شێخ محەممەد: لە مەودوا باسیان دەکەین، وە کوڕێکی دیکەی هەبوو بە ناوی شێخ ئەبوبەکر: ساڵی ١٩٢٩ز سیّ مانگ پاش کۆچی دوایی باوکی هاتەدنیا لە لای شێخ عومەری برای و خەتە و تووتمە و هەرتەل خوێندنی بردەسەر، مەلایەتی، لە بالیسان و زێنە و نواو و توتمە کرد، هاتە هەولێر لە مزگەوتی شێخ عومەر کرا پێش نوێژ، لە ٨/٩/٢٠٠١ز کۆچی دوایی کرد.

وە دوو کوڕی دیکەی هەبوون شێخ عبداللە و شێخ مصطفەفا: ئەو دووانە کەمیان خوێند.

سەرچاوەکان:


١. الإكليل في محاسن أربيل ٣١٥ – ٣١٦ – ٣١٨.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٥٢ – ٢٥٤.


## طاها محەممەد شێخ وەتمانی (٦٢٩)

ناوی طاهایە، کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی مەلا کاك عبداللە یە، ساڵی ١٨٥٣ز لە گوندی (شێخ وەتمان) ناوچەی باڵەکایەتی هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە قوتابخانەی باوکی دەستی کرد بە خوێندن، کە گەیشتە قۆناغی (موستەعید)ی چووە مزگەوتی قەلات لە (هەولێر) لای مەلا عومەر ئەفەندی، ماوە تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: کۆتایی بە خوێندن هێنا، گەڕاوە (شێخ وەتمان)، ماوەك لەوێ مەلا بوو، دوایی باری کرد، هاتە (بیستانە) مەدرەسەی فەقێیانی دانا، ناوبانگی مەلایەتی ڕۆیشت، کۆمەڵ کۆمەڵ فەقێ دەهاتنە لای، جار وابوو ژمارەیان دەگەیشتە سی فەقێ.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩١٦ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (بێستانە) بە خاك سپێردرا، گۆڕەکەی زیارەت دەکرێت، مامۆستا مەلا طاهای شێخ وەتمانی، کە ماوەك ئەندامی پەرلەمانی کوردستان بوو نەوەی ئەو زاتەیە، ساڵی ١٩٥٢ز ئیجازەی مەلایەتی لە مامۆستا مەلا صالحی کۆزەپانکەیی وەرگرت، وە ئێستا لە ژیاندایە.

سەرچاوەکان:

١. علماء ومدارس في أربيل ١٢١.

٢. بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندز ١٠٤ – ١٠٥.

٣. نامەی مەلا محەممەد عبدالرحمان شێخ وەتمانی.

## طاها مصطفی کۆڕی (٦٣٠)

ناوی طاهایە، کوڕی مەلا مصطەفای کوڕی مەلا سولەیمانی کوڕی داودە، لە نەتەوەی قازی داودی دێریێ یە، ساڵی ١٩١١ز لە گوندی (دارەڕێ)ی ناوچەی (بەردەڕەش) هاتوتەدنیا.

خوێندنی: قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، لە قۆناغی موستەعیدی چووە (ئاکرێ) لای مەلا محەممەدی دهۆکی، دوایی چووە (بەرازان) لای مەلا محەممەدی جۆنەرەی، چووە (سیساوە) لای مەلا عوسمان، چووە (هەرتەل) لای مەلا فتح الله، چووە (خەتە) لای مەلا ئیبراهیم، چووە (کۆیە) لای مەلا ئەحمەد بەهائەدین، چووە (شەقلاوە) لای مامۆستا مەلا طاها، ماوە تا ساڵی ١٩٣٥ز ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا، لە گوندی (کۆرە) ماوەی پتر لە پەنجا ساڵ لەو شوێنە خەریکی دەرسدانەوەی فەقێیان و جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی بوو، زاتەکی لە خواترس بوو، دوور لە دنیا بوو، بێ فیز بوو، بە قەناعەت بوو، مریدی شێخ مصطفای نەقشبەندی هەولێر بوو، لە ١٦/٣/١٩٩١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## طاها یەحیا مزوری (٦٣١)

ناوی طاهایە، کوڕی مەلا یەحیای کوڕی مەلا خالیدی مزورییە، ساڵی ١٢٥٠ك – ١٨٣٤ز لە (ئامێدی) هاتووتەدنیا.

لەلایەن مەلایە چاکەکانی (موصل) خوێندنی تەواوکرد، ساڵی ١٢٨٤ك – ١٨٦٨ز لە گەڕەکی کوردان لە (دیمشق) دابەزی، لەوێ لە قوتابخانەی (رکنیة) دەستی کرد بە ئامۆژگاری خەڵکان و جێبەجێ کردنی ویردەکانی تەریقەتی نەقشبەندی، خەڵکەکی زۆر سوودیان لێ وەرگرت، ناسرابوو بە زاتەکی بەدین و ڕوو لە خوا، یەك بوو لە پیاو ماقوڵان دوو جار چووە (حەج)، ساڵی ١٣٠٢ك – ١٨٨٤ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الکورد ٣٧٢.

٢. نثر الجواهر والدرر ١/٥٥٢.

## طاهیر ئەبوبەکر سوسەیی (٦٣٢)

ناوی طاهیرە، کوڕی مەلا ئەبوبەکری کوڕی مەلا مەحمودە، خەڵکی (سوسە)ی خۆشناوەتی یە، ساڵی ١٩٠٥ز لە گوندی (حەسارۆك) هاتووتەدنیا.

لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، باوکی کۆچی دوایی کرد، چووە لای مەلا ئیسماعیلی ئامۆزای، دوایی چووە (خەتە) لای مەلا ئیبراهیم، ماوەك چووە (بنەسراوە)ی گەورە لای مەلا ئەحمەدی ئاشۆکانی، چووە (سەران) لای مەلا عبدالله، چووە

(بالیسان) لای مەلا شێخ طاها، چووە مزگەوتی حاجی قادر دەباغ لە (هەولێر) لای مـەلا محەممەدئەمینی (کونەفلوسە)، لەو کاتە بۆ دەرسـی (فـەرائیز) هاتووچـۆی مزگـەوتی شـێخ مصطەفای نەقشبەندی دەکرد لە لای مەلا عبدالرحمانی بەگزادە (لارە)، پاشان ئیجازەی لە ماموستا محەممەدئەمین وەرگرت.

لەو شوێنانە مەلایەتی کرد: گۆڕەشێر، کەندارەقەل، سەرگەڕان، پیرەمش، سوسـە، پاشان هاتە (هەولێر) بووە مەلای مزگەوتی حاجی محەممەد قاسم لـە گـەڕەکی (ئیسـکان)، لەوێش فەقێی هەبوون.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عوسمانی حاجی مەلا عبداللهی هەرشەمی، مەلا عومەر مەلا مصطەفا قەراسنجی، مەلا سەعیدی زمزەمۆکی، مەلا عبدالکریمی دۆرەبەکرەیی، مـەلا عبداللهی کەونەباکی، مەلا خالیدی کوڕی، مـەلا محەممـەد نۆغـەرانی، مـەلا عوسمـان مـەلا محەممەدئەمین ئاشۆکانی، مەلا عبدالله پەرپیتانی، مەلا محەممەدی دارەتوو، مەلا محەممەد بیرێژی، مەلا طاهیر مەلا عبدالله بەحرکەیی، نووسەری ئەو مێژووە.

خووڕەوشتی: زاتەکی لەسەرەخۆ و هێمن بوو، بە دین بوو، بەڕێز بوو، قسەخۆش بوو، بەشێکی زۆری لە فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) بەتایبەت ئەوانەی لە (جامع الصغیر)ن لەبەربوو، لە مەجلیسان دەیخوێندنەوە و مانای دەکردن، مەجلیسەکەی پیرۆز دەکرد، لـە (فەرائیز) دەستێکی بالآی هەبوو، هەر لەبەر لێکی دەداوە و شـەرحی دەکـرد، لـە سـالّی ١٩٧٢ز من لە خزمەتم دەخوێند، دەیفەرموو: {ئەوا سی سالّە ئەو دەرسە دەدەمەوە، لای کەمی سالّێ جارەکم دایتەوە}.

کۆچی دوایی: لە شەوی هەینی ٦/٤/١٩٨٤ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی شێخ مەعروف بە خاك سپێردرا، دوای ئەو مەلا خالیدی کوڕی جێگری بوو، ئـەویش لـە بەرواری ٢٢/١٢/١٩٩٣ز کۆچی دوایی کرد.

## طاهیر ئیسماعیل بەرزنجی (٦٣٣)

ناوی طاهیرە، کوڕی سەید ئیسماعیل کوڕی سەید محەممەدە، ساڵی ١٣٤٦ك – ١٩٢٧ز لە گوندی (گۆمەشین)ی شێخان سەر بە قەزای (کۆیە) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: دەستی بە خوێندن کرد، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکردن، چووە لای مەلا عەلی باداوە، دوایی چووە لای مەلا طاهیری مەلا حەسەنی بلّباس، پاشان چووە لای مەلا محەممەدی مەلا ئیبراهیمی عەبدالآنی، لەوێ ئیجازەی وەرگرت.

ساڵی ١٩٧٤ز (کلیة)ی ئیمامی ئەعزەمی لە (بەغدا) تەواوکرد، ساڵی ١٩٧٩ز پلەی ماستەری لە زانکۆی (ئەزهەر) وەرگرت، دامەزرا بە مامۆستای پەیمانگا و پێش نوێژ و وتارخوێن، لە (کلیة)ی شەریعەش دەرسی دەداوە، دانراوەکانی:

١. الإقرار بالحقوق والمواهب من كتاب الحاوي، ساڵی ١٩٨٨ز لە بەغدا چاپ کرا.
٢. إختلاف الفقهاء في كلمة (آمين).
٣. الوجيز في علم الفرائض.

سەرچاوە: إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الاسلاميه ٢٠٦ – ٢٠٧

## طاهیر حوسێن بەندەنیجی (٦٣٤)

ناوی طاهیرە، کوڕی حوسێنی خەڵکی (بەندەنیج)ی مەندەلی یە، دوایی چوویتە (هەمەدان) نووسەر و زمان ڕەوان و ڕێزمان زان بووە، لە شیعری عەرەبی دەستی باڵا بووە، دوو قەسیدەی هەیە، یەکەمیان: چل دێرە، پیتەکانی هەموویان بێ نوختەنە، دووەمیان: قەبارەی هەروەکو یەکەمە، بەڵام پیتەکانیان هەموویان نوختەدارن، ئەوەش کارەکی ئاسان نیە، مامۆستا بەرانبەر شیعر پارە و ماڵی دنیای وەرنەدەگرت، لە لای عەیب بوو شت لە کاربەدەستان وەربگرێت، لە ٤٨٠ك – ١٠٨٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. المنتظم ٩/٦١٣.

٢ الأنساب ١/٤٢٢

## طاهیر عبدالرحمان مائی (٦٣٥)

ناوی طاهیرە، نازناوی (ضـیائەدینە)، کـوڕی عبـدالرحمانی ئەفەنـدی ئامێـدی بـی دەریە، خەڵکی گوندی (مائی)یە، عەشیرەتی بـەرواری یـە، یەکـە لـە مەلایـە چـاکەکانی سەردەمی خۆی.

دانراوەکانی:

١ (التذکرة) لە زانستی صەرف دایناوە، سـاڵی ١٣١٤ك - ١٨٩٦ز لـە (مـائی) تەواوی کردووە.

٢ (مرقات الطلاب) لە زانستی (الآداب) دایناوە.

٣ (التبصرة) لە زانستی نەحو دایناوە، شێوەی ئەلفیەی ئیبن مالیکە، ساڵی ١٣٠٧ك - ١٨٨٩ز تەواوی کردووە، لە ١٣١٥ك دووبـارە نووسـیتیەوە، ئـەو هـەردوو کتێبـەی پێشـکەش بـە (خـادم الـسجادە)ی کـەرکوك کـردووە، ئـەو بنەماڵـە دوگوردی نوێژی پێغەمبەریان لە لایە، بۆیە بەو ناوە ناسراون.

مامۆستا ساڵی ١٤٣٣٤ك - ١٩١٥ز کۆچی دوایی کردووە.

لە سەرەتای (تبصرە) دەڵێ:

أحمد ربي بمدى الأيام ولايفي حمدي بالإنعام

وكيف لا أحمد من علمني ماكنت لم أعلم، وقد أكرمني

بخدمة الطلاب للعلوم وهي أجل الكسب والرسوم

وكيف لا أحمد[1] مفتخرا بها ومنها نلت ما لن تحصرا

من درَكي المسائل الشرعية والنكت المضيئة النحوية

والصرف والمنطق والبيان والبحث والآداب والميزان

---

[1] لە سەرچاوەکان وا نووسراوە بەلام کێشەکەی لەنگە، باشتر وایە: (أحمده) بی.

كذا المعاني والبديع النامي كذا أصول الفقه والكلام

كذا الرياضيات في المعقول وسائر الفروع والأصول

لكن حمدي قاصر و لا يفي به بياني مع فرط الكَلف

وكيف لا أحمد مولاي على ما نلته في قريتي من العلا

لە كۆتاییدا دەڵێ:

ختمت تأليفي بفضل الله في تقليدي للشمس الإمام الحنفي

ضارعٌ أن أكون ممن يحشر في جمعه، والله فضلا يغفر

لمن يشا، بمن يشا، وإني لُذت بهم يا رب فأعف عني

بجاهم، فأنت أهل المغفرة والعفوُ قد يطمع عند المقدِرة

سەرچاوەكان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی كورد ٢/٨٤ – ٨٨ /٤/١٥٢.

٢. تاريخ مشاهير كورد ٢/١٣٨.

٣. الأكراد في بهدينان ٢٠٩ – ٢١٠.

## طاهیر عبدالله بەحرکەیی (٦٢٦)

طـاهیر كوڕی مامۆستا مەلا عبداللەی كوڕی مەلا سولـەیمانی كوڕی فەقێ محەممەدی كوڕی ئەحمەد چاوڕەشی كوڕی عەزیزی كوڕی ڕەسولە، عەشیرەتی گـەردی یـە، دانـەری ئەو مێژووە بەنرخەیە، بە پێی نووسینی باوكم لە لاپـەڕەی یـەكی بـەرگی هەشـتی كتێبـی (تحفە) لـە ڕۆژی (١٧)ی مانگی صەفەری ساڵی ١٣٦٤ك بەرانبەر بە سـاڵی ١٩٤٥ز لـە گوندی (بەحركە)ی ناوچەی بەرانەتی پارێزگای (هەولێر) هاتوومەدنیا.

خوێندنم: لـە دەوری ساڵی ١٩٥٢ز لە لای كاكم مەلا طەیب دەسـتم كـرد بـە خوێندنی قورئانی پیرۆز، دوای خە تم كردنی قورئان دەستم كرد بـە كتێبـی (ئەحمـەدی)، هەروەها ناوە ناوە لـە خزمەت باوكم تەصریفی زەنجانیم لـەبـەر دەخوێنـد، پاشـان بەشـێكی

پەندی (عەطاری) فارسیم لەلا خوێند، کتێبەکانی ترم تا قۆناغی کۆتایی هەر هەمووی لە خزمەت کاکم مەلا طەیب خوێندوون، لەو ساڵانەی دیارکراون لە خوارەوە:

ساڵی ١٩٥٧ز دەستم کرد بە (الآجرومیة)، ساڵی ١٩٥٨ز دەستم کرد بە (الأنموذج) هەمووم تەواوکرد، ساڵی ١٩٦٠ز دەستم کرد بە (الإظهار)، ساڵی ١٩٦١ز دەستم کرد بەو کتێبانە... سەعدینی، فتح المعین، تەصریفی مەلا عەلی فیعلی سعداللە، الإستعارة، ساڵی ١٩٦٢ز دەستم کرد بە (جامی) و (منهاج)، ساڵی ١٩٦٣ز دەستم کرد بە إیضاحي حەج، الوضع، أیساغۆجی، مغنی الطلاب، هەر لەو ساڵە لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز بەشێکم لە (تفسیری ابن عباس) لە خزمەت باوکم خوێند، ساڵی ١٩٦٩ز دەستم بە (جمع الجوامع) کرد.

ئەو کتێبانەی خوارەوەم لە خزمەت کاکم خوێندونە، بەڵام مێژووی دەست پێ کردنیانم لە یادم نەماوە: ریاض البدیعة، عبداللە یەزدی، گەلەنبەوی ئاداب، حاشیەی پێنجونی لەسەر گەلەنبەوی، کەمالی شەرحی شافیە، شەرحی عەقائیدی تەفتازانی، مختصر المعانی، خلاصه الحساب، أشکال التأسیس، تشریح الأفلاك، حاشیەی (منە) لەسەر تەشریح، تهذیب الکلام، تفسیر البیضاوی، تفسیر الجلالین، بەشێك لە قەسیدەی بوردییە، بە شێك لە (شرح المنهج).

پاشان ساڵی ١٩٧٢ز بۆ مەبەستی ئیجازە وەرگرتن، کاکم ڕەوانی کردم، بۆ مزگەوتی شێخ مصطەفای نەقشبەندی لە (هەولێر) لەوێ جەنابی (شێخ) بۆ دەرسی بوخاری شەریف و بەشی طەڵاق لە توحفە، لە خزمەت مامۆستا مەلا شەریفی دووشیوانی دانام، هەروەها فەرائیزم لە لای مامۆستا مەلا طاهیری سوسەیی دەخوێند، لە مزگەوتی حاجی محەممەد، لە گەڕەکی ئیسکان، لە یادی ئەو ڕۆژانە، دەڵێم:

| | |
|---|---|
| خۆزگەم بەوڕۆژە، لە دوو خوێندن بووم | بۆ شەرع فێربوون، دەهاتم و دەچووم |
| دەڵێم لە داخی، ئاڵۆزی دونیا | خۆزیا مردبام، لەو ڕۆژە، کە بووم |

ماوەك مامەوە لە مزگەوتی شێخ، لەو کاتی جەنابی شێخ دانی سبیانان و ئێواران، لە مزگەوت دادەنیشت، منیش دەچوومە خزمەتی زۆرجاران تێبینی تایەتی خۆی هەبوو، دەربارەی دەرسەکانم، ئەو بابەتانەی پێویست بە ڕۆنکردنەوە بوون بۆی ڕۆن دەکردمەوە، هەر لەو ساڵە ئیجازەی مەلایەتی پێ بەخشیم، مامۆستا مەلا شەریف لە جیاتی (شێخ) ئیجازەکەی خوێندنەوە، لە ڕۆژی دەست پێکردنم بە (ئەلف و بێی سیارە) تا وەرگرتنی ئیجازە، دەوری بیست ساڵی خایاند ئێستاش خۆم هەر بە فەقێ دەزانم.

قۆناغەکانی فەرمانبەریم: ساڵی ١٩٧٢ز دوای تاقیکردنەوە، لە (بەغدا) دامەزرام لە ناوچەی بەرانەتی، بەناوی (الواعظ)، ساڵی ١٩٧٨ز پاش تاقیکردنەوە، خوێندنەوەی وتاری ڕۆژانی هەینیم پێ سپێردرا، لە (بەحرکە) ساڵی ١٩٨١ز کرام بە پێش نوێژ، لە هەمان شوێن، ساڵی ٢٠٠٥ز کرامە ئەندامی لیژنەی فەتوا، لە (هەولێر).

بەرهەمی ژیانم: لە ساڵی ١٩٦٥ز تا ئێستا خەریکی دەرسدانەوەی فەقێیانم، شان بە شان لەگەڵ کاکم مەلا طەیب، لە قوتابخانەی حوجرەی فەقیان، جێگای باوکمان لە (بەحرکە) لەگەڵ ئەوەشدا، چەند کتێبم نووسیون و دامناون و لێکۆڵینەوەم لێ کردوون، ناوەکانیان:

١. مەرکانەی کوردی بۆ گوڵی بوردی، تەرجومەی قەسیدەی بوردییەیە بە هۆنراوەی کوردی، ساڵی ١٩٨٦ز لە هەولێر چاپ کرا، ساڵی ٢٠٠٦ز دووبارە چاپ کراوە.
٢. (مفتاح الوصول) الى التاج الجامع للاصول، ساڵی ١٩٨٦ز لە بیروت چاپ کرا.
٣. محمد پاشا الرواندزی ساڵی ٢٠٠٢ز لە هەولێر چاپ کرا لە سەر ئەرکی وەزارەتی ڕۆشنبیری.
٤. وەڵامی چەند پرسیارێك لە فیقهی ئیسلامی، ساڵی ٢٠٠٥ز لە هەولێر چاپ کرا لە سەر ئەرکی وەزارەتی ئەوقاف وکاروباری ئاینی.

٥. لێکۆڵینەوەی (رسالة العلم)ی زانای بەرز مەلا محەممەدی خەتێ، ساڵی ٢٠٠٦ز لە هەولێر چاپ کرا.

٦. دیوانی شیعر، کوردی و عەرەبی، ساڵی ٢٠٠٠ز لە هەولێر چاپ کرا.

٧. چەند شیعری کوردی و عەرەبی، دەستنووس.

٨. ئەو مێژووە بەنرخەی بەردەستمانە، دە ساڵ پترە خەریکی کۆکردنەوە و نووسینەوەم، بە یارمەتی خوای گەورە، بەلاوەکرێتەوە.

| | |
|---|---|
| تا ئێرەم ژیان، ئەوها بردەسەر | ناشزانم لە دوا، چم دەهێتەسەر |
| بەختم زۆرباشە کردەوەم چابی | خوایە وابکەی کۆسپەم نێتەبەر |
| هەموو نووسین و خوێندن و دەرسم | کردەوەی چاکم بدرێ لە دەفتەر |
| گەلێ مەمنوونی ئەو خوایە گەورەم | بە یەك (تەسبێحات) بیکا بەرانبەر |
| (سبحان الله، والحمدلله ) | تەنیا هەر خۆیتی (الله أکبر) |

بەشێك لە فەقێیەکانم: مەلا عبدالسلام شێخەلاسی، مەلا عبدالرحمان کفری داودی، مەلا نەبی کەورەبەنی، مەلا محەممەد گورگەیی، مەلا فائیز بیریژی، مەلا محەممەد خۆشکانی، مەلا سولەیمان پیرئۆمەری، مەلا عبدالله بێراوەیی، مەلا ئیبراهیم خەتێ، مەلا شەمسەدین بەحرکەیی، مەلا موحسین بەحرکەیی، مەلا صابیر خەیلانی، مەلا سولەیمان خەیلانی، مەلا فەرحان دێلزیان، مەلا فیکری ئاشی بێکۆر، مەلا رەزا سورچی، مەلا محەممەد هەڵشۆیی، مەلا محەممەد خەلیفە بەحرکەیی، مەلا سەید خدر دەربەندی، مەلا حەیدەر سورچی، مەلا یاسین ترگاری، مەلا محەممەد وەرێ، مەلا عبدالله وەرتی، مەلا محەممەد شێخ وەتمانی، مەلا صەباح هەرشەمی، مەلا جەلال رێزانی، مەلا فەتحی زراری، مەلا نورەدین سێگردکانی، مەلا محەممەد صالح خۆشناو، مەلا جەمال وەرێ، مەلا محەممەد شۆرێ، مەلا عبدالستار سێوەسەنی، مەلا عبدالله هەرشەمی، مەلا صەلاحەدین کەرکوکی، مەلا یاسینی ئامۆزام، مەلا سەید ئەحمەد دەربەندی، مەلا ئیبراهیم صالح بانەیی ئێرانی لە ١/١/٢٠٠٦ز ئیجازەم پێدا، لەگەڵ زۆرانی تر ئێستا لە یادم نەماون، جگە لە مەلا عیصامەدین و

ئەسعەدی برازام، لەگەڵ کورەکانم: ئەبوبەکر و طاریق و فائیق، ئێستاش سوپاس بۆ خودا ڕۆژانە دەرسی فەقێیانم هەر هەیە.

ناوی کورەکانم و مێژووی لە دایکبوونیان: ئەبوبەکر ٢٣/١١/١٩٧١، فاروق ١٩٧٦ز، طارق ١٩٧٧ز، فائق ١٩٧٩ز، عطاء ١٩٨٢ز، عبداللە ١٩٩٣ز، محمد ١٩٩٦ز.

## طاهیر عومەر ئامێدی (٦٣٧)

ناوی طاهیرە، کوڕی عومەری کوڕی مصطەفا عورفی زادەی ئامێدی یە، ساڵی ١٢١٥ك – ١٨٠٠ز لە ئامێدی هاتووتەدنیا، پاشان لەگەڵ باوکی چووە (دیمشق) لەوێ لە لای مەلا سەعیدی حەلەبی خوێندنی تەواوکرد، لە فیقهی حەنەفی شارەزابوو، لە زمانی تورکی ڕەوان بوو، شیعر و پەخشانی هەیە، دوایی کرا موفتی (شام) پاشان لە جێگای باوکی لە مزگەوتی ئومەوی کرا پێش نوێژ، دوایی بە زۆری لە (قوبرص) نیشتەجێ کرا، لەوێ گواستراوە، بۆ (ئەزمیر)، دوایی گەڕاندراوە (ئەستانە) لە (بنغازی) کرا قازی شەرعی، دوایی گەڕاوە (ئەستانە) کرا قازی (خەربووط)، دوایی کرا قازی (حمما)، گەڕاوە (دیمشق)، ساڵی ١٢٩٧ك کرا جێگری دادوەری شەرعی، ساڵی ١٣٠١ك – ١٨٨٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: معجم أعلام الکورد ٣٦٩.

## طاهیر محەممەد شۆشی (٦٣٨)

ناوی طاهیرە، کوڕی محەممەدی کوڕی مەلا طاهیری کوڕی شێخ الإسلامە، لە نەتەوەی شێخ شەمسەدینی شۆشی یە، بە ڕەچەڵەك دەچێتەوە سەر ئیمامی فەضلی کوڕی ئیمامی عەبباس (خوا لێی ڕازی بێ) مامی پێغەمبەر (د.خ)، شۆشە: گوندێکە دەکەویتە بن چیای ئاکرێ، لە لای ڕۆژئاوا، ساڵی ١٩١٧ز لەو گوندە هاتووتەدنیا.

خوێندنی: دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغی سوختەیی لە قوتابخانەکانی (سوسنا) و (باکرمان) و (جەلدیان) و چەند جێگای تر بڕی، ساڵی ١٩٤٧ز هاتە (هەولێر) لە

مزگەوتی حاجی قادر دەباغ لای مەلا عبداللەی بێتواتەی خوێند، دوایی چووە (هێلەوە) لای مەلا ئەبوبەکری کۆیی، گەڕاوە مزگەوتی حاجی قادر، لەگەڵ مەلا عبدالحمید و مەلا صابیر و مەلا ئەحمەدی گردعازەبانی ئیجازەیان لە خزمەت مامۆستا مەلا عبدالله وەرگرت.

مەلایەتی: ئەمجا کۆتایی بە خوێندنەکەی هینا، گەڕاوە (ئاکرێ) لەوێ کرا پێش نوێژ و دەرس بێژ، مامۆستا جگە لەو ئیجازەیە، ئیجازەی خەت و خۆشنووسی لە مەلا شێخ طاهیری کوردی خەڵکی شاری (مەککە)ی پیرۆز وەرگرتبوو، مامۆستا خەتێکی خۆشی هەبوو، چەند کتێبی بە دەستی خۆی نووسینەوە، لەوانە (تەفسیری قورئانی پیرۆز)ی مەلا سەعیدی نورسی یە.

دانراوەکانی:

١. ریاض النور: (گوڵزار) هۆنراوەیە، چاپ کرایە.
٢. نصیحة الأخ: پەند و سیرەتە، هۆنراوەیە، چاپ کرایە.
٣. الشرح المنظوم علی أرجوزة الشیخ معروف النودهي في العروض: بە زمانی عەرەبی یە، چاپ کرایە.
٤. فن القافیة: عەرەبی یە چاپ کرایە.
٥. تاریخ حیاتي: عەرەبی یە چاپ کرایە.
٦. المنتخب في ذکری میلاد محمد فخر العجم والعرب: عەرەبی یە چاپ نەکرایە.
٧. التأریخ: مەلا طاهیري باپیری دایناوە، مامۆستاش لە سەری زیادکردووە، چاپ نەکرایە.

کۆچی دوایی: لە ڕۆژی هەینی ١٢/١٢/١٩٦٢ز لە (ئاکرێ) کۆچی دوایی کرد، لە (شۆش) بە خاك سپێردرا، دوو کوڕی لە دوا بەجێما:

١. مەلا شەمسەدین: بەڕێوەبەری پەیمانگای پێش نوێژو ووتارخوێنانە لە دهۆك.
٢. مەلا حەمزە: مامۆستای مێژووە.

سەرچاوەکان:

1. الإكليل في محاسن أربيل ٣٢٠ – ٣٢٢.
2. إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢٥٨.
3. خۆری ئیسلام، ژمارە ٣٥، ٢٠٠٧ز، ٩٥ – ٩٧.

## طاهیر مەعروف قوشاغلوو (٦٣٩)

ناوی طاهیرە، کوڕی مەلا مەعروفە، خەڵکی گوندی (قوشاغلو)ە، لەو شوێنە جێگری باوکی بووە لە مەلایەتی و جێبەجێ کردنی کاروباری ئاینی و ئامۆژگاری خەڵکان، زانایەکی هێمن و لە سەرەخۆ و قسەخۆش بوو، عەرەبی و فارسی دەزانی، نازناوی (پاکی) بوو، بۆ سەرخۆشی و تازییەی مامم مەلا عبدالعزیز مەلا سولەیمان پێش نوێژ و وتارخوێنی (دیبەگە) چەند شیعری کوردی و عەرەبی و فارسی داناوە، هەروەها کتێبی (فتح القريب)ی تەرجوومە کردووە بە هۆنراوەی کوردی، خەتەکی خۆشی هەبوو، ساڵی ١٩٧٢ز (رفع الخفا)ی شەرحی (ذات الشفا)ی بۆ کاکم مەلا طەیب نووسییەوە، مامۆستا زۆرجاران سەفەری حەجی ماڵی خوای کردبوو، بەردەوام بوو لەسەر خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، تا کۆچی دوایی کرد. دیوانەکەی ساڵی ٢٠٠٨ز چاپ کرا.

سەرچاوە: الإكليل في محاسن أربيل ٣٥٤ – ٣٥٥.

## طاهیر نەجیب سەرانی (٦٤٠)

ناوی طاهیرە، کوڕی شێخ نەجیبی کوڕی شێخ کاك ئەمینی سەرانە، ساڵی ١٩٢٢ز لە گوندی (بلە)ی ژێری سەر بە (خەلیفان) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لەم شوێنانەی خوێندووە: لە (هەرتەل) لای مەلا فتح الله، لە (خەتە) لای مەلا ئیبراهیم، لە (سەران) لای مەلا عبدالله، لە (ڕواندز) لای مەلا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی، لە (کۆیە) لای جەنابی مەلا محەممەد جەلی زادە.

مەلایەتی: کۆتایی بە خوێندن هینا، بووە مەلا لە (بلە)ی ژێری، کاروبـاری ڕەز و باغ و کشتوکاڵیشی دەکرد، نووسەر و شاعیر بوو، نازنـاوی (زوهدی)یـە، لـە سـەرەتای هۆنراوەی ئیسماعیل نامە دەڵێ:

به ناوی خودای ڕەحمان و (الرەحیم) تەوفیقم بدات، خودایی کەریم
بۆتان بەحس کەم زیبحی ئیسماعیل خودا ئەمری کرد ئیبراهیم خەلیل

لە مەتحی پێغەمبەر (د.خ) دەڵێ:

بابی مسکین و غەریبان یا محەممەد توی ئەمین
شافیعی مەحشەر محەممەد صاحیبی دینی موبین
قیبلەکەت کەعبەی موکەڕڕەم تۆی (إمام المتقین)
تۆی ئومێدی بێ ئومێدان، هەم (إمام المرسلین)
شافیعی ڕۆژی سەرایە، ڕەحمەتە بۆ عالەمین

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٨٨ز لە لایەن ڕژێمی بەعس، دۆڵی ئاکۆیان و گەرەوان و سەران، ئاگرێ تێبەردرا، دوکەڵی سووتان ناوچەکەی داپۆشی، لەگـەڵ بەرزبوونـەوەی دوکەڵەکە گیانی پیرۆزی بەرەو بارەگای خوای گەورە بەرزبۆوە.

سەرچاوە: خۆری ئیسلام، ژمارە ١٥، ٢٠٠٢ز، ٥٠ – ٥٦.

## طەییب ئەحمەد دووشیوانی (٦٤١)

ناوی طەییبە، کوڕی مـەلا ئەحمـەدی کـوڕی محەممـەدی کـوڕی حوسـێنی کـوڕی ئیسـماعیلە، خـەڵکی گونـدی (دووشـیوان)ە، عەشـیرەتی مەنتکـە، سـاڵی ١٨٩٦ز هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە لای مەلا شەریفی برای دەسـتی کـرد بـە خوێنـدن، دوایـی چـووە (دیمەکار) لای مەلا سەعیدی برای، پاشان چووە (دیبەگە) لای مـەلا عبـدالفتاحی خـەتێ، ماوەکیش چـووە (عـاڵلا) لای مـەلا ئـەمینی هـەولێری، مـاوەکیش لـە لای مـەلا عـەلی ڕواندزی بوو، ئەمجا بۆ دەرسی (فەلەکیات) چووە (شەقلاوە) لای مامۆستا مەلا طاها، هەر

لەوێ ساڵی ١٣٤٢ك - ١٩٢٣ز حاشیەی (منهوات)ی سەر تەشریکی نووسیەوە، پاشان هاتە (هەولێر) ماوەی چوار ساڵان لە مزگەوتی قەڵات لە خزمەت مەلا ئەفەندی دەرسەکانی کۆتایی خوێند، هەر لەوێ ساڵی ١٣٤٤ك شەرحی مەلا شێخی کوردی، لەسەر (زەورا) و (حەورا)ی جەلالەدینی دەوانی نووسیەوە، مامۆستا ماوە لەلای مەلا ئەفەندی، تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: ئەمجا کۆتایی بە خوێندن هێنا، لە چەند شوێنان مەلا بوو و دەرسی دەدا، لەوانە: قەپران، گردمەلا، گردەسۆر، بشیریان، دێمەکار، قوش قایە، دوایی هاتە (هەولێر) کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی ئەسعەد ئاغا لە قەڵات، ساڵی ١٩٧١ز لەسەر بڕیاری سەرۆك مەلا مصطەفای بارزانی کرا قازی شەرعی لە ناوچەی مەنتکان.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا صادقی فەرهادی، مەلا سەعیدی فەرهادی، مەلا عبداللهی فەرهادی، مەلا محەممەد قادر ئازیانەیی، مەلا صاڵح خدر دیلان، دکتۆر محەممەد شەریفی برازای، مەلا عوسمانی حاجی مەلای بەحرکەیی، مەلا طەڵعەتی مەنتك، مەلا طەییبی بەحرکەیی، مەلا عبداللهی پەرپیتانی، مەلا ئیسماعیلی مەحمود زراری.

کۆچی دوایی: لە ٢١/١١/١٩٧٨ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: چەند دانراوی هەیە، لەوانە:

١. حاشیە لەسەر تەفسیری (مەداریك) تا سورەتی هود: یەك بەرگە.
٢. شەرحی (الفوائد الحسينية)ی مەلا ئەفەندی مامۆستای: سەرەتایەکەی دەست پێ دەکا بە (أما بعد: فيقول أفقرالمذنبين، الى عفو ربه وشفاعة سيد المرسلين وعترته، محمد طيب بن الحاج ملا أحمد الصائم الدوشيواني...)

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٨٩ - ٩٠.

## طەییب عبدالله بەحرکەیی (٦٤٢)

ناوی طەییبە، کوڕی مەلا عبداللهی کوڕی مە سولەیمانی کوڕی فەقێ محەممەدی کوڕی ئەحمەد چاوڕەشی کوڕی عەزیزی کوڕی ڕەسولە، عەشیرەتی (گەردی)یە برا گەورە

و مامۆستای نووسەری ئەو مێژوەیە، هەر لە ئەلف و بێی سیپارە تا قۆناغی کۆتایی هەر هەمووم لە خزمەتی ئەو خوێندووە، بەپێی نووسینی باوکم لە لاپەڕەی یەکەم لەبەرگی هەشتی توحفە، لە یەکی مانگی شەعبانی ساڵی ١٣٥٧ك - ١٩٣٨ز لە گوندی (دارەبەن) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: دەوری ساڵی ١٩٤٥ز لە گوندی (بنەسراوە)ی گەورە، لە لای مامۆستا مەلا ئەحمەد ئاشۆکانی (بابی داکم) دەستی کرد بە خوێندنی قورئانی پیرۆز، هەر لەوێ خەتمی کرد، پاشان دەستی کرد بە (تەصریفی زەنجانی)، دوایی گەڕاوە (بەحرکە)، لە لای موستەعیدەکانی مەدرەسەی (بابم) کتێبە سەرەتاییەکانی قۆناغی سوختەیی تەواوکرد، دوایی چووە گوندی (گردارەق) ماوەی شەش مانگان لە لای (خاڵم) مەلا مەسعود بوو، گەڕاوە بەحرکە لای (مامم) مەلا عبدالقادر، تا کۆتایی بە کتێبی (جامی) هێنا لە لای ئەوبوو، پاشان لەسەر بڕیاری ئەو کتێبی (ئیساغۆجی) مەنتیقی لە خزمەت (باوکم) دەست پێ کرد، کتێبەکانی قۆناغی موستەعیدی لە خزمەت ئەو تەواوکردن، ساڵی ١٩٦٥ز باوکم کۆچی دوایی کرد، ڕۆژی سێیەمی (تازیە) دەستەیەك لە زانایەکانی (هەولێر) و دەوروبەر لەگەڵ مامەکانمان و خزمەکان بە سەرۆکایەتی مامۆستا مەلا عەلی و مامۆستا مەلا عبداللهى بێتواتەیی، مەندیل و جوبەی مەلایەتیان لەبەرکرد، لە شوێنی باوکمیان دانا بە پێش نوێژ و وتارخوێن و دەرس بێژ.

بەڵام لەو کاتە جەنابی شێخ مصطەفای نەقشبەندی کە شێخ و مامۆستای بنەماڵەی ئێمەیە تەشریفی لە (بەغدا) بوو، لەو مەراسیمە ئامادەنەبوو، کاتێ گەڕاوە هەولێر هاتە (بەحرکە)، پاش سەرەخۆشی کردن و چەند قسەی بەنرخ و خۆش، بڕیاریدا کاکم بچێتە هەولێر، ماوەك لە مزگەوتی ئەو کتێبانی خوێندنی باڵای مەلایەتی لە لایەن چەند مەلایە باشەکان بخوێنی، بۆ ئەو مەبەستە (کاکم) چووە مزگەوتی شێخ، مەلا صەدیقی حاجی سەعیدی پلکزامان، و مەلا جەمیلی مەلا عەلی پەریتانی و مەلا ئیسماعیلی حاجی مەحمودی گۆپاری و مەلا ئەنوەر کەریمی شەوەکی لەگەری چوون، نووسەری ئەم مێژووە

لەو ماوەیە کاروباری ئاینی لە (بەحرکە) ئەنجام دەدا، ئەمجا لە لایەن ئەو مامۆستایانە، کە جەنابی شێخ دەست نیشانی کردن: مامۆستا مەلا شەریفی دووشیوانی، مامۆستا مەلا طەیبی دووشیوانی، مامۆستا مەلا خەلیل (موخلیص)، مامۆستا مەلا ئەبوبەکری کۆیی، کتێبانی: (جمع الجوامع) و (تهذیب الکلام) و (تشریح الأفلاك) و (حاشیەی منە) و (خلاصة الحساب) و (الربع المجیب) و (أشکال التأسیس)ی خوێندن، وەهەموو ڕۆژان، دوای نوێژی (عەسر) دەچووە خزمەتی شێخ، بۆ پێداچوونەوەی دەرسەکان و ڕۆنکردنەوەی ئەو جێگایانەی کێشەیان لەسەر دەکران.

مەلایەتی: ئەمجا کۆتایی بە خوێندن هێنا، لە ڕۆژی ١٤/١١/١٩٦٦ز جەنابی شێخ هاتە (بەحرکە) ئیجازەی مەلایەتی پێدا، بەم بۆنە پیرۆزە کۆڕێکی گەورە بەسترا، چەند زانایان و پیاوماقوڵان لە (هەولێر) و (کەرکوك) و (موصل) و (ئاکرە) ئامادەبوون، هەروەها خەڵکی بەحرکە و ناوچەی (بەڕانەتی) زۆریان کۆبوونەوە، لەو بۆنە ئاینیە پیرۆزە، کە لەمێژ بوو ئەو وێنەیە نەکرابوو نەدیترابوو نەبیسترابوو، دەستی کرد بە ئەنجام دانی کاروباری مەلایەتی و ئامۆژگاری خەڵکان و دەرسدانەوەی فەقێیان.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا ئیبراهیمی هەرشەمی، مەلا خەلیلی برایمەلەکی، مەلا محەممەدی بەنێنانی، مەلا محەممەدی خۆشکان، مەلا ئیسماعیلی گۆپاری، مەلا ئەنوەری شەوەکی، مەلا صەدیق برایمەلەکی، مەلا جەمیل پەرپیتانی، مەلا عبداللەی پەرپیتانی، مەلاصادقی مزوری، مەلا طاهیری نووسەری ئەم مێژووە، مەلا سەعدەدین مەلا مەسعود، مەلا ئیبراهیم وەرتی، مەلا صابیر خەیلانی، مەلا عبدالسلام شێخەلاسی، مەلا شەمسەدین بەحرکەیی، مەلا محەممەد گورگەیی، مەلا محەممەد وەرێ، مەلا جەمال وەرێ، مەلا فائیز بیرێژی، مەلا سولەیمان بیرئۆمەری، مەلا محەممەدی شۆرێ، مەلا نەبی کەورەبەنی، مەلا یوسف کادانی، مەلا موحسین بەحرکەیی، مەلا سەید ئیسماعیل دەربەندی، مەلا عیسامەدینی کوڕی، مەلا ئەسعەدی کوڕی، ئەبوبەکری برازای، مەلا حەیدەر ئافریانی.

ئەوانەی ئیجازەی مەلایەتی پێداون و بەرواریان:

- مەلا ڕەزا زرار سورچی ٢/٢/١٩٨٤.
- مەلا عبدالله عبدالقادر وەرتی بەروارەکەمان لا نەمایە.
- مەلا عبدالستار حسن سێوەسەنی ٢/٦/١٩٨٨.
- مەلا محەممەد ئەحمەد هەڵشۆیی ٢٠/٨/١٩٩٠.
- مەلا محەممەد عبدالرحمان شێخ وەتمانی ١١/٨/١٩٩٢ز
- مەلا سعدالدین مەلا مەسعود ١٥/٩/١٩٩٢ز
- مەلا عبدالله محەممەد بەحرکەیی ٢٤/١٠/١٩٩٤ز
- مەلا حەیدەر محەممەد ئافریانی ٢٤/١٠/١٩٩٤ز
- مەلا فەتحی جەرجیس باوەخەلی ٥/١١/١٩٩٨ز
- مەلا سەید ئەحمەد سەید ئیسماعیل ٥/١١/١٩٩٨ز
- مەلا نورەددین ئەحمەد سێگردکانی ٧/١٠/١٩٩٩ز
- مەلا عیصامەدینی کوڕی ٢٠/٩/٢٠٠١ز
- مەلا مەظهەر عبدالله چۆمبارۆکی ٢٠/٩/٢٠٠١ز
- مەلا ناصیح حوسێن سورچی ٣/١٠/٢٠٠٢ز

قۆناغەکانی فەرمانبەری و بەرواریان:

- لە ٩/١/١٩٦٤ز کرا (واعیز) بەرانبەر موچەی دە دینار مانگانە.
- لە ٢٨/١/١٩٦٤ز کرا پێش نوێژ.
- لە ٤/٢/١٩٦٧ز ڕەزامەندی دەرچوو بە دەرسدانەوەی لە بەحرکە.
- لە ٤/٥/١٩٦٨ز کرا (مدرس) لە پەیمانگای ئاینی بەحرکە.
- لە ١٩٧٦/٣/٣ز گواستراوە بۆ پەیمانگای (هەولێر).
- لە ١٩/١٠/١٩٧٦ز گەڕاوە بەحرکە بە پێش نوێژی مزگەوت.
- لە ٢٢/٤/١٩٨٦ز پلەی وتارخوێنی پێدرا.

• لە ٢٠٠٤ز خانەنشین کرا، بەڵام بە (گرێبەستە) گەڕاوە بەناوی پێش نوێـژ و ووتارخوێن.

• لە ٢٠٠٥ز کرا ئەندامی لیژنەی باڵای فەتوای شەرعی لە (هەولێر).

دانراوەکانی:

١. حجج المتقين في بعض المسائل من فروع الدين، ساڵی ٢٠٠٤ز لە هـەولێر چـاپ کرا.

٢. عمدة الزوار في بعض مسائل الحج والإعتمار: چەند دانەی بە لێکۆڵینـەوەی مـەلا طاریقی کوڕم چاپ کراوە.

٣. حەج نامە: چۆنیەتی حەج و عومرە بە کوردی، چەند دانەی چاپ کراوە.

٤. هداية الباقي بشرح ألفية العراقي: ئێستا خەریکە بە یارمەتی خوا چاپی بکا.

٥. المفتاح المعتمد لمرويات الشافعي في المسـند: لـە ٣ذي القعـدة ی سـاڵی ١٤٢٦ك تەواوی کردووە.

کوڕەکانی و ساڵی لە دایك بوونیان: عصام الـدين ١٩٦٩ز، عاصـم ١٩٧١ز، أسعد ١٩٧٧ز، نافع ١٩٨٣ز، عبد السـلام ١٩٨٦ز.

خووڕەوشتی: مامۆستایەکی ڕووخۆش و قەشەخۆش و مەجلیس ئاوەدان و، هێمن و باخەڵ فراوان و چاوبڵندە، چاوی لە دەستی خەڵکان نیە، حەز لە هاتووچۆی خزمایەتی و دۆستایەتی دەکا، سینگ فراوان و بە وەفا و بە ئەمەکە، بۆ ڕوداوانی شەریعەت خـەڵکی ناوچەی بەڕانەتی دەگەڕێنەوە سەر فەتوای ئەو، زۆر مەراقی دەرسدانەوەی فەقێیانە، سـاڵی ١٩٥٨ز کە فەقێ قاتی بـوون لـە کوردسـتان –سـوپاس بـۆ خـودا– ئـەو کـۆڵی نـەدا، مەدرەسەی بەحرکە ئاوەدان بوو، لە خزمەت باوکمدا دەرسی دەخوێند و دەرسـی دەداوە و سەرپەرشـتی حوجرەکـانی دەکـرد، هـەروەها دەوری سـاڵی ١٩٨٠ز ڕژێمـی بـەعس خوێندنی فەقێیانی قەدەغەکرد، چەند کەسـانی بڕوایێکـراوی خـۆی لـە (بەغـدا) هـەناردە (هەولێر) کۆبوونەوەیەکی فراوانیـان لەگـەڵ مەلایـەکان کـرد، بڕیـاری حکومـەتیان پـێ

ڕاگەیاندن، کە بە هیچ شێوەیەك نابێ حوجرەکانی مزگەوتەکان فەقێ لێ بخوێنن، لەوکاتەش مامۆستا وازی لە دەرسدانەوە نەهێنا، وەچەند فەقێ کە لە (هەولێر) پەراگەندەبوون و نەحەوانەوە ئەوانیشی وەرگرتنەوە، پاش ماوەیەك ئیجازەی پێدان.

مامۆستا زانایەکی زیرەك و زەین تیژ و بە توانایە، لەو کاتە لە (هەولێر)ی دەخوێند مەلا عوسمانی ماجیداوەی دەیگوت: سەرم سوڕمایە لەو مەلایە، ئەو هەموو وانەی لێك جودا حیساب و هەندەسە و فەلەکیات و حیکمەت و ئوصول ڕۆژانە دەخوێنێ، هەر دەرسەك دێ دەڵێی: تەنیا ئەو دەرسە دەخوێنێ، ماندووبوونی پێوە دیار نیە.

چەند نمونەیەك لە کارەکانی بەرژەوەندی گەل: مامۆستا هەمیشە خەمی خەڵکی بەحرکە و ناوچەکەی لە ئەستۆیە، بۆ لابردنی کێشەکانی ڕوودەدەن دەگەڕێنەوە لای ئەو، ڕێزی تایبەتی خۆی لای هەموو چینەك هەیە، بۆ ئاسانکاری کارەگرینگەکان دەستێکی باڵای هەیە، بۆ نموونە:

١. ڕاپەڕینە گشتی یەکەی ساڵی ١٩٩١ز پێشمەرگەکان و گەنجەکان، ڕۆیشتن بەرەو چیاکان و سنوری تورکیا و ئێران، مانەوە چەند پیرەمێرد و ژن و منداڵ ڕژێمی بەعس دەستی کرد، بە بۆمبابارانی بەحرکە و ناوچەکە مامۆستا لەگەڵ چەند ڕیش سپیان، بەناو لەشکری دوژمندا چووە لای سەرۆك سوپای هەولێر - هەرچەندە چوونەکە لەوکاتە زۆر ترسناك بوو - گوێی پێ نەدا چووە لای تکای کرد، لێدانی تۆپ و تەیارە لەسەر ناوچەی بەڕانەتی بەگشتی ڕاگیرا خەڵکان حەسانەوە، زۆربەی دەربەدەربووەکان گەڕانەوە.

٢. ساڵی ١٩٩٣ز کێشەك ڕوویدا لە نێوان گەردیەکانی گوندی (بەربیان) لەگەڵ هەرکیەکانی گوندەکە، ئیشەکە گەورە بوو، لە ئەنجامدا بەحرکە و چەند گوندی گەردیان لەشکریان نارد بۆ سەر هەرکیان، کاتژمێر (د٥) یان دانا بۆ هێرشکردن، هەرکی لە سەروچاوە و هەرشەم و شێخان لەشکریان کۆکردەوە، مامۆستا بەو شەوە - منیش لە خزمەتی بووم - چووە ناویان هەردوو لای هێورکردنەوە هەر

بەو شەوە (مەحمود ئاغای) سەرۆکی عەشیرەتی هەرکی هینا دیوەخانی حاجی سمایل ئاغا لە بەربیان، بە تەواوی پێکهاتنەوە، لەشکرەکان بەلاوبوون یەك نوقتە خوێن نەرژا، ئێستاکە سالّی ٢٠٠٨ز برایەتیان بەردەوامە.

– ع –

## عائیشة عیصمەت تەیمور (٦٤٣)

عائیشەخان کچی عیصمەتی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی محەممەد کاشیفی تەیمورە، لە کوردەکانی موصلە، سالّی ١٢٥٦ك – ١٨٤٠ز لە (قاهیرە) هاتووتەدنیا، شاعیر و نووسەر و ڕێزمان زان و زیرەك بووە، قورئانی پیرۆز لەگەلّ شەریعەت و دەستووری خەتی لە لای ئیبراهیم مونیس خوێند، ڕێزمان و صەرف و فارسی لە لای خەلیل ڕەجائی خوێند، نەحو و عەروزی لای فاطیمەی ئەزهەری و ستیتەی طەبلاوی خوێند، سالّی ١٢٧١ك لەگەلّ محەممەد تەوفیق بەگی مێردی چووە (ئەستانە)، پاش کۆچی دوایی پیاوەکەی عائیشەخان گەڕاوە (میصر)، لەوێ دەستی کرد بە بەلاوکردنەوەی زانیاری عەرەبی و تورکی و فارسی، لە ١٩٠٢ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: حلیة الطراز: شیعرە، نتائج الأحوال في الأقوال والأفعال، مرآة التأمل في الأمور، کشوفە: تورکییە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٦٢.
٢. مشاهير الكورد ٤٤٠.
٣. معجم أعلام الكورد ٣٧٨.
٤. إيضاح المكنون ١/٤٢٠.
٥. معجم المؤلفين ٥/٥٥ – ٥٦.
٦. هدية العارفين ١/٤٣٦
٧. الأعلام ٤/ ٥ – ٦.

## عائیشه محەممەد جزیری (٦٤٤)

عائیشەخان کچی محەممەدی کوڕی یەحیای کوڕی بەدری کوڕی یەعیشی جەزیرییە، خانمەکی زانا و بە دین بووە، دەرسی فەرموودەی لە لایەن چەند مامۆستایان خوێندووە، گەیشتۆتە ئەو پلەیە لە (دیمشق) دەرسی داوە، هەر لەوێ ساڵی ٧٤٣ك – ١٣٤٢ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٢/١٤٥.
٢. معجم المؤلفين ٥/٥٧.
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٦٣.
٤. معجم أعلام الكورد ٣٧٩.

## عائیشه محەممەد حەڕانی (٦٤٥)

عائیشەخان کچی محەممەدی، کوڕی موسلیمە خەڵکی (حەڕان)ە، ساڵی ٦٤٧ك – ١٢٤٩ز هاتووتەدنیا، خانمەکی چاك و بە دین و لە خوارازی بووە، مامۆستای فەرمووده بووە و دەرسی دایەوە، چاوی لە دەستی کەس نەبووە، دوورمانی کردووە، کرداری دەستی خۆی فرۆتیە و نانی دەستی خۆی خواردیە، لە مانگی شەوالی ساڵی ٧٣٦ك – ١٣٣٦ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٢/١٤٥.
٢. معجم أعلام الكورد ٣٧٩.
٣. معجم المؤلفين ٥/٥٧.

## عابید عوبەیدی (٦٤٦)

زانای خواناس و بەدین مامۆستا عابید، خەڵکی گوندی (ئەبو عوبەیدە)ی نزیك هەڵەبجەیە، ساڵی ١٣٢٥ك – ١٩٠٧ز هاتووتەدنیا، لە خانەوادەکی ئایین پەروەر پێ

گەیشتووە، لای مەلا سەعیدی مەلای گوندەکە دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە گوندی (فەقێ جنە)ی سەر بە (وارماوە) لای مەلا عبدالقادری صۆفی ماوە تا ئیجازەی وەرگرت، ساڵی ١٣٥٠ك – ١٩٣١ز کرا مەلای گوندی (نێرگسەجاڕ)، دوای سێ ساڵ چووە (بیارە) تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عەلائەدین وەرگرت.

دەستی کرد بە دەرسدانەوە و جێبەجێ کردنی ئادابی تەریقەت، بەردەوام بوو لەسەر واجب و سوننەت، ئەنجام دانی نوێژ و جەماعەت، یادی خودا و شەونوێژ، ساڵی ١٣٥٣ك چووە گوندی (بیاویلە) لەوێش فەقێی هەبوون، هەر لەو گوندە ساڵی ١٣٦٠ك – ١٩٤١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٥٧ – ٢٥٨.

## عارف عبدالصمد بالكی ( ٦٤٧ )

ناوی عارفە، کوڕی مەلا عبدالصمدە، ساڵی ١٢٩٠ك – ١٨٧٣ز لە گوندی (بالك) هاتوتەدنیا، لە خزمەت باوکی قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، دەستی کرد بە خوێندنی ڕێزمان و عەرەبی و شەریعەت، لە چەند شوێنان گەڕا، تا چووە خانەقای (دورود) لە هەورامان، لەوێ شێخ عەلائەدین دایمەزراند بە پێش نوێژ و نووسەری تایبەتی خۆی و سەر خەتمی بەیانیان و ئێواران لە خانەقا، پاشان چووە گوندی (ینگیجە)، دوایی گەڕاوە (دورود) لەوی ساڵی ١٣٣٦ك – ١٩١٧ز دەستی کرد بە دەرسدانەوە، هەر لەو ساڵە کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٥٨ – ٢٥٩.

## عارف عبدالقادر چنگیانی ( ٦٤٨ )

ناوی عارفە، کوڕی مەلا عبدالقادرە، ساڵی ١٨٨٧ز لە گوندی (چنگیان)ی شارباژێڕ هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن لە قوتابخانەکانی (سلێمانی) و دەوروبەری، کۆتایی بە خوێندن هینا، گەڕاوە خزمەت باوکی، بۆ یارمەتی دانی لە کاروباری ئاینی، کە باوکی کۆچی دوایی کرد بووە جێگری، ساڵی ١٣٧٢ك – ١٩٥٢ز باری کرد بۆ

(سلێمانی)، پاشان چووە مزگەوتی مەحمودپاشا لە (قزراباد)، دوایی گەڕاوە (سلێمانی) لە مزگەوتی مەلا شەریفی سعاتچی کرا مەلا، لە ١٩٦٧ز کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی لە پاش بەجێمان: مەلا عیصام و موعتەصەم.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٦٠ – ٢٦١.

٢. دیوانی نالی / فاتیح عبدالکریم، پێشەکی ٨ – ٩.

## عارف محەممەد پێنجوینی (٦٤٩)

ناوی عارفە، کوڕی محەممەدە، خەڵکی (پێنجوینە)، زانایەکی زیرەك و زەین تیژ بوو، حەزی لە لێکۆڵینەوە و دەمەتەقە بوو، لە چەند قوتابخانان گەڕا، پاشان چووە (سنە) لای مەلا عبدالعظیمی موجتەهیدی، ماوەکیش لە لای مەلا ڕەشید بەگ و مەلا عبدالعزیزی پرێسی خوێند، دوایی چووە خزمەت باباعەلی لە (سلێمانی)، پاشان چووە لای شێخ عومەری قەرەداغی، لەوێ چووە لای شێخ نەجیب، ئەمجا کۆتایی بە خوێندن هینا.

کرا پێش نوێژ و دەرس بێژ لە مزگەوتی عوسمان پاشا لە (پێنجوێن)، دوایی تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عەلائەدینی بیارە وەرگرت، ساڵی ١٣٨٠ك – ١٩٦٠ لە پێنجوێن کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی لە پاش بەجێمان: (١) مەلا جەلال (٢) مەلا ئەحمەد: پێش نوێژ و وتارخوێن بوو لە مزگەوتی گەورەی پێنجوێن.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٦١ – ٢٦٢.

## عاصم ئیبراهیم حەیدەری (٦٥٠)

ناوی عاصمە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەری دووەمە، زانایەکی مەزن و بە توانا بووە، لە زانستەکانی قورئانی پیرۆز دەستی باڵا بووە، حەفتا جار بە فەرموودەکانی پیغەمبەر (د.خ) داچوویتەوە، سی جار پتر توحفەی ئیبن حەجەری بە دەرس گۆتیتەوە، زانیاری تایبەتی لەسەر تەفسیری بەیزاوی و حاشیەکانی هەبووە، لە چەرخی خۆی

روخساری وەك مانگی چاردە شەوقی داوە، زانیاری وەکو دەریا شەپۆلەی داوە، زێر و زیو و دوڕ و مەرجانی بە دەست هیناوە، لەسەر ڕەوشتی خۆشەویستی خوا (د.خ) ڕۆیشتووە، تەریقەتی نەقشبەندی لە مەولانا خالیدی شارەزوری وەرگرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا نووسەر و شاعیر بووە.

دانراوەکانی: چەند کتێبی داناون، بۆ نمونە: (المسائل الإيقانية في الرد على الأسئلة الإيرانية) و (حاشية على حاشية الخيالي على شرح العقائد) و (حاشية على تفسير البيضاوي).

مامۆستا ساڵی ١١٧٣ك – ١٧٥٩ز شەرحی (تشريح الأفلاك)ی باوکی نووسیتەوە تا ساڵی ١١٩٢ك دەرسی داوە، دوای ئەو بەروارە لە تەمەنی صەد ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

سێ کوڕی مەلای هەبوو: یەکەم: نعمةالله: بە پێی نووسینی باوکی ساڵی ١١٦١ك – ١٧٤٨ز لە دایك بووە، نازناوی ئەبولجودە، ساڵی ١١٨٦ك – ١٧٧٢ز کتێبی عیصامەدینی وەضعی سەر (عضدیە)ی نووسیتەوە، دووەم: عثمان، سێیەم: محمد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٥/٥١.
٢. بنەماڵەی زانیاران ٢٣٤ – ٢٣٥.
٣. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/١٩٤ – ٢٩٤.

## عەبادە عبدالغنی حەڕانی (٦٥١)

ناوی عەبادەیە، کوڕی عبدالغنی کوڕی مەنصوری کوڕی مەنصوری کوڕی عەبادەیە خەڵکی (حەڕان)ە، ساڵی ٦٧١ك – ١٢٧٢ز هاتووتەدنیا، لە (دیمشق) دابەزیوە لای تەقیەدینی کوڕی تەیمییە دەرسی فەرمودە و شەریعەتی خوێندووە، زاتەکی بە دین و بێ فیز بووە، یارمەتی برادەرانی داوە، شەونوێژی نەچووینە، دەرسی صەحیحی موسلیمی داوە، لە مانگی شەووالی ساڵی ٧٣٩ك – ١٣٣٩ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/١١٧ – ١١٨.
٢. الدرر الكامنة ٢/١٤٥ – ١٤٦.
٣. معجم أعلام الكورد ٣٨٠.
٤. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/٤٣٢ – ٤٣٣.

### عەبباس مەحمود عەققاد (٦٥٢)

ناوی عەبباسە، کوڕی مەحمودی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی مصطەفایە، لە کوردەکانی (دیاربەکر)ە، لەبەر ئەوەی یەك لە باپیرانی ئاوریشمی چنیوە ناوبراوە بە (عەققاد) ساڵی ١٣٠٦ك – ١٨٨٨ز لە (ئەسوان)ی میصر، لە دایك بووە، هەر لەوێ خوێندنی سەرەتایی تەواوکرد، لەبەر زیرەکی هەر لە منداڵییەوە فێری زمانی ئەڵمانی و ئینگلیزی و فەرەنسی بوو، ماوەك نووسەر بوو، پاشان دەستی کرد بە ڕۆژنامەنووسی لە ڕۆژنامەکانی (قاهیرە) چەند شتی بەلاوکردەوە، دوایی کرا ئەندامی کارای ڕێزمانی عەرەبی، ئەندامی هاتووچۆ لە (دیمشق) و (بەغدا)، ساڵی ١٩١٦ز یەکەم دیوانی شیعری دەرکرد، ساڵی ١٩٢١ز کتێبی (الدیوان)ی بەلاوکردەوە، لە ١٩٣٦ز مێژووی بۆ سەعد زەغلول نووسی، هەروەها (العبقریات) و چەند کتێبی تری داناون، جگە لەو باس و بابەتانەی لە گۆڤارەکان و ڕۆژنامەکانی بەڵاوکردونەوە، ساڵی ١٣٨٣ك – ١٩٦٣ز لە (ئەسوان) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: معجم اعلام الكورد ٣٨١ – ٣٨٢.

### عبدالرؤف حەسەن گۆران (٦٥٣)

ناوی عبدالرەئوفە، کوڕی حەسەنی کوڕی عبداللەی کوڕی سەعیدی کوڕی محەممەدی کوڕی مەلا حەسەنی کوڕی مەلا ئیلیاسی کوڕی سەعیدی کوڕی ئیبراهیمی گۆرانی یە، لە (١٧)ی مانگی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ١٢٥٧ك – ١٨٤١ز، لە شاری (مەدینە)ی پیرۆز چاوی خۆی هەڵهیناوە لە دنیا.

لە خزمەت باوکی قورئانی پیرۆز و کتێبی میلحە و ئەلفیەی خوێند و لەبەری کردن، دوایی شەرحی ئەو دووانەی تەواوکردن، پاشان (الامم لإیقاظ الهمم)ی دانراوی شێخ ئیبراهیمی باپیرەگەورەی خوێند، دوایی بۆ دەرسی فەرموودە چووە لای شێخ عبدالغنی دەهلەوی، پاشان چووە سەفەری حەج، لەوێ بە خزمەت شێخ ئەحمەد زەینی دەحلان گەیشت، چەند زانیاری لێ وەرگرت، دوایی چووە (میصر) لەوێ چووە (شام) لەوێ چووە (ئەستانە)، دوایی چووە (هیند) لەوێ قوتابخانەکانی دەهلی و حەیدەر ئابادی بەسەر کردنەوە، پاشان چووە (مالیزیا)، دوایی چووە (ئەندەنوسیا) لەوێ لە نزیک (مەندۆرە) لە جزیرەك دابەزی، لەوێ ژنی هینا و منداڵی بوون، ساڵی ١٣٥٨ك – ١٩٣٩ز لە جزیرەی (سیفوت) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: نثر الجواهر والدرر ١/٧٠٦.

## عبدالرەئوف محەممەد نەقشبەندی (٦٥٤)

ناوی عبدالرەئوفە کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی شێخ ئەمینی (بێژوە)یە، ساڵی ١٣٥٧ك – ١٩٣٨ز لە گوندی بێژوەی ئالانی (سەردەشت) هاتووتەدنیا، لە خزمەتی باوکی دەستی کرد بە خوێندن، ساڵی ١٣٧٠ك – ١٩٥٠ز باوکی کۆچی دوایی کرد، چووە لای شێخ ئەمینی باپیری (رسالة العروض)ی دانراوی خۆی لەگەڵ چەند کتێب لە خزمەت خوێندن، ئەمجا چووە لای مەلا عەلی دۆلکانی، ماوەی سێ ساڵان لەوێ ماوە، چووە (گەلالە) لای مەلا محەممەدی بۆکانی (ڕەئیس)، پێنج ساڵان لەوێ ماوە ساڵی ١٣٨٠ك – ١٩٦٠ز ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (بێژوە) ماوەك مەلا بوو، دەرسی دەداوە، دوایی چووە (سەردەشت) لە مزگەوتی (محمد رسول الله) کرا پێش نوێژ و دەرس بێژ، دوای سێ ساڵ چووە مزگەوتی خانەقا.

دانراوەکانی:

١. گەنجینەی گران مایە دەر شەرحی کیفایە، ی بێتوشی بە فارسی.
٢. باغستانی ڕاستان: بە کوردی.

٣. الإهداء إلى القراء: بە عەرەبی، هەروەها شیعری هەیە.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٢٩٥ – ٢٩٦.

## عبدالرحمان ئیبراهیم بەدرەدین (٦٥٥)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی سنبطی کوڕی قیننۆیە، نازناوی (ئـەبو محەممەد بەدرەدین)ە، ساڵی ٦٤٠ك – ١٢٤٢ز لە (هەولێر) لە دایـك بـووە، لـە هـەموو زانستەکان شارەزا بووە، بە تایبەت لـە ڕەوانبێژی ناوی دەرکردووە، شاعیرێکی چاك بووە، بە مەلیکانی داهەڵگوتووە، کتێبـی (خلاصة الذهب المسبوك المختصر من سير الملوك) –کە دانراوی (ابن الساعي)یە – کورت کردیتەوە، ئیشی بازرگانیشی کردووە، لـە ٧١٧ك – ١٣١٧ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٥/١١٢.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٦٦.

٣. الدرر الكامنة ٢/١٩٥.

٤. أربيل في مختلف العصور ٩٤.

٥. البداية والنهاية ١٤/٩١.

٦. معجم أعلام الكورد ٤١٣.

## عبدالرحمان ئیبراهیم سۆرانی (٦٥٦)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی ئیبراهیمە، لە (دیاربەکر) دابەزیوە، سـاڵی ١٠٢٥ك – ١٦١٦ز لای مەلا چەلەبی جزیری دەستی بە زانستی (صەرف) کرد، لـە ١٠٤٤ك کـرا (مدرس)، تەفسیری سورەتی یاسین و حاشیە لـەسەر حاشیەی عیصـامەدین جـزوی عەممـەی بەیزاوی لـەگەڵ چەند شیعری فارسـی هەیـە، سـاڵی ١٠٦٤ك – ١٦٥٣ز لـە دیاربـەکر کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٢٦٧.
٢. معجم المؤلفين ٥/١١٤.
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٦٦.
٤. خلاصة الأثر ٢/٣٤٥.
٥. معجم أعلام الكورد ٤١٣.
٦. ايضاح المكنون ١/٣٠٨.

## عبدالرحمان ئەبوبەکر تەکیەیی (٦٥٧)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی ئەبوبەکرە، لە سەیدەکانی گوندی (تەکیە)یە، لەگەڵ مەلا عبداللەی خەرپانی (١١٥٩ك - ١٢٥٤ك) هاوچەرخ بووە، پاش تەواوکردنی خوێندنی چووە مزگەوتی باباعەلی لە (سلێمانی) دەستی کرد بە دەرسدانەوە و کاری مەلایەتی، زاتەکی لە خواترس و دوور لە دنیا بوو، چەند کەراماتی لێ دەگێڕنەوە.

سەرچاوە: بنەماڵەی زانیاران ٢١٤.

## عبدالرحمان شێخ ئەبوبەکر هەرشەمی (٦٥٨)

ناوی عبدالرحمانە، ناسراوە بە شێخ ئاوڕەحمان کوڕی شێخ ئەبوبەکری کوڕی مەلا محەممەدی هەرشەمییە، زاتەکی خاوەن زانیاری و ئایین پەروەر بووە، شێخ ئەبوبەکری باوکی دایناوبوو تایبەت دەرسی فەقێیان بدا، خزمەتی هەژاران بکا لە خانەقا، دوا عەمری دیتن و بیستنی نەما، بەڵام زۆر زیرەك بوو، بە پەنجە لە ناو لەپیان دەنووسی تێدەگەیشت، کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی هەبوون:

شێخ ڕوفاعی: نابینا بوو، بەشێکی لە قورئانی پیرۆز لەبەر بوو.

شێخ ئەسعەد: زانایەکی بە دین بوو، بەردەوام خەریکی قورئان خوێندن و خواپەرستی و نوێژ و دەست نوێژ بوو، لە خانەقای باپیری پەروەردە بوو، ماوەکیش بۆ خوێندن چووە گوندی (بنەسراوەی گەورە) لای مەلا ئەحمەدی ئاشۆکانی (باوکی

دایکم)، پاشان لە مزگەوتی شێخ مەلا ڕەشید لە گەڕەکی موستەوفی لە هەولێر کرا پێش نوێژ، ئامۆژگاری خەڵکانیشی دەکرد، کۆچی دوایی کرد، تەنیا یەك کوڕی هەبوو بە ناوی عبدالرحمان ناسرابوو بە (شێخ ثاني): لە ڕۆژهەلاتی نەخۆشخانەی کۆماری مزگەوتێکی بەناوی خۆی دروست کرد، خزمەتی هەژارانی دەکرد، کۆچی دوایی کرد، صائیب و طەیب و جەلال و مظفری هەیە، شێخ طەیب سەرپەرشتی مزگەوتەکە دەکات، خوای گەورە ڕێ نیشاندەری بی بۆ خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

سەرچاوە: دەنگی زانا ٥٢ – ٥٣ / ٢٠٠١ز.

## عبدالرحمان ئەحمەد بڕوجردی (٦٥٩)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەدی کوڕی نەصیرە، خەڵکی (بڕوجردە) لە کۆتایی سنووری کوردستانە لە ڕۆژهەلاتی (کەرمانشا)، دەرسی فەرموودە و شەریعەتی لای شێخ ئەبوئیسحاق لە (بەغدا) خوێند، دوایی کرا (قازی) تا ساڵی ٥٢١ك – ١١٢٧ز لە ژیاندا مابوو، پاش ئەو بەروارە کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٦٧.

## عبدالرحمان ئەحمەد زەوقی (٦٦٠)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەدە، خەڵکی قەلای (زەوقە) سەر بە شاری (بەدلیس) لە تورکیا، ساڵی ١٢٧٧ك – ١٨٦٠ز هاتووتەدنیا دەستی کرد بە خوێندن، ماوەك لە لایەن زانایەکانی ئەو دەوروبەری خوێند لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا چووە (میصر)، لەوێ هەولێدا بەشێکیان لە (ئەزهەر) کردەوە بەناوی: (رواق الأکراد) مامۆستاش لەوێ وەرگیرا، شێخ محەممەد عەبدەی موفتی میصر زۆر خۆشی دەویست، کردیە پێش نوێژ لە مزگەوتی (عەبباسی) سەر بە زانکۆیەکە، ساڵی ١٣٣٥ك – ١٩١٦ز دانرا بە مامۆستای بەشی کوردی، لە جێگای شێخ مصطفای سابلاغی، لە (٨)ی مانگی ذوالقعدە ساڵی ١٣٦٠ك – ١٩٤١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ٤١٤ – ٤١٥.
٢. مشاهير الكورد ٢/٢٠ – ٢١.

## عبدالرحمان ئەحمەد شازەلی (٦٦١)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی عبداللەی کوڕی صادقی کوڕی نیعمةاللەی کوڕی شێخ زەکەریای شازەلی حەسەنیە، زانایەکی بەرز بووە هۆنراوەی (الفرض والسنة)ی بە زمانی فارسی داناوە، لە کوردستانی ئێران کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٦٥.

## عبدالرحمان ئەحمەد طاڵەبانی (٦٦٢)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی مەلا شێخ مەحمودی کوڕی یوسف ئاغایە عەشیرەتی زەنگەنەیە، ساڵی ١٧٩٧ز لە گوندی طاڵەبان ناوچەی چەمچەماڵ هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، لەسەر فەرموودەی ئەو چووە لای شێخ مەعروف نۆدەیی لە (سلێمانی)، ماوەك لەوێ لەگەڵ کاك ئەحمەدی شێخ ولاش فەقێ بوو، برادەرایەتیان بتوون بوو، پاشان چووە (بەغدا) لای مەلا عبدالرحمان ڕۆژبیانی زانستەکانی تەواوکرد، ئیجازەی وەرگرت، ئیجازەی تەریقەتی لە پێشدا لە باوکی وەرگرتبوو، وەئیجازەی تری دووبارە لە شێخ مەعروفی کۆسە وەرگرت.

شێخ عبدالرحمان عەرەبی و فارسی و تورکی بە ڕەوانی دەزانی، شیعری بە هەر سێ زمان هەیە، نازناوی (خالص)ە، پاشان طاڵەبانی بەجێهێشت، شێخ محەممەد عارفی برای لە جێی خۆی دانا، خۆی لە (کەرکوك) نیشتەجێ بوو، لە تەك مەرقەدەکەی باوکی تەکیەی دروست کرد.

برایەکانی دابەش کردن هەریەك بۆ شوێنەك: (شێخ عبدالکریم) بۆ قەرەحەسەن، (شێخ عبدالفتاح) بۆ گوندی خضربەگ، (شێخ محیەدین) بۆ خانەقین، (شێخ عبدالغفور) بۆ کۆیە، (شێخ عبدالعزیز) بۆ قادرکەرەم، (شێخ حوسێن) بۆ باراوە، (شێخ محەممەد صاڵح)

بۆ جامع الهنود لە کەرکوك، (شێخ عبدالقادر) بۆ ڕەمادی، ئەوانە هەموو تەکیەیان هەبوو، خۆشی سەرپەرشتی تەکیەکەی (کەرکوکی) دەکرد، چەندان کورد و عەرەب و فارس و تورك دەهاتنە لای میوانداری و خزمەتی دەکردن لە ڕاهی خوا.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٨٦٠ز کۆچی دوایی کرد، لە تەك باوك و باپیرانی بە خاك سپێردرا، سەید عبدالرحیمی مەولەوی سەردولکەیێکی هۆنراوەی کوردی پێدا هەڵگوتیە، دەڵێ:

دڵ پەی تەئریخ وات، وەدەم دەردەوە

(ئای وای و وەی، دنیاش تاریك کەردەوە)

نیوەدێڕی دووەم بە ژمارەی ئەبجەدی مێژووی کۆچی دوایق، کە ١٢٧٧ کۆچی یە.

دانراوەکانی:

١. تەرجومەی (بهجة الأسرار) لە عەربی بۆ تورکی لە مەتحی شێخ عبدالقادری گەیلانی.
٢. شەرحی مەسنەوی مەولانا جەلالەددینی ڕۆمی.
٣. جذبة العشق: بە سێ زمان عەرەبی و فارسی و تورکی، ساڵی١٩٣١ز لە (ئەستەمبۆڵ) چاپ کرا، ساڵی ١٩٤٧ز دووبارە لە (تاران) چاپ کراوە.

کوڕەکانی:

١. شێخ عەلی: لە مەودوا بە تایبەت باسی دەکەین.
٢. شێخ عبدالقادر: شاعیر بوو، نازناوی (فائیز) بوو.
٣. حەسەن: لە منداڵییەوە کۆچی دوایی کرد.
٤. شێخ عبدالواحد: لە (کەرکوك) کۆچی دوایی کرد.
٥. شێخ ڕەزا: لە پێشدا باسمان کرد.

### عبدالرحمان ئەحمەد ماردینی (٦٦٣)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی یوسفە، خەڵکی شاری (ماردین)ە مەزهەبی شافیعی بووە، لە شاری (ئەسیوط) دابەزیوە، هەرچەند نابینا بووە، بەڵام قورئانی پیرۆزی هەموو لەبەر بووە، لەگەڵ موختەصەڕی تەبریزی و کافییەی نەحو، شاعیرەکی چاك بووە، ساڵی ٨٨١ك – ١٤٧٦ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الضوء اللامع ٤/٥٦.

### عبدالرحمان ئەفەندی کوردخواجە (٦٦٤)

مامۆستا عبدالرحمان، ناسراوە بە (کوردخواجە) واتە: مامۆستای کورد، لە سەیدەکانی بەرزنجەیە، لە شاری (خەرتەبیرت) لە کوردستانی تورکیا دانیشتووە، یەك بووە لە زانایە مەزنەکانی سەردەمی خۆی، دوای ساڵی ١٢٧٠ك – ١٨٥٣ز لە (ئەستەمبۆڵ) کۆچی دوایی کردووە، مصطەفا تەوفیق ئەفەندی کوڕی یەك بووە لە پیاوەماقوڵانی چەرخی خۆی.

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الکورد ٢٦٢.
٢. معجم أعلام الکورد ٤٠٨.

### عبدالرحمان ئوەیس شارەزوری (٦٦٥)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی ئووەیسە، خەڵکی (شارەزور)ە، زانایەکی بە دین و دڵپاك و چاکەخواز بووە، لە (دیمشق) دابەزیوە، دەرسی بە کوڕەکانی حەسەن پاشای سەنان پاشای وەزیر دەگۆت، سەفەری حەج و وڵاتی میصری کرد، دوا ژیانی قورئانی پیرۆزی لەبەر کرد، لە سەردەمی خۆی ناوبانگی مەلا چاکی و ئایین پەروەری ڕۆیشت بوو، ساڵی ١٠٦٣ك – ١٦٥٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. تاریخ مشاهیر کورد ١/١٩٨.

٢. مشاهير الكورد ٢/٥.

٣. معجم أعلام الكورد ٤١٥.

## عبدالرحمان بلال صەفار ( ٦٦٦ )

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی بیلالی کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالجلیلە، باوکی سفر فرۆش بووە، بۆیە ناوبراوە بە: (صەففار)، لە (هەولێر) لە دایك بووە، هەر لەوێ پەروەردە بووە، بۆ خوێندنی فەرموودە چوویتە خوراسان و بوخارا، هەر لەوێ ساڵی ٥٩٨ك – ١٢٠١ز حەدیسەکانی کتێبی (المهذب)ی نووسیەوە، مامۆستا لە شەریعەت بە توانا بوو، بۆیە کە گەڕاوە (هەولێر) کرا (قازی)، لەوێ کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تاريخ أربيل ١/٣٧٨.

## عبدالرحمان جەعفەر کوردی ( ٦٦٧ )

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی جەعفەرە، مەزهەبی شافیعی بووە، ساڵی ١١٠٠ك – ١٦٨٨ز لە یەك لە گوندەکانی سەر بە (ئەرزەڕۆم) هاتووتەدنیا، زانایەکی بە بەهرە و بە دین و دنیا نەویست بووە، دەستی کرد بە خوێندن، لە وڵاتی خۆی قۆناغی سوختەیی تەواوکرد، چووە (حەلەب) لەوێ چووە (میصر) چووە (حیجاز) گەڕاوە (دیمشق)، ساڵی ١١٥٦ك خەریکی دەرسدانەوە بوو، چەند پەراوێزی لەسەر کتێبانی شەریعەت و ڕێزمانی عەرەبی هەنە، زاتەکی بێ تەماع بوو، شتیان پێ بەخشیبا، دەیگۆت: بە کەسێك بدەن کە لە من پێویست تر بی، ناوی خودای گەورە هاتبا هەموو ئەندامی دەلەرزی، کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی دەزانی، ساڵی ١١٧٢ك – ١٧٥٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. سلك الدرر ٢/٢٩١ – ٢٩٢.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٦٧ – ٢٦٨.

## عبدالرحمان جەلالەدین شارەزوری (٦٦٨)

ناوی عبدالرحمانە، نازناوی جەلالەدینە، خەڵکی شارەزورە، زانایەکی شەرع زان بووە، لە قوتابخانەکەی جێگای باوکی لە (موصل) دەرسی داوە، ساڵی ٥٦٦ك – ١١٧٠ز لە تەمەنی گەنجی دا، جوانەمەرگ بووە.

سەرچاوە: طبقات الشافعية/ ئەسنەوی ٢/١٠١.

## عبدالرحمان حەسەن بانەیی (٦٦٩)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی مەلا حەسەنی کوڕی موسای کوڕی عبداللهیە، مەزهەبی شافیعی بووە، تەریقەتی خەلوەتی بووە، ناسرابوو بە (ئەبولحەسەن وەجیهەدین نورەدینی)، ساڵی ١١٣٢ك – ١٧١٩ز هاتووتەدنیا.

دەستی کرد بە خوێندن، لە خزمەت باوکیدا چووە (حەلەب) لای مصطفای کەمالەدینی صدیقی خوێند، هەر لە خزمەت ئەو چووە (دیمشق)، کە ساڵی ١١٤٨ك – ١٧٣٥ز باوکی کۆچی دوایی کرد، هەرچەندە مەلا عبدالرحمان لەو کاتە گەنج بوو، خوێندنی تەواو نەکردبوو، بەڵام فەقێیەکانی باوکی کۆبوونەوە، لە جێی باوکیان دانا، کە دەستی کرد بە دەرسدانەوە، تاقی یانکردەوە، هەروەکو باوکی شارەزا بوو لە هەموو وانەکان، مامۆستا زانایەکی لە خواترس و خواپەرست بووە، کەراماتی لێ دەگێڕنەوە، شەوی دووشەمەی دووی مانگی صەفەری ساڵی ١١٩٥ك – ١٧٨١ز کۆچی دوایی کرد، لەو گۆڕەی کە خۆی لە پێشدا لە خانەقایەکەی بۆ خۆی لێدابوو، بە خاك سپێردرا.

دانراوەکانی: (شرح الرسالة الرسلانية) و (شرح الصلوات المحيوية) و (شرح على التدبيرات الآلهية) و (شرح الإنسان الكامل).

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/١٧٣ – ١٧٥.
٢. مشاهير الكورد ٢/١٩.
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٦٩ – ٢٧٠.

٤. هدية العارفين ٥/٥٥٥.

٥. معجم المؤلفين ٥/١٣٥.

٦. معجم أعلام الكورد ٤١٥ – ٤١٦.

## عبدالرحمان حەسەن شازەلی (٦٧٠)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی حەسەنی کوڕی سولەیمانی کوڕی خالیدی کوڕی حەسەنی کوڕی شێخ ئەبولحەسەنی شازەلییە، لە دەوری ساڵی ٧٠٠ك – ١٣٠٠ز لە گوندی (کاکۆزەکەریا) هاتووتەدنیا، لە خانەوادەکی ئایین پەروەر پەروەردە بووە، خوێندوویەتی تا پلەی بەرزی لە زانستی زاهیر و پاکسازی دەروونی بە چەنگ هیناوە، چەند کەراماتی لێ دەگێڕنەوە، کتێبی (حزب البحر)ی باپیرە گەورەی زۆر دەخوێندەوە، چەندان جولەکە و دیان لەسەر دەستی ئەو ئیسلام بوون.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٦٤ – ٢٦٥.

٢. بنەماڵەی زانیاران ٩٣ – ٩٤.

## عبدالرحمان حەسەن کوردی (٦٧١)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی حەسەنە، نازناوی زەینەددینە، ناسراوە بە: ئەبوهورەیرەی کوڕی قەساب، مەزهەبی شافیعی بووە، لە (حەلەب) دانیشتووە، هەر لەوێ دەرسی داوە، ساڵی ٩٤٢ك – ١٥٣٥ز لە حەلەب کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٨/٢٤٨.

٢. مشاهير الكورد ٢٦٩.

٣. معجم أعلام الكورد ٤١٦.

## عبدالرحمان حوسێن ڕۆژبیانی (٦٧٢)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی حوسێن بەگە، عەشیرەتی ڕۆژبیانییە، خەڵکی گوندی فورقانە ناحیەی قەرەحەسەن لە ڕۆژهەڵاتی (کەرکوك)، زانایەکی بەرز بووە، لە زانستەکان شارەزا و پسپۆر بووە، مامۆستای مەلایە چاکەکانی کوردستان و بەغدا بووە، تەریقەتی نەقشبەندی لە مەولانا خالیدی شارەزووری وەرگرت، لە لایەن شێخ کرا خەلیفە لە (بەغدا).

مامۆستای ڕۆژبیانی ماوەك لە (تەکیەی خالیدیە) لە (بەغدا) دەرسی دەداوە، پاشان چووە مزگەوتی (ئەحمەدیە) لە مەیدان هەر لە شاری (بەغدا).

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا محەممەدی یایی (کە مامۆستای مەلا عەلی قزلجی یە) و مەلا محەممەدی خەتێ (کە مەلای پاشای ڕواندزە).

دانراوەکانی: حاشیە لەسەر (إثبات الواجب)ی جەلالەدینی دەووانی و حاشیە لەسەر شەرحی (حكمة العين).

کۆچی دوایی: ساڵی ١٢٧٠ك – ١٨٥٣ز کۆچی دوایی کرد.

دوو کوڕی مەلای هەبوون:

١. مەلا محەممەد: لە مزگەوتی (ئەحمەدیە) جێگری باوکی بوو.

٢. مەلا ئەحمەد: زانایەکی بەرز بوو.

بە بۆنەی کۆچی دوایی مامۆستای ڕۆژبیانی، شاعیری بەناوبانگ عبدالباقی عومەری – عەرەب– ئەو دێڕە شیعرانەی نووسیوە:

قد قضى عُمره بزهد وتقوى — وصلات مشفوعة بصلات
بنان البيان في البحث كم قد — حل للطالبين من مشكلات
وبقطر العراق محسور فضل — مثله لا أتى ولا هو آت
وبعده أضحت المدارس حتى — من حلى كل فاضل عاطلات
رجعت مطمئنة منه نفس — وتسامت لارفع الدرجات

وترقى بسلم العلم: ارخ {شأن عبدالرحمن للجنات} ١٢٧٠هـ

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ٩٤.

٢. یادی مەردان ١/١٢٠ – ١٢١.

٣. ژیناوەری زانایانی کورد ٦٧٢ – ٦٧٣.

٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٧٢ – ٢٧٤ – ٥١٣.

٥. تأريخ مشاهير كورد ١/٣٩٩ – ٤٠٠.

## عبدالرحمان حوسێن کوردی (٦٧٣)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی حوسێنی کوڕی ئیبراهیم زەینەدینی کوردی یە، لە ١٧ی مانگی ذي‌القعدەی ساڵی ٨٠٨ك – ١٤٠٦ز هاتووتەدنیا، ساڵی ٨٣٥ك – ١٤٣١ز چووە (قاهیرە)، ماوەك لە لای زانایەکانی وێندەری خوێند، پاشان سەفەری کرد بۆ (ئەسکەندەرییە) و (دیمیاط)، زۆرجاران چووە حەج و زیارەتی مەدینەی پیرۆز، چەند دانراوی هەنە، لە ڕۆژی هەینی ١٨ی مانگی مەولودی ساڵی ٨٨٣ك – ١٤٧٨ز کۆچی دوایی کرد، لە (جامع الازهر) نوێژیان لەسەر کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ٤١٦.

٢. الضوء اللامع ٤/٦٨.

٣. مشاهير الكورد ٢/٤.

## عبدالرحمان حوسێن مصطەفا (٦٧٤)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی حوسێنی کوڕی مصطەفایە، یەکە لە زانایەکانی صەدەی دوازدە و سێزدەی کۆچی یە، لە شاری (سعێرت) موفتی بووە، شیعری عەرەبی هەیە.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٢٦٧ – ٢٦٨.

٢. معجم أعلام الكورد ٤١٦.

## عبدالرحمان حەمەد دوونی (٦٧٥)

ناوی عبدالرحمانە، نازناوی ئەبومحەممەدە، کوڕی حەمەدی کوڕی حەسەنی کوڕی عبدالرحمانی صۆفیيە، خەڵکی گوندی (دوونە) سەر بە (دینەوەر) ساڵی ٤٢٧ك – ١٠٣٥ز هاتووتەدنیا، زانایەکی فەرموودەناس بووە، کتێبی (سنن النسائي) لە ئەحمەد حوسێن کەسار گێڕایتەوە، عەلی ئەحمەد یەزدی لەوی وەرگرتووە، مامۆستا عیزەدین ئیبن ئەثیر دەڵێ: {منیش ئەو کتێبەم لەو ڕێگایە بیستووە}.

سەرچاوە: اللباب ١/٥١٧.

## عبدالرحمان خضر بەگزادە (٦٧٦)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی خضری کوڕی وەسمانە، بەرەبابی (بەگزادە)یە، ساڵی ١٨٧٦ز لە گوندی (سێکانی) سەر بە (طەق طەق) هاتووتەدنیا، لە گوندی (ئاومار) لای مەلا سولەیمان دەستی کرد بە خوێندن، دوای قۆناغی سوختەیی چووە (سێگردکان) لای مەلا محەممەدئەمین، دوایی چووە (ماجید) لای مەلا عوسمان، ماوەکیش چووە لای مەلا عبداللەی گڕاوی، پاشان چووە (کەرکوك) لای مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی، ئەمجارە هاتە (هەولێر) لە خزمەت شێخ مصطەفای نەقشبەندی ماوە، تا ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی لە (سێکان) و (ئۆمەرگومبەت) و (قەرەسالم) کردووە، مەلا طاهیری سوسەیی و مەلا طاهیری نۆغەرانی و مەلا شێخ مەعروفی جلبەسەر و مەلا شێخ صەدیق و مەلا عبداللە حوسێن، فەقێی ئەو زاتەنە.

مامۆستا لە قسەکردن زمانی قورس بووە بەڵام لە دەرسدانەوە و ووتار خوێندنەوە قسەی بۆ دەهات، لە مەنتیق و فەرائیز زۆر شارەزا بوو، ساڵی ١٩٣١ز کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. دەستنوسی مەلا ئەنوەر سعاتچی.

٢. النجم الزاهر ٦٨.

## عبدالرحمان خضر ژەنگاری (٦٧٧)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی خضری کوڕی عبدالرحمانی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی یونسی کوڕی عوسمانی ژەنگاری یە، چوویتە (حەلەب) کرایتە نووسەری خەلیفە، شاعیر و ڕۆشنبیر بووە، ساڵی ٧٤٤ك – ١٣٤٣ز لە حەلەب کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الدرر الکامنة ٢/٣٢٨.

## عبدالرحمان ڕەسول گراوی (٦٧٨)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی مەلا ڕەسولی کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا ڕەسولی کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی مەلا صالحی کوڕی مەلا یوسفی کوڕی مەلا عومەرە، خەڵکی گوندی (گراو)ە، لە ڕۆژهەڵاتی چیای (پیرمەم)، ساڵی ١٣٠٦ك – ١٨٨٨ز لە گەڕەکی (تۆپخانە)ی قەڵاتی هەولێر چاوی خۆی هەڵیناوە لە دنیا.

ساڵی ١٨٩٥ز دەستی کرد بە خوێندن لە لای مەلا سەلیم لە قوتابخانەی ئەحمەدیە لە قەڵات دوایی حەوت ساڵان لە لای مەلا سولەیمانی خوێند، ئەمجا چووە (ڕواندز) لای مەلا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی، دوایی گەڕاوە (گراو) لای مەلا عبداللە، دوایی گەڕاوە (هەولێر) لای مەلا ڕەشید لە قەڵات دوایی چووە (خانەقا) لای مەلا ئەحمەد زەلام، دوایی چووە (تەرجان) لای مەلا حوسێن توحفە و فەرائیزی خوێند، گەڕاوە هەولێر قوتابخانەی (ئەحمەدیە) ساڵی ١٩٣٦ز چووە (کەرکوك) لەوێ لە ٢٤/٦/١٩٣٦ز ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: گەڕاوە (هەولێر) لە قوتابخانەی (ئەحمەدیە) کرا (مدرس)، ساڵی ١٩٤١ز گەڕاوە (کەرکوك) تەریقەتی قادری لە شێخ جەمیلی شێخ عەلی طالەبانی وەرگرت، کرا خەلیفە، گەڕاوە هەولێر، ساڵی ١٩٥٥ز لە لایەن شارەوانی هەولێر قوتابخانەکەی ڕوخاندرا و تانکی ئاوی دابەشکردنی شارەکەی لێ دامەزرا، مامۆستا و فەقێیەکانیش بەلاوبوون، ساڵی ١٩٦٠ز کرا مامۆستای پەیمانگای ئاینی لە هەولێر، لە ١٩/٨/١٩٨٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: أربيل في مختلف العصور ١٣٣.

## عبدالرحمان سولەیمان حەڕانی (٦٧٩)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی سولەیمانی کوڕی عبدالعزیزی کوڕی مولەجلەجی حەڕانی یە، دەرسی لە لای مامۆستا ئیبن تەیمیە خوێندووە، چوویتە شاری (بەغدا)، لە فەرمودە و شەریعەت و ڕێزمانی عەرەبی شارەزا بووە، یەکەمین زانای مەزهەبی ئیمامی ئەحمەد بووە لە سەردەمی خۆی، لە سەرەتای ساڵی ٧٠٠ك – ١٣٠٠ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٢/٢٠٠.

## عبدالرحمان سیسێری (٦٨٠)

مامۆستا مەلا عبدالرحمان ساڵی ١٣٣٧ك – ١٩١٨ز لە گوندی (سیسێر)ی سەر بە شاری (سەردەشت)ی ئێران هاتووتەدنیا، لە لای سەید حوسێنی مەلای گوندەکە دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە لای قازی عەلی، پاشان لە خزمەت مامۆستا چووە (سەردەشت) لەوێ ماوە، تا گەیشتە کتێبی (جامی) دوایی چووە (بیارە) لای مامۆستا عبدالکریم (مدرس)، دوایی چووە لای شێخ باباعەلی لە سلێمانی، لەوێ ڕۆیشت بۆ (پێنجوین) لای مەلا عارف، گەڕاوە (مەریوان) لای مەلا مەحمودی جەوانڕۆیی، پاشان چووە (بالك) لای مامۆستا باقر، چووە (موکریان) لای مەلا عەلی وەلزی، لە حەمامیانی بۆکان، لەوێ (تشريح الأفلاك) و (ربع) و (ئوسطرلاب)ی بە دەستی خۆی نووسیەوە، دوایی چووە خانەقای بورهان لای مەلا شێخ محەممەد، ساڵی ١٩٤٤ز ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: کۆتایی بە خوێندن هینا، بووە مەلا لە گوندی (سوغانلو)ی (پیرانشار)، دوایی چووە (ئاتابلوغ) و (بێکوس) لە ناوچەی (سابلاغ)، لە گوندەکانی (سیسێر) و (ڕەبەت) و (قەلەڕەشێ) و (دۆلەتوو) و (وەلێ) و (زمزیران) مەلا بوو.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا ئیبراهیم ئیسماعیل زادە، مەلا خدری سارتکەی، مەلا حەسەنی نستانی، مەلا خەلیلی فیدایی، مەلا ڕەحیمی شەریف پور، مەلا ئەحمەدی گەنمانی،

مەلا حەسەنی گولەی، مەلا شەفیعی بێژەوی، مەلا ئەحمەدی دافیعی، مەلا ئیسماعیل شەمسەدینی، مەلا سەعید کامەمی، مەلا محەممەدی عەزیزی، مەلا ساحێب یوسفی، مەلا ئەحمەدی پیرانشاری، مەلا حوسێنی فیردەوسی، مەلا شەفیعی کوڕی خۆی.

مامۆستا لە مزگەوتی سەرچاوەی (سەردەشت) خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بوو، تا پەکی کەوت، لە ئەنجاما کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٣٠٥ – ٣٠٧.

## عبدالرحمان عبدالله جەلی (٦٨١)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی مەلا عبداللەی کاکی جەلی کوڕی مەلا محەممەدی شیوانشانی مەلا زادەی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی مەلا حەسەنی کوڕی مەلا ئیبراهیمی کوڕی مەلا حەسەنی کوڕی مەلا ئەبوبەکرە.

مێژووی لە دایکبوونی: جەنابی مەلا گەورەی کۆیە لە پێشەکی کتێبی (المصقول) دەڵێ: {دەربارەی مێژووی لە دایکبوونی باپیرە گەورەم هیچ زانیاریەکم بە دەستەوە نیە}، هەروەها مامۆستا عبدالکریم (مدرس) بە تەخمین دەوروبەری ساڵی ١١٤٠ك بۆ داناوە، بەڵام ئێمە لەگەڵ کاکم مەلا طەیب چاوەکماندا کتێبە دەستنووسەکانی خۆمان، لەوانە دیتمان کتێبی (خادم)ی بەلاغە دانراوی مامۆستا عبدالرحمان جەلی یە، لە کۆتایی دا دەڵێ: { تەواوم کرد لە ساڵی ١١٨٦ك – ١٧٧٢ز} هەروەها لە پەراوێزەکدا لەو کتێبە خۆی نووسیێتی تەواوم کرد لەو کاتە، تەمەنم (٣١) یا (٣٢) ساڵ بوو، کەواتە بەڵگەی ڕاستمان بە دەست کەوت، کە مامۆستا ساڵی ١١٥٤ك یا ساڵی ١١٥٥ك بەرانبەر بە ساڵانی ١٧٤١ز – ١٧٤٢ز لە دایك بووە.

خووڕەوشتی: زاتەکی دڵپاك و بە دین بووە، یەك بووە لە مەلایە ناودارەکانی چەرخی خۆی، ڕێزی خەڵکانی دەگرت و خەڵکان حورمەتیان دەگرت، یەکەم جار لە قوتابخانەی (جەل) نزیك چیای (ئاوەگەرد) دەرسی فەقێیانی دەداوە، پاشان عبدالرحمان پاشای بابان، مزگەوت و قوتابخانەی لە (کۆیە) دروست کرد، فەرمانی گواستنەوەی

مامۆستای دا، لە (جەل) بۆ (کۆیە) مەولانا خالید حەزی دەکرد لە لای بخوێنێت، هاتە لای بۆ جێگرتن، بەڵام مامۆستا نەخۆش بوو دوا عەمری بوو نەیتوانی وەری بگرێت، بۆیە چووە لای مەلا محەممەد ئیبن ئادەم بالەکی.

کۆچی دوایی: بەردەوام بوو لەسەر خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، تا ساڵی ١٨٠٢ز لە شاری (کۆیە) کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی:

١. نامیلکەی (إثبات الواجب).
٢. نامیلکەی (مەشادە) باسی داسنیەکانە نۆ لاپەڕەیە.
٣. خادم: شەرحی فەریدەی سەمەرقەندییە لە زانستی (بەیان)، دانەکی دەستووسی ئیبراهیم ناوێك لە لای ئێمە هەیە.
٤. تحفة الطلاب بشرح خلاصة الحساب: دانەکی لە لای ئێمە هەیە، دەستنووسی مامم مەلا عبدالقادرە، ساڵی ١٩٦٧ز نووسیتیەوە.

وە هەروەها حاشیەی هەیە لەسەر: (تەفسیری بەیزاوی) و (توحفە) و (عبدالله یەزدی) و (کەمال) و (جەلالی مەنتیق) و (شەرحی عەقائیدی سەعد) و (مطول) و (مختصر) و (جمع الجوامع) و (مختصر المنتهی) و (شەرحی ئەربەعین) و (شەرحی هەمزیە) و (شەرحی چەغمینی) و (جامی).

سەرچاوەکان:

١. المصقول /٥ .
٢. علماء ومدارس في أربيل /٥٩.
٣. محمد بن عبدالله جلي ٨٥ – ٨٨.
٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٦٨ – ٢٦٩.
٥. بنەماڵەی زانیاران ٥٥٦ – ٥٥٧.
٦. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/٣٩٠ – ٣٩٢ /٥/٢٦٨

## عبدالرحمان عبدالله ڕەشانی (٦٨٢)

ناوی عبداالرەحمانە، کوڕی فەقێ عبداللّەی خەڵکی گوندی (ڕەشانی) سەر بە پێنجوێنە، دەوری ساڵی ١٢٨٠ك - ١٨٦٣ز هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوای چووە (پێنچوێن) لای ماموستا عبدالرحمان، ماوە لەوێ تا کۆتایی بەخوێند هێنا، بووە مەلا لە (کانی میران) ناوچەی (مەریوان) دەرسی فەقێیانی دەدا، دوای چووە گوندی (بەئێلە)، پاشان چووە گوندی (سەلەس)، لەوێ ماوە، تاساڵی ١٣٣٤ك - ١٩١٥زکۆچی دوایی کرد.

دوو کوڕی هەبون:

١. محمەد سەعید: لەسلێمانی و نێرگسەجاری خوێند، لەشوێنی باوکی بووە مەلا دوایی باری کردبۆ (قەلعە)، چووە سەفەری حەج، گەڕاوە کوردستان، کۆچی دوای کرد، مەلا زاهیدی کوڕی جێگری بوو.

٢. عەلی: لە (بیارە)ی دەخوێند، پاشان کۆچی دوای کرد.

سەرچاوە: علماؤنا فی خدمة العلم والدین ٢٨١-٢٨٣

## عبدالرحمان عبدالله گەناوی (٦٨٣)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی مەلا عبداللّەی کوڕی مەلا عبدالرحمانە، خەڵکی گەناوی سەر بە قەڵادزێ یە، ساڵی ١٩٣٨ز لە گوندی (گەرمکان) هاتەووتەدنیا.

خوێندنی: ساڵی ١٩٤٥ز لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (قەڵادزێ) لای مەلا محەممەدی باڵەیی، ماوەکیش لە لای مەلا ئەبوبەکری بۆسکێنی و مەلا عوسمانی ڕۆستێ ماوە، گەڕاوە لای مەلا محەممەدی باڵەیی، ماوە لەوێ تا کۆتایی بە خوێندن هینا و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن لە مزگەوتی گەورەی چوارقوڕنە، دوایی چووە مزگەوتی گەورەی (پێنجوێن)، پاشان چووە مزگەوتی منارە لە (کۆیە)، دوایی هاتە

(هەولێر) بە پێش نوێژ و وتارخوێن لە مزگەوتی عومەری کوڕی خەططاب (خوا لێی رازی بی)، لە گەڕەکی حەوتی نیسانی ئەو سەردەمی.

کۆچی دوایی: پاش ئەنجام دانی نوێژی بەیانی لە مزگەوتەکەی خۆی لە ٦/١٢/١٩٩٤ز شەهیدکرا، ئەوکاتە باری ناوخۆی کوردستان زۆر ئالۆز بوو، کورتەیەك بەلاغە و ئوصولێ دەست نووسی هەیە.

سەرچاوە: ژیاننامەی زانایە ئاینیە کۆچ کردووەکان ٤٩٤ – ٤٩٨.

## عبدالرحمان عبدالحلیم بن تەیمییە (٦٨٤)

ناوی عبدارەحمانە، کوڕی عبدالحلیمی کوڕی عبدالسلامی (بن تەیمییە)یە، ساڵی ٦٦٣ك – ١٢٦٤ز لە (حەڕان) هاتووتەدنیا، دەرسی لەلای مامۆستا قاسمی هەولێری و هەشتاو شەش زانای تر خوێندووە، لە (ئەسکەندەریە) و لە (دیمشق) دانیشتووە ناسراوە بە زاتەکی دەروون پاك و بە دین و لە خواترس و چاك، خەریکی خواپەرستی و قورئان خوێندن بووە لە ٧٤٧ك – ١٣٤٦ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٢/٢٠٠.
٢. معجم أعلام الكورد ٤١٧.
٣. شذرات الذهب ٦/١٥٢.
٤. البداية والنهاية ١٤/٢٣٠.

## عبدالرحمان عبدالغفور طاهیری (٦٨٥)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی مەلا عبدالغفوری، ناسراو بە حاجی مامۆستایە، ساڵی ١٣٥٤ك – ١٩٢٦ز لە گوندی (باغلوجە) چاوی خۆی هەڵێناوە لە دنیا، دەستی کرد بە خوێندن لە چەند حوجرەکانی دەوروبەری (سەقز) گەڕا، ساڵی ١٣٦١ك چووە (تورجان) لای مەلا عبدالحمید، لە ١٣٦٥ك چووە (گردیگلان) لای مەلا عبداللهی

ستویی، پاش ماوەك چووە (حەمامیان) لای مەلا عەلی ڕەبانی، لەوێوە چووە (شێخلەر) لای مەلا حەسەنی شێخێ، گەڕاوە (تورجان) لەوێ ئیجازەی وەرگرت.

ساڵی ١٣٦٩ك کرا پێش نوێژ و دەرس بێژ لە (باغلوجە)، ساڵی ١٣٧٤ك چووە (مەرخوز) خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بوو، تا ساڵی ١٤٠٧ك – ١٩٨٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تاریخ مشاهیر کورد ٢/٥٢٧ – ٥٢٨.

## عبدالرحمان عبدالكريم بابه شێخ (٦٨٦)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی عبدالکریمی زەنبیلی، کوڕی سەید عبدالرحمانی، کوڕی سەید محەممەدە، ساڵی ١٨٨٤ز هاتووتەدنیا.

دەستی بە خوێندن کرد، ماوەك لەلای مەلا حەسەنی وەجدی (قزلجی) بوو، دوایی چووە لای مەلا صالحی سەردارئاباد، پاشان چووە لای مەلا عبداللەی وەلزێ، دوایی چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادر، ماوە لەوێ تا کۆتایی بە خوێندن هێنا، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مامۆستا زانیاری لە ڕیازیات و فەلەك بەهێز بوو، لە جەنگی دژی حکومەتی ڕوسیا سەرلەشکری هێزی ئیسلامی کوردستان بوو.

دانراوەکانی: (تەنقیدی هەیئەتی جەدید) و (تعدیل الاعداد) و (الارفاق في علم الحروف والاوفاق) و (چەند حاشیە لەسەر ئیبن حەجەر).

ساڵی ١٩٦٠ز لە گوندی (تورجان) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تاریخ فرهنگ وادب مکریان ٣٢٤ – ٣٢٦.

## عبدالرحمان عبدالكريم داربەڕولەیی (٦٨٧)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی عبدالکریمی کوڕی حەمەسوورە، ساڵی ١٩١٤ز لە گوندی (داربەڕولە)ی سەر بە (عەربەت) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لای مەلا عبداللهی مەلای گوندەکە دەستی کرد بە خوێنـدن، قورئـانی پـیرۆز و کتێبـە سـەرەتاییەکان و چـەند نامیلکـەی فارسـی تـەواوکردن، چـووە گونـدی (وێلدەر) لای مەلا ڕەحیمی پەلخی، دوایی چووە (کانی گۆمـە) لای مـەلا عـەلی، سـاڵی ١٩٢٨ز چووە مزگەوتی خوخانەی (سـلێمانی) سـاڵی ١٩٣٠ز بەشـداری ڕاپەڕینەکـەی (٦/٩) کرد دژ بە ئینگلیز، پاشان چووە (گەلالـە)ی (پشدەر) لای مـەلا محەممـەد، دوایـی چووە (ماوەت)، ئەمجارە بۆ (قەڵادزێ) لای مەلا محەممەدی گەورە، دوایـی چـووە گونـدی (بێوران)ی ئێران لای مەلا محەممەدی مریدی شێخ عومەری بیارە، لـەوێ چـووە (زێـوە)ی (سەردەشت) لای مەلا صەدیقی جامی، گەڕاوە (خورماڵ) لای مەلا سەید عـارف، چـووە (بیارە) لای مەلا صاحیب، چووە (نێرگسەجاڕ) لای مەلا شێخ وەهاب، چووە (کۆکـۆیی) لای مەلا محەممـەدی عەبابـەیلێ، چـووە (سەرچـاوە)، گـەڕاوە بـۆ (سـلێمانی) لای مـەلا عینایەت، لەوێ کۆتایی بە خوێندن هینا ،ئیجـازەی مەلایـەتی وەرگـرت، سـاڵی ١٩٤٢ز لەلای مامۆستا عینایەت وە لای مەلا عبداللهی چورستانی.

مەلایەتی: کرا پێش نوێژ و دەرس بێژ، لە مزگەوتی حوسێن قازی لـە (سـلێمانی) کاروباری مەلایەتی و ئامۆژگاری خەڵکانی دەکرد.

بەشـێك لــە فەقێیــەکانی: شـێخ خالیـدی مـوفتی، شـێخ نـورەدینی بـرای، مـەلا محەممەدئەمین بامۆکی، مەلا محەممەدی شاسواری، مەلا عبـداللهی هـەجیجی، شـێخ عوسمـانی نێرگسەجاڕی، مەلا عەلی قەرەداغی، مەلا عبدالله کۆشـکی، مـەلا عومـەر نیزامـی، مـەلا صالح کانی چناری، مەلا عبداللهی پەرخی، مەلا عەلی سەردەشتی، مەلا مەعروف سـنەیی، مەلا شێخ کەریم، مەلا صالح سەنگاوی.

بەشێك لەوانەی ئیجازەی پێداون: مەلا فازیلی مەلا ئەحمـەد، مـەلا شـێخ ئەحمـەد کەسنەزانی، شێخ عیصام قەرەداغی، مەلا عبدالله شوکر، مـەلا عبـدالرحمان کـەریم، مـەلا سەعید هەمزە، مەلا نەجمەدین وادی، شێخ موحسین شێخ محەممەد، شـێخ عـەزیز پـارەزانی،

مەلا عبداللەی سەردەشت، مەلا عبداللەی سەقز، مـەلا ئەحمـەدی بانـەیی، شـێخ عەلائـەدین سەنگاوی، مەلا صالّحی قەرەداغی.

مامۆستا چـوارجار سـەفەری حـەجی کـردووە، سـالّی ١٩٩١ز کـرا سـەرۆکی لیژنەی فەتوا لـە سلێمانی.

سەرچاوە: پەیامی زانایان، ژمارە ٨ / ٢٠٠٥ز.

## عبدالرحمان عبدالكريم ديابەكری (٦٨٨)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی عبدالکریمە خەڵکی (دیاربەکر)ە، مەزهەبی حەنەفی بووە لە (قوسطەنطینییە) دابەزیوە، لەوێ سالّی ١١٩٠ك – ١٧٧٦ز کۆچی دوایی کردووە.

دانراوەکانی: (شرح السراجية في الفرائض) و (شرح الولدية في المنطق).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٥/١٤٦.

٢. إيضاح المكنون ٢/٧١٥.

٣. هدية العارفين ١/٥٥٣.

٤. معجم أعلام الكورد ٤١٧.

## عبدالرحمان شێخ عوسمان تەوێڵەیی (٦٨٩)

نـاوی عبدالرحمانـە، کـوڕی سـیراجەدین شـێخ عوسمـانی (تەوێڵە)یـە، نازنـاوی ئەبولوەفایـە، لـــە (٥)ی مـانگی (محـرم)ی سـالّی ١٢٥٣ك – ١٨٣٧ز لـــە (بیـارە) هاتووتەدنیا.

لە بنەماڵەکی ئایین پەروەر و ڕەوشـت چـاك پـەروەردە بـووە، دەسـتی کـرد بـە خوێندنی قورئانی پیرۆز، کتێبە سەرەتاییەکانی لە لای مەلا مەحمودی دشـەیی تـەواوکردن، ڕێزمانی عەرەبی لە لای مەلا حامیدی کاتب خوێند لە قۆنـاغی سـەرەوە چـووە لای مـەلا ئەحمەدی نۆدشەیی، ماوەکیش لای مەلا سەید عبدالرحیمی مەولەوی بوو، پاشان تەریقـەتی نەقشبەندی لە باوکی وەرگـرت، پلـەی خـەلیفاتی پێـدرا، دەسـتی کـرد بـە ئامۆژگـاری

خەڵکان، سافکردنەوەی دەروونی خاوەن گومان، دڵ گەشکردنەوەی دڵ تەنگان، حەواندنەوەی لێ قەوماو، هاوکاری زگ سووتاو، یارمەتی دانی ماڵ فەوتاو، بە تایبەت دوای ساڵی ١٢٨٣ك – ١٨٦٧ز کە باوکی کۆچی دوایی کرد.شێخ ئەبولوەفا دیوانی شیعری هەیە، بەڵام نەمزانیوە چاپ کرابی.

ناوبراو چووە (بەغدا) لە مزگەوتی شێخ عبدالقادری گەیلانی دابەزی، لەوێوە چووە سەفەری حەج، گەڕاوە لە ١٢٨٥ك کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی نزیك مزگەوتەکە بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. بنەماڵەی زانیاران ٤٠٦ – ٤٠٧.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٧٥ – ٢٧٦.

٣. نثر الجواهر والدرر ١/٦٨٩ – ٦٩٠.

## عبدالرحمان عوسمان شارەزوری (٦٩٠)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی عوسمانی کوڕی موسایە نازناوی صەلاحەدینە، خەڵکی شارەزورە، ساڵی ٥٣٩ك – ١١٤٤ز هاتووتەدنیا، زانایەکی شەرع زان بووە، لە (حەلەب) دەرسی داوە زانای فەرموودەناس (ابن الصلاح)ی شارەزوری کوڕی ئەو زاتەیە و دەرسی لە خزمەت خوێندووە، مامۆستا صەلاحەدین ساڵی ٦١٨ك – ١٢٢١ز لە شاری حەلەب کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. سير أعلام النبلاء ١٣/٧٨.

٢. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ٢/١٣٤.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٦٤.

٤. مشاهير الكورد ٢/١٠ – ١١.

### عبدالرحمان عوسمان مەرعەشی (٦٩١)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی عوسمانە خەڵکی (مەرعەش)ە، زانایەکی فەرائیز زان بووە، شەرحی کتێبی (المعادل)ی کردووە، ساڵی ١١٣٩ك تەواوی کردووە، لە ١١٢٦ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: معجم المؤلفين ٥/١٥٣.

### عبدالرحمان عەلی حەڕانی (٦٩٢)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی عەلی کوڕی عبدالغنی بن تەیمییەی (حەڕان)ییە، ناسراوە بە جەمالەدین، نازناوی ئەبولقاسمە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، ساڵی ٧٠١ك – ١٣٠١ز خۆی لەگەڵ باوکی کۆچی دوایان کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٢/٣٣٦ – ٣٣٧.

٢. الذيل عل طبقات الحنابلة ٤/٤٦٦.

### عبدالرحمان عومەر حەڕانی (٦٩٣)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی عومەری کوڕی بەرەکاتی کوڕی شحانەی کوڕی هبةالله یە، ساڵی ٥٨٩ك – ١١٩٣ز لە (حەڕان) هاتووتەدنیا، هەر لەوێ دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (دیمەشق) لەوێ چووە (موصل)، ساڵی ٦١٩ك سەفەری بەغدای کرد، هەر لەو ساڵەدا هاتە (هەولێر)، زانایەکی فەرموودەناس و شاعیر و مێژوونوس بووە، مێژووی حەڕانی نووسیوە لە چل بەرگ، ساڵی ١٢٤٥ز – ٦٤٣ك لە (میافارقین) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/٢٤٠.

٢. شذرات الذهب ٥/٢٢٠.

٣. تاريخ أربيل ١/٣٣٤ و ٢/٥٤٩.

٤. معجم أعلام الکورد ٤١٧.

## عبدالرحمان قادر هەمزەکۆری (٦٩٤)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی قادری کوڕی یونسی کوڕی سولەیمانە، عەشیرەتی بلْباسە تیرەی (مەمان)، ساڵی ١٩٣٣ز لە گوندی (هەمزەکۆر) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: ساڵی ١٩٤٠ز لە لای مەلا ئەبوبەکری مەلای گوندەکە دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (ئێلنجاغ) لای مەلا طاها، چوو (پورێجە) لای مەلا قادر، چووە (گردەسۆر) لای مەلا صەدیقی نۆغەرانی، چووە (دۆلەسزە) لای مەلاعوسمان، چووە (بشیریان) لای مەلا شەریف دووشیوانی، چووە (دۆلەزە) لای مەلا سەعید، چووە دووگرتکان، لای مەلا ئەبوبەکر، پاشان چووە لای مامۆستا صالحی کۆزەپانکەیی ماوە لەوێ، لەگەڵ مەلا محەممەدئەمین مەلا عوسمان ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە (بانەمورد) دوایی باری کرد بۆ (هەولێر) ماوەك دوکانی دانا، دوایی کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی ناوبازاڕ، پاشان کرا پێش نوێژ و وتارخوێن لە مزگەوتی حاجی مەحمود عەللاف، دوایی گواستراوە مزگەوتی شێخ عبدالله (شێخەڵلا)، لەوێ دوای نوێژی عەسران دەرسی بە کۆمەڵێك مەلایان دەدا، ساڵی ١٩٩٢ز کرا سەرۆکی یەکیەتی زانایانی ئاینی کوردستان لە (هەولێر)، هەروەها ماوەك ئەندامی ئەنجومەنی زانستی بوو لە هەولێر، ئەندامی لێژنەی فەتوا بوو.

کۆچی دوایی: دوای نوێژی هەینی ٥/٨/١٩٩٢ز شەهید کرا، ئەوکاتی باری ناوخۆی کوردستان زۆر شەپرێوو ئاڵۆز بوو، لە گۆڕستانی (گردەڕەشە) بە خاك سپێردرا، کتێبی (ئافرەت لە قورئان)ی هەیە، ساڵی ١٩٨٨ز چاپ کرا.

سەرچاوە: ژیاننامەی زانایە ئاینیە کۆچ کردووەکان ٤٨٨ — ٤٩٣.

## عبدالرحمان محەممەد ئامێدی (٦٩٥)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی محەممەدی کوڕی محەممەدی کوڕی محەممەدە خەڵکی ئامێدی یە، مەزهەبی حەنەفی بووە، لە (شام) کرایە موفتی، ساڵی ٩٧٨ك

– ١٥٧٠ز هاتووتەدنیا، لە ١٠٥١ك – ١٤٤١ز کۆچی دوایی کردووە، ئەو دانراوانەی هەیە: (تحرير التأويل على ما في معاني بعض أي التنزيل) و (مقدمة الصلاة) و (الروضة الريا فيمن دفن بداريا) و (الهدية في العبارات الفقهية) و (المستطاع من الزاد): باسی حەجە.

سەرچاوەکان:

١. إيضاح المكنون ٣/٥٩٤.
٢. هدية العارفين ٥/٥٤٩.
٣. مشاهير الكورد ٢/١٤ – ١٥.
٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/٩٢ – ٩٣.
٥. الأعلام ٥/١٩٠.
٦. معجم المؤلفين ٥/١٩١ /١٣/٣٩٦.
٧. كشف الظنون ٢/١٨٢٩ – ١٨٣٠.
٨. معجم أعلام الكورد ٤١٩.

## عبدالرحمان محەممەد قەرەداغی (٦٩٦)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی مەلا مەحمودی کوڕی طاهایە، خەڵکی قەرەداغە، ناسراوە بە (ابن الخياط) عەشیرەتی (شکاک)ە، ساڵی ١٢٥٣ك – ١٨٣٧ز لە قەرەداغ هاتووتەدنیا.

خوێندنی: دەستی کرد بە قورئانی پیرۆز، ماوەی یەك ساڵ خەتمی کردو هەمووی لەبەر کرد، دوایی کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکردن، ماوەی دە ساڵان لە خزمەت باوکی زانستەکانی کۆتا پێ هینا، ساڵی ١٢٧٤ك – ١٨٥٧ز ئیجازەی وەرگرت. ساڵی ١٣٠٣ك – ١٨٨٥ز چووە (بەغدا) دووبارە دەستی کردەوە بە خوێندن لە لای مامۆستا محەممەد فەیزی زەهاوی ئیجازەی وەرگرتەوە.

مەلایەتی: گەڕاوە (قەرەداغ) سێ ساڵ لەوێ دەرسی داوە، دوایی جەزبەی تەریقەتی نەقشبەندی ڕایکێشا بۆلای مەولانا خالیدی شارەزوری، ساڵەك لەوێ ماوە

مەولانا ئیجازەی تەریقەتی پێدا، گەڕاوە (قەرەداغ)، ماوەی دوو ساڵان وازی لە دەرسدانەوە هینا، تەنیا خەریکی زیکر و ویرد و خواپەرستی بوو، پاشان دەستی کردەوە بە دەرسدانەوە، ساڵی ١٢٩٩ك چووە (کەرکوك) دوایی گەڕاوە (قەرەداغ)، ساڵەك لەوێ بوو، گەڕاوە (بەغدا) لە قوتابخانەی (ئەبو یوسف) لە گەڕەکی کازمییە کرا دەرس بێژ، دوایی گواستراوە قوتابخانەی (باباگورگور) لەوانەیە سێ سەد ئیجازەی مەلایەتی دابی، زۆربەی مەلایە چاکەکانی بەغدا فەقێی ئەو زاتەن.

بەشێك لە فەقێیەکانی: شێخ عبدالوەهاب نائیب، محەمەد دەروێش ئالوسی، حاجی مصطەفا شێخلی، جەمیل صیدقی زەهاوی (شاعیر). مامۆستا لە فەرموودە و ئوصوڵ و شەریعەت وحیکمەت وکەلام و مەنتیق وبەلاغە زۆر شارەزا بوو.

دانراوەکانی:

١. شەرحی ئونموزەج، یەکەم نووسینیەتی، ساڵی ١٢٧١ك دایناوە.
٢. دقائق الحقائق.
٣. الإیقاظ في شرح وضع الألفاظ: لەوانەیە شەرحی وەضعی مامۆستا ئەبوبەکری میرڕۆستەمەی بی.
٤. مواهب الرحمن في علم البیان: لەوانەیە شەرحی ئیستیعارەی مامۆستا ئەبوبەکری میرڕۆستەمەی بی.
٥. ملخص الأقوال في خلق الأعمال، ساڵی ١٢٧٤ك دایناوە.
٦. أسنی المطالب في علم الواجب، ساڵی ١٢٧٤ك دایناوە
٧. التحقیق العالي شرح قصیدة بدء الأمالي، ساڵی ١٢٧٧ك دایناوە
٨. تحفة اللبیب علی عبدالله الیزدي، ساڵی ١٢٧٨ك دایناوە
٩. منهج الوصول بشرح منهاج الأصول، ساڵی ١٢٩٦ك دایناوە
١٠. الأجوبه البهیة في الأسئلة الهندیة، ساڵی ١٣٠٠ك دایناوە
١١. سعادة الدارین في بیان کلمة الشهادتین، ساڵی ١٣٢٠ك دایناوە

١٢. التبيان في بيان الناسخ والمنسوخ من القرآن، ساڵی ١٣٢٣ك دایناوە

١٣. تنبيه الأصدقاء، ساڵی ١٣٢٦ك – ١٩٠٨ز دایناوە، لە ١٣٣٠ لە بەغدا چاپ کرا.

١٤. فتاوى فقهية: ساڵی ١٣٢٩ك کۆی کردەوە.

١٥. حاشية على تفسير البيضاوي.

١٦. حاشية على التحفة.

١٧. حاشية على مختصر المنتهى.

١٨. حاشية على طوالع البيضاوي.

١٩. حاشية على السيلكوتي في المنطق.

٢٠. تەرجومەی میعراج نامەی نەجمەدین غیطی لە عەرەبی بۆ کوردی.

٢١. بداية الهداية.

٢٢. رسالة في الإيمان والإسلام .

٢٣. حاشية على شرح التصريف للتفتازاني.

٢٤. جامع الحقائق على حدائق الدقائق.

٢٥. رسالة في القضاء والقدر.

کۆچی دوایی: شەوی دووشەمەی ٢٩ی مانگی ڕەجەب ساڵی ١٣٣٥ك – ١٩١٧ز کۆچی دوایی کرد لە قوتابخانەی باباگوڕگوڕ لە (بەغدا) بە خاك سپێردرا.

سێ کوڕی مەلای هەبوون:

١. شێخ محەممەد: پێش نوێژ بوو لە مزگەوتی باباگوڕگوڕ، ساڵی ١٣٣٧ك – ١٩١٨ز کۆچی دوایی کرد.

٢. شێخ عەلی: پێش نوێژ و موفتی بوو لە مزگەوتی باباگوڕگوڕ.

٣. مەلا مەحموود: لە خانەقین مەلا بوو.

بە زمانی عەرەبی سەردولکەی مامۆستا عبدالرحمان دانراوە:

أيا حجة الإسلام مذ غبت بغتة بدأ للأعادي حجة ومناقب
ألم تر أن الشمس مذ غاب ضوؤها تلألأ في جو السماء الكواكب

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٤٣ – ٢٧٦ – ٢٧٨.
٢. تنبيه الأصدقاء في بيان التقليد والاجتهاد.
٣. لب الألباب ١/١١٦.
٤. معجم المؤلفين ٥/١٨٧.
٥. الأعلام ٤/١١٠.
٦. تاريخ السليمانية ٢٦٢ – ٢٦٣.
٧. معجم أعلام الكورد ٤١٨.
٨. نثر الجواهر والدرر ٦٩١ – ٦٩٢.
٩. بوژاندنەوە ١/١٢٨–١٣٠، ٢/٣٧٩–٣٨٥، ٥/٢٦١–٢٨٠.
١٠. مشاهير الكورد ٢/١١ – ١٢.
١١. ستاندەر، ژمارە ١٩ و ٢٠، ٢٠٠٧ز

## عبدالرحمان محەممەد ئەتروشی (٦٩٧)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی شێخ محەممەد عەلی ئەتروشییە، یەکە لە شێخەکانی تەریقەتی قادری، زانایەکی بەرز و مەلایەکی چاك بوو، لە شەریعەت ئاگاداربوو، لە قوتابخانە بەناوبانگەکەی (ئەتروش) دەرسی دەدا، هەروەها ئامۆژگاری خەڵکانی دەکرد، بۆ ئیرشاد دەچووە (دهۆك) و (موصل) و (هەولێر).

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٦٨ك – ١٩٤٨ز لە (موصل) کۆچی دوایی کرد، چەند کوڕی هەبوون:

١. شێخ عبدالحمید: لە ١٩٠٤ز لە دایك بوو، لە لای مەلا عوسمانی دیوەجی و مەلا عبدالله نیعمه و مەلا ئەحمەدی مزووری خوێند، ئیجازەی لە مەلا ئەحمەدی ئەتروشی وەرگرت، کرا قازی بەغدا، لە ١٩٩٣ز کۆچی دوایی کرد.
٢. شێخ بەشیر: ئەمینداری گشتی ئەوقاف بوو لە هەولێر.
٣. شێخ طاهیر: پارێزەر بوو لە هەولێر.
٤. شێخ طەیب: بەڕێوەبەر بوو لە پارێزگاری هەولێر.

سەرچاوە: إسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الاسلامیة ٢٨.

## عبدالرحمان محەممەد پێنجوێنی (٦٩٨)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی محەممەدی کوڕی مەلا برایمی کوڕی مەلا عەلی کوڕی مەلا یوسفی کوڕی مەلا عەزیزی کوڕی مەلا عبدالکریمە، لە سەیدەکانی بریفکانن، مەلا عەزیزی باپیرەگەورەی بریفکانی بەجێ هێشتووە، هاتووتە ناوچەی خۆشناوەتی، مەلا برایمی نەوەی چوویتە گوندی (شێخەالمارین) بۆ خوێندن لای مەلا خدری گەورە، لەوێ خوێندنی تەواوکرد، ئیجازەی وەرگرت، بووە زاوای مامۆستا، نەیتوانی بگەڕێتەوە ناوچەکەی خۆیان، لەو ڕۆژەدا کەوتنە (سلێمانی)، وەلەسەر وەسیەتی باپیرەگەورەیان، نازناوی (سەید)یان بۆ خۆیان دانەنا، تەنیا داوای مەلایەتیان کرد، بۆیە کەس باسی سەیدایەتیان ناکا. ئەم زاتە ساڵی ١٢٥٠ك – ١٨٣٤ز لە (پێنجوێن) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکردن لە کاتی خوێندنی (سعدالله)ی گەورە چووە (سلێمانی) لای مەلا عبدالقادری شیخەلماریني (جامی) تەواوکرد، چووە لای موفتی (چاومار) حاشیەی عبدالغفور و عیصامەدین و چەند نامیلکەی مەنتیقی خوێند، چووە (سنە) لای مەلا محەممەدی (فخر العلماء) عبدالله یەزدی و ئادابی خوێند، چووە (تورجان) بەشێکی شەریعەت و شەرحی شەمسیه و شەرحی مەطالیعی تەواوکرد، چووە (نۆدشە) لای مامۆستا ئەحمەد شەریعەت و کەلام و فەلەکیاتی خوێند، چووە (ڕواندز) لای مەلا عومەری

خەیلانی شەرحی چەغمینی خوێند، گەڕاوە (تورجان) لای مەلا عەلی قزلجی بەلاغەی خوێند، لای سەید حەسەنی چۆڕی عبدالحکیمی شەرحی شەمسییەی خوێند، کۆتایی بە خوێندن هینا، ئیجازەی لە مەلا عەلی قزلجی وەرگرت.

مەلایەتی: گەڕاوە (پێنجوێن) دەستی کرد بە جێ بەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی، دەرسدانەوەی فەقێیان، دوایی چووە مزگەوتی (نەقیب) لە سلێمانی دەرسی دەدا، پاشان گەڕاوە (پێنجوێن) چەند زانا لە خزمەتی بوون، بۆنموونە: مەلا حوسێنی پسکەندی، مەلا ڕەشید بەگی بابان، مەلا سەعیدی ئاغجەلەری، مەلا سەعید سوهەیلی، مەلا عبدالفتاحی خەتێ، مەلا عبدالعزیزی ڕوخ زادی، مەلا عبدالعزیزی بناسووتی، مەلا صالحی (حەریق).

کۆچی دوایی: شەوی هەینی دوای نوێژی عیشا مانگی ذی العقدة ساڵی ١٣١٩ ك - ١٩٠١ ز کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی:

١. مەلا ئەسعەند: بە گەنجی جوانەمەرگ بوو.
٢. مەلا جەلال.
٣. مەلا ئەحمەد: پێش نوێژ و دەرس بێژ بوو لە دەوری ساڵی ١٣٥٠ك - ١٩٣١ز کۆچی دوایی کرد.

مامۆستا زانایەکی شارەزا بوو لە زانستەکان، بە تایبەت لە مەنتیق و کەلام پسپۆڕ بوو، لەسەر زۆربەی کتێبانی خوێندن ڕۆیشتووە، بۆ نموونە: حاشیەی لەسەر ئەو هەموو کتێبانە هەیە: (سعدالله ی گەورە) و (حیسامکاتی) و (فناری) و (عبدالله یەزدی) و (تهذیب المنطق) و (بورهانی گەلەنبەوی) و (ئادابی گەلەنبەوی) و (شەرحی شەمسییە) و (شەرحی عەقائیدی نەسەفی) و (خەیالی) و (تهذیب الکلام) و (تقریب المرام) و (جمع الجوامع) و (لب الأصول) و (أقصی الأمانی) و (شەرحی چەمغینی) و (تشریح الأفلاك) و (مختصر) و

مطول) و (شەرحی مەطالیع) و (شەرحی مەقاصید) وە نامیلکەی خۆی لە باسی (کەلامی نەفسی).

سەرچاوەکان:


١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٧٨ - ٢٨١.

٢. معجم أعلام الكورد ٤١٩.

٣. تأريخ السليمانية ٢٦٢.

٤. مشاهير الكورد ٢/١٢.

٥. ژیناوەری زانایانی کورد ٢٢٦ - ٢٣٢.

٦. بنەماڵەی زانیاران ٤٣٣ - ٤٤٢ - ٤٥٠.


## عبدالرحمان محەممەد شەمشولەیی (٦٩٩)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی مەلا شێخ محەممەدی کوڕی مەلا عوسمانە عەشیرەتی شێخانە، ساڵی ١٩٣١ز لەگوندی (شەمشولە) هاتووتەدنیا.

لەلای باوکی دەستی کرد بەخوێندن، دوایی چووە (کەور) لای مەلائەنوەری برای، پاشان چووە (ماجیداوە) لای مەلا عومەری مەلاقەرەی، چووە (دووگرتکان) لای مەلاعەلی (بیرەعارەبان)، چووە (هێلەوە) لای مەلا ئەبوبەکری کۆیی، سالی ١٩٥٠ز چووە لای مەلا سەید عبداللەی توتمەیی، دوایی چووە (گردەسۆر) لای مەلا صەدیقی نۆغەرانی، ساڵی ١٩٥٢ز چووە (نۆغەران) لای مەلامحەممەدی باشوری، ماوەکیش لەلای مامۆستا شەریفی دووشیوانی و ماوەك لەلای مەلا یەحیای ماجیدی و ماوەك لەلای مەلائەبوبەکری گوێڕی خوێند، پاشان چووە (تۆبزاوە)ی نزیك (کەرکوك) لای مەلا عبدالمجیدی گراوی، دوایی چووە لای مەلاشێخ عومەری بالیسانی، پاشان چووە لای مەلا شێخ محەممەدی بالیسانی، ماوە لەوێ تا کۆتایی بەخوێندن هینا، ساڵی ١٩٥٥ز ئیجازەی وەرگرت. بووە مەلا لە(شەمامەر) ساڵی ١٩٦٠ز کرا مامۆستا لەوەزارەتی پەروەردە، لە ١١/١٢/١٩٨٥ز کرا پێش نوێژ لەمزگەوتی (الإخوان) لە گەڕەکی (ڕۆناکی) لە شاری

هەولێر، ماوەکیش ئەندامی ئەنجومەنی زانستی ئەوقاف بوو، لە ٢٥/٦/٢٠٠١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: خۆری ئیسلام، ژمارە ١٣ /٢٠٠١ز.

## عبدالرحمان محەممەد قازی (٧٠٠)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی محەممەدە ناسراوە بە قازی، لەگوندی (گەناو)ی پشدەر هاتوتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە قوتابخانەکانی ئەو دەوروبەری گەڕا، پاشان چووە مزگەوتی گەورەی (کۆیە) لای مەلاعبدالله ی جەلی، ماوە لەوێ تا تەواوی کرد، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

بووە مەلا لە (گەناو) پاشان لەگەڵ کاربەدەستانی ناوچەکە ناخۆشی لێ پەیدابوو باری کرد بۆ (مەهاباد) لەمزگەوتی سەید نیزام دەرسی دەداوە، ساڵی ١٩١٦ز بەدەستی لەشکری رووسە داگیرکەرەکان شەهید کرا.

دوو کوڕی هەبوون: مەلا رەسول و مەلا عبدالله.

سەرچاوە: محەممەد بن عبدالله الجلی ١٠٥.

## عبدالرحمان مەحمود هەولێری (٧٠١)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی مەحمودی کوڕی عەلی کوڕی ئیبراهیمی هەولێرییە، نازناوی ئەبو محەممەدە، خەڵکی گوندێکە لەوکاتە ناودەبردرا بە (جبریلاباز) ئێستا نەماوە یا ناوی گۆڕاوە، دەرسی شەریعەتی لەلای نەصری کوڕی عەقیل خوێندووە کەلە صەدەی حەوتی کۆچی لە هەولێر و موصل دەرسی داوە.

سەرچاوە: تأریخ أربیل ١/٣٦٥ – ٣٦٦.

## عبدالرحمان ناجم شارەزوری (٧٠٢)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی عبدالله یە خەڵکی شارەزورە، نازناوی (ناجم)ە، بۆ خوێندن چوویتە (بەغدا) لای موفتی زەهاوی، دوایی چوویتە (قوسطەنطینیە) لەوێ کرایتە (حاکم).

دانراوەکانی:

١. مجموعة الآثار في المنثورات والأشعار.

٢. هدية الأمم وينبوع الآداب والحكم: کۆمەڵە بەرگەکە، بەرگی یەکەمی لە (بێروت) چاپ کرا.

سەرچاوەکان:

١. إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢٣١ – ٢٣٢.

٢. هدية العارفين ٥/٥٥٩.

٣. معجم المؤلفين ٥/١٩٧.

٤. إيضاح المكنون ٤/٧٢٦.

## عبدالرحمان نیعمة الله کوردی (٧٠٣)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی نیعمەتوالله یە، ساڵی ١٨٧٦ز لە گەڕەکی ئەعزەمیەی (بەغدا) هاتووتەدنیا، پاش خەتمی قورئانی پیرۆز و تەواو کردنی کتێبە سەرەتاییەکان، چووە قوتابخانەی ئیمامی ئەعزەم.

لای ئەو بەڕێزانە خوێندنەکەی بردەسەر: مەلا حوسێنی پشدەری، شێخ عبدالوەهاب نائیب، شێخ سەعید نەقشبەندی، مەلا عبدالرحمان قەرەداغی، ئەمجا کرا موفتی شاری (عانە)، ساڵی ١٩٢٣ز کرا وتار خوێن لەمزگەوتی ئەبویوسف لە بەغدا، ساڵی ١٩٢٦ز کرا دەرس بێژ لە قوتابخانەی (هەیبەت خاتوون)، ساڵی ١٩٣٨ز کرا (واعیز) لەمزگەوتی بیشری حافی، لە ١٩٣٩ز کۆچی دوایی کرد، لەگۆڕستانی (خەیزەران) بەخاك سپێردرا.

سەرچاوە: تأريخ علماء بغداد ٣٦٣.

## عبدالرحمان نۆدشەیی (٧٠٤)

ناوی عبدالرحمانە باوکی مامۆستا ئەحمەدی نۆدشەیە، لەدەوری ساڵی ١١٩٠ك – ١٧٧٦ز هاتووتەدنیا، دەستی کرد بەخوێندن، لە قوتابخانەکانی کوردستان تەواوی کرد،

گەڕاوە (نۆدشە) دەستی کرد بە جیّ بەجیّ کردنی کاروباری مەلایەتی، پاشان باری کرد بۆ (سنە) لەدەوری ساڵی ١٢٥٦ك – ١٨٤٠ز گەڕاوە مزگەوتی ملکەندی لە (سلێمانی)، پارێزگاری شارەکە زۆر ڕێزی لێنا، فەرمانی (موفتی) و (مدرس)ی بۆ دەرکرد، ماوە لەویّ تا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٧٤ – ٢٧٥.

## عبدالرحمان یوسف حەڕانی (٧٠٥)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی یوسفی کوڕی محەممەدی خەلکی (حەڕان)ە، یەك بووە لەزانایە بەرزەکانی سەردەمی خۆی، ناوبانگی زمان ڕەوانی و زیرەکی ڕۆیشتبوو، لە مزگەوتی (المسجد الأقصى) ی قودسی پیرۆز وتار خوێن بووە، ساڵی ٧٠٢ك – ١٣٠٢ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٢/٢١٣.

## عبدالرحمان یوسف کوردی (٧٠٦)

ناوی عبدالرحمانە، کوڕی یوسفی کوڕی حوسێنە، مەزهەبی شافیعی بووە، لە دیمشق دابەزیوە، هەر لەمنداڵییەوە کتێبی (التنبیە)ی خوێند و لەبەری کرد، زاتەکی بەدین بووە، بەردەوام بووە لەسەر قورئان خوێندن، زانیاری لە تەفسیر و فەرموودە و مێژووی نەتەوەکان بەهێز بووە، لەشاری (بەعلەبەك)کرایە (قازی) دوایی کرایە قازی (طەرابلس)دوایی گەڕاوە (دیمشق)، سەفەری کرد بۆ (میصر)، لەمانگی ڕەبیعی دووەم ساڵی ٨١٩ك – ١٤١٦ز لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٧/١٣٧.

٢. معجم أعلام الكورد ٤٢٤.

## عبدالرحیم ئەبوبەکر مەرعەشی ( ٧٠٧ )

ناوی عبدالرحیمە، کوڕی ئەبوبەکری کوڕی سولەیمانی خەڵکی شاری (مەرعەش)ە، مەزهەبی حەنەفی بووە، دەرسی داوە، لەدەوری ساڵی ١٠٦٨ك – ١٦٥٧ز کۆچی دوایی کردووە.

دانراوەکانی: (شرح خلاصة الحساب) و (المفید للمستفید) و (المعادل) و (شرح بدأ الأمالي).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ٥/٢٠٣.
٢. هدیة العارفین ١/٥٦٣.
٣. إیضاح المکنون ٢/٥٥١.

## عبدالرحیم حوسێن عێراقی ( حافیزی عیراقی ) ( ٧٠٨ )

ناوی عبدالرحیمە، کوڕی حوسێنی کوڕی عبدالرحمانی کوڕی ئەبوبەکری کوڕی ئیبراهیمی کوڕی زەینی کوردیە، ناسراوە بە (حافیزی عیراقی)، مەزهەبی شافیعی بووە.

شەوکانی لە کتێبی (البدر الطالع) دەڵێ: {لە (٢١)ی جیمادی یەکەم ساڵی ٧٢٥ك – ١٣٢٥ز لە مەهرانی (میصر) پاش ماوەك کە باوکی چووەتە ئەو وڵاتە، لە دایك بووە}. بەڵام زەرکەلی لە کتێبی (الأعلام) دەڵێ: { لە (رازنان)ی سەر بە (هەولێر) لەدایك بووە، منداڵ بووە لەگەڵ باوکی چویتە (میصر)}. (رازنان – رازیان – رازان – ڕاژان): گوندێکە سەر بە ناوچەی (پشدەر) دەکەوێتە سەر سنووری (ئێران) عەشیرەتی نورەدینی لێ دادەنیشن، نزیکە لە گوندی (دووژان) (١٢) کیلۆمەتر دوورە لەشاری (قەلادزێ).

خوێندنی: لەخزمەت باوکی دەستی کرد بەخوێندن، پاش ماوەك چووە (دیمشق)، لای ئیبنو خەبباز و ئەبو لعەبباسی مەرداوی دامەزرا بەفەقێ، پاشان لە حەلەب و قودس و

ئەسکەندەرییە و مەککەی پیرۆز، کتێبانی: (حاوي) و (تنبیە) و (إلمام)ی هەموو لەبەر کردن، بەیەك ڕۆژ لەوانە چوار صەد دێڕی لەبەر دەکرد.

بەشێك لە مامۆستایەکانی: عبدالرحیم (شاهید الجیش)، کوڕی عبدالهادی، عەلائەدین تورکمانی، ئەبو فەتحی مەیدومی، شێخ شەهابەدینی کوڕی بابا، کوڕی ملوك، عز کوڕی جەماعە.

پلەی زانیاری: زانایەکی بەرز بوو، لە چەرخی خۆی بەیەکەم دادەنرا، لەزانستەکانی قورئانی پیرۆز شارەزا بوو، لە فەرموودەکانی پێغەمبەر(د.خ) دەستی بالآبوو، هەروەها لە شەریعەت و ئوصول بەتوانا بوو، زانایانی وەك: ئیمامی سوبکی و ئەسنەوی و سیوطی و شێخی عەسقەلانی و عز کوڕی جەماعە، هەر هەموویان مەتحیان کردووە، وە بە (حافز) ناودەبرێ لە بەرئەوەی لە زانستی فەرموودە زۆر بالآ بووە.

پلەو پایەکانی: ساڵی ٧٨٨ك – ١٣٨٦ز کرا قازی لە (مەدینە)ی پیرۆز، ساڵی ٧٩٠ك – ١٣٨٨ز گەڕاوە (قاهیرە)، لەوێ وەلیەدینی کوڕی لەدایك بوو، ساڵی ٧٩٦ك – ١٣٩٣ز دەستی بە دەرسدانەوەی بەکۆمەڵ کرد، بۆ ئەو مەبەستە چوار صەد کۆڕی زانیاری بۆ بەسترا، وە لە قوتابخانەکانی (دارالحدیث) و (کاملیة) و (ظاهیریة) دەرسی دەداوە، مامۆستایانی پایەداری وەك: نورەدینی هەیثەمی و شێخ ئەحمد بن حەجەری عەسقەلانی کەلەسەر بوخاری ڕۆیشتووە ئەوانە فەقێی ئەو زاتەنە، جا ئەگەر فەقێ بەو جۆرە بێ، دەبێ مامۆستای چۆن بێ؟

سیفەتەکانی: مامۆستای فەرمودەناس و چرای نەکوژاوە تا قیامەت، زاتەکی ڕیش سپی و دیمەن جوان و ڕووپاك و خاوێن بووە، هێمن و لەسەرەخۆ بووە قسە خۆش بووە، شەو نوێژی قەت نەچووە، لەهەر مانگەك سێ ڕۆژ بەڕۆژو دەبوو، پسپۆڕی فەرموودەناس نورەدین عەلی کوڕی ئەبوبەکری هەیثەمی دەڵێ: {لەخەودا بەخزمەت پێغەمبەر گەیشتم (د.خ) دیتم حەزرەتی عیسا پێغەمبەر (د.خ) لەلای ڕاستەی بوو، مامۆستا زەینەدینی عیراقی لەلای چەپەی بوو}.

کۆچی دوایی: شەوی چوار شەمە (٨)ی مانگی شەعبان ساڵی ٨٠٦ك – ١٤٠٣ز پاش دەرچوونی لە (حەمام) لە (قاهیرە) کۆچی دوایی کرد، شێخ ئەحمەد بن حەجەری عەسقەلانی قەسیدەکی لاواندنەوەی پێدا هەڵگۆتووە، هەروەها مامۆستا کوڕی جزیری دەڵێ:

رحمة الله للعراقي تترى      حافظ الأرض حبرها باتفاق

إنني مقسم ألية صدق      لم يكن في البلاد مثل العراقي

مامۆستا زەینەدین کوڕێکی زانا و پسپۆری شەریعەتی هەبوو، ناسرابوو بە(وەلیەدین ئەبو زەرعە ئەحمەد عیراقی کوردی)، لەپێشدا لە پیتی (أ) باسمان کرد.

دانراوەکانی:

١. النكت على منهاج البيضاوي.
٢. نظم المنهاج.
٣. ذيل على الميزان والألفية.
٤. العزيز في أصول الفقه.
٥. الألفية في غريب القرآن.
٦. شرح التقريب.
٧. أنفع القرب في محبة العرب.
٨. ذيل على ذيل العبر للذهبي.
٩. معجم القرن الثامن للهجرة.
١٠. التقييد والإيضاح على كتاب ابن الصلاح.
١١. مختصر المحجة.
١٢. نظم الدرر السنية في السيرة النبوية: دانەکی دەستنووسی لەلای ئێمە هەیە، ئێستاکە ساڵی ٢٠٠٨ز کاکم مەلا طەیب خەریکە شەرحی لەسەر دەنوسی، خودای گەورە تەمەن ساغی بکات، بۆ تەواو کردن و سوود لێ وەرگرتنی.

١٣. العدد المعتبر في الأوجه التي بين السور.
١٤. نظم الإقتراح.
١٥. المغني عن حمل الأسفار في الإسفار، في تخريج أحاديث الإحياء.
١٦. ذيل الذيل لوفيات الأعيان.
١٧. قرة العين لوفاء الوالدين.
١٨. تقريب الأسانيد وترتيب المسانيد: وەلیەدینی کوڕی شەرحی کردووە.
١٩. مهمات المهمات: پەراوێزە لەسەر (مهمات)ی ئەسنەوی.
٢٠. تكملة شرح المهذب.
٢١. تكملة شرح الترمذي لابن سيد الناس.
٢٢. الإستعاذة بالواحد، من إقامة جمعتين في مكان واحد.
٢٣. الباعث على الإخلاص، من حوادث القصاص.
٢٤. التبصرة والتذكره: الألفية في أصول الحديث: ساڵی ٧٦٨ك – ١٣٦٦ز تەواوی کردووە، لە ١٣٦٩ز شەرحی لەسەر نووسیوە، ناویناوە (فتح المغيث بشرح الفية الحديث) هەروەها قازی شێخ زەکەریای ئەنصاری شەرحی کردووە ناویناوە (فتح الباقي بشرح الفية العراقي)، ساڵی ٨٩٦ك – ١٤٩٠ز تەواوی کردووە، دانەکی کۆپی لە پەڕتوکخانەی ئێمە هەیە.

سەرچاوەکان:


١. الضوء اللامع ٤/١٥٢-١٥٨.
٢. البدر الطالع ١/٣٥٤.
٣. إحياء علوم الدين /پێشەکی ١/١٥.
٤. معجم المؤلفين ٥/٢٠٤.
٥. شذرات الذهب ٧/٥٥-٥٧.
٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٨٣-٢٨٤.

٧. إيضاح المكنون ٢/٩٦.
٨. هدية العارفين ١/٥٦٢.
٩. معجم أعلام الكورد ٤٠٤.
١٠. كشف الظنون ١/٢٤-٧٤٧ /٢/١٧٤٨-١٩١١.
١١. الأعلام ٢/١٦٤ /٤/١١٩ /٥/١٤ /١٠/١٢٥.
١٢. التقييد والإيضاح /پێشەکی ١/٩-١٢.
١٣. العجالة السنية ١/٢٢-٢٩.
١٤. چاوپێکەوتنێك لەگەڵ مەلا ئەحمەدی پشدەری لە گەڕەکی مەلایان لە هەولێر.

## عبدالرحیم سەعید مەولەوی (٧٠٩)

ناوی عبدالرحیمە، کوڕی مەلا سەعیدی کوڕی شەریفی کوڕی مەحمودی کوڕی یوسف جانی کوڕی جەمالەدینی کوڕی کەمالەدینی کوڕی مەلا یوسف جانی کوڕی سەید حەسەنی ئەبوبەکری چۆڕییە ناسراوە بە (مصنف) لە نەتەوەی سەید محەممەد زاهیدە، کە ناسراوە بە (پیرخدری شاهۆ) ئەو زاتە ساڵی ١٢٢١ك - ١٨٠٦ز لە گوندی (سەرشاتە)ی تاوەگۆز، هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی باریان کرد بۆ (بێژاوە)، دەستی کرد بە گەڕان لە حوجرەکانی فەقێیان: خەرپان و خورماڵ و بیراه و تەوێڵە و پاوە و خانەقا و چۆڕ، مزگەوتی (وەزیر) لە سنە، مزگەوتی (دار الإحسان) لە بانە، مزگەوتی گەورەی سلێمانی، مزگەوتی (جامیعە)ی هەڵەبجە لای شێخ عبداللە ی خەرپانی و مەلا صادقی تەوێڵەیی، قەڵای جوانڕۆ لای مەلا محەممەد قازی، دووبارە سنە، دووبارە سلێمانی: مزگەوتی مەڵکەندی لای مەلا عبدالرحمان نۆدشەیی ماوە لە خزمەت ئەو مامۆستایە، تا کۆتایی بە خوێندن هینا، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە (چورستان)، دوایی چووە (بیاوێلە)، پاشان چووە (گوندە) دوایی چووە (شمیران)، دوایی چووە (کانی کەوە) گەڕاوە (سەرشاتە)،

(مەولەوی) دوای ئیجازەی مەلایەتی، تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عوسمانی تەوێڵە وەرگرت، جەنابی شێخ ئیجازەی خەلیفاتی پێدا، بەو دوو پلەیە مەلایەتی و شێخایەتی توانی بەو وەعزە پڕ جۆشانە و بە تام و بۆیانە ئامۆژگاری خەڵکان بکات، لە کۆبوونەوە ئاینیەکان، ڕایان بکێشێ بۆ سەر ڕێگای ئیسلام هەروەکو زمانەکەی لە کاربوو بۆ خزمەتی ئاینی پیرۆز، قەڵەمەکەشی دریغی نەکرد بۆ نووسین و دانانی چەند کتێبی هۆنراوە و پەخشان، لەوانە:

١. هۆنراوەی (فضیلة) ساڵی ١٢٨٥ك – ١٨٦٨ز تەواوی کردووە، مامۆستا عبدالکریم (مدرس) شەرحی کردووە، بەناوی (الوسیلة) ساڵی ١٩٧٢ز لە بەغدا چاپ کرا.
٢. عەقیدەی مەرضیة: بە کوردی ساڵی ١٣٥٢ك – ١٩٣٣ز لە (میصر) چاپ کرا، مامۆستا عبدالکریم (مدرس) شەرحی کردووە، ساڵی ١٩٨٨ز لە (بەغدا) چاپ کرا.
٣. هۆنراوەی (فوائح) بە فارسی: ساڵی ١٩٥٢ز لە (میصر) چاپ کرا، مامۆستا عبدالکریم (مدرس) شەرحی کردووە بەناوی (فوائد الفوائح) ساڵی ١٩٩٥ لە (بەغدا) چاپ کرا.
٤. دیوانی مەولەوی: نازناوی مەعدومی بۆ خۆی دناوە، ساڵی ١٩٣٥ز چاپ کرا.

کاکەی فەللاح دەربارەی دەڵێ:

لە گیانی پاکی مەولەوی دانا ئەوەی هەڵبەستی ناسکی دانا

مژدەبێ ئەوا دیوانی شیعری دەرچوو ئەگەڕێ بە ناو کوردانا

٥. نامیلکەی (رابیطة) دەستنووسە.
٦. عەقیدەی مەولەوی: ساڵی ١٩٧٧ز لە چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، لە بەغدا چاپ کرا.

مامۆستا عبدالکریم (مدرس) لە مەتحی مەولەوی دەڵێ:

| | |
|---|---|
| هەربژی ناوی نامی مەولەوی | لە ڕێزی سەعدی و جامی دیهلەوی |
| بژین زانایان لە ڕووی جیهانا | لە زانای عیلمی ماددی و مەعنەوی |
| حەشرمان بکا خودا بە کەرەم | لەژێر سای ئالآی بەرزی نەبەوی |

سەفەرەکانی:

١. ساڵی ١٢٧١ك – ١٨٥٤ز لەسەر فەرمانی شێخ عوسمان، لەگەڵ مەلا ئەحمەدی نۆدشە و شێخ عبدالرحمانی ئەبولوەفا، چوونە (سنە) بۆ ئامۆژگاری کردنی غولام شاخان تا بە زۆری خەڵك نەکا بە شیعە، بەڵام وازی نەهینا، سەفەرەکە بێ سوود بوو.

٢. چووە (مەهاباد) سەردانی سەید حەسەنی چۆڕی کرد.

٣. چووە (کەرکوك) چەند مانگ لە لای شێخ عەلی طاڵەبانی ماوە.

٤. چووە (بەغدا) بە نیازی حەج، لەوێ ڕەفیقەکەی هەموو پارەکەی لێ دزی، ناچار مەولەوی گەڕاوە.

٥. چەندجار دەچووە (سلێمانی) بۆ زیارەتی کاك ئەحمەدی شێخ و مامۆستا شێخ عبدالقادری موهاجیر.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٠٠ك – ١٨٨٢ز لە گوندی (سەرشاتە)ی تاوەگۆز، ماڵئاوایی یەکجاری لە دۆست و برادەران کرد، لە گۆڕستانی (ئەصحابە) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٢/٢٣-٢٥.

٢. الوسيلة / پاشکۆ ٨٢٧ – ٨٣٠.

٣. الوسيلة / پێشەکی (و – ص).

٤. البيتوشي ١٠٦.

٥. یادی مەردان ٢/٣٦٢ – ٤٨٦.

٦. ژیناوەری زانایانی کورد ١/١٢٤ – ١٢٦.
٧. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٨٦ – ٢٨٨.
٨. بوژاندنەوە ١/١٢٤ – ١٢٦، ٢/٣٧٦ – ٣٧٨، ٣/٢٢٧ – ٢٢٩، ٥/ ١٨٩.
٩. معجم المؤلفين ٥/٢٠٤.
١٠. ئەدەبی کوردی ٢٨١ – ٢٩٤.
١١. دەقەکانی ئەدەبی کوردی ٨٩ – ١٠٤.
١٢. مێژووی ئەدەبی کوردی ٣/٣٥١ – ٣٩٥.
١٣. بنەماڵەی زانیاران ٥١١ – ٥٢٤.
١٤. گوڵزاری کوردستان ١٦٥.
١٥. تأريخ السليمانية ٢٦٥ – ٢٦٨.
١٦. معجم أعلام الكورد ٤٠٥ – ٤٠٦.
١٧. نثر الجواهر والدرر ١/٦٩٦.

## عبدالرحیم صادق گاینجی (٧١٠)

ناوی عبدالرحیمە، کوڕی مەلا صادقی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی عەزیزە، عەشیرەتی شێخ بزێنی یە، ساڵی ١٩٠٣ز لە گوندی (گاینج) هاتووتە دنیا.

خوێندنی: لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی باوکی ناردییە لای مەلا سەعیدی ئاکرێ، دوایی چووە (قەراسنج)، پاشان چووە (تەرجان) لای مەلا عبدالله، دوایی چووە (بەحرکە) لای مەلا عوسمانی شەوەکی، پاشان چووە (هەولێر) مزگەوتی شێخ مصطفای نەقشبەندی، ماوە لەوێ تا ساڵی ١٩٣٤ز کۆتایی بە خوێندن هینا، ئیجازەی لە جەنابی شێخ وەرگرت. هەروەها تەریقەتی نەقشبەندی لێ وەرگرت.

مەلایەتی: گەڕاوە (گاینج) کاروباری مەلایەتی ئەنجام دەدا، ساڵی ١٩٥٩ز هاتە هەولێر، لە مزگەوتی حاجی قادر باریکە، لە گەڕەکی تەیراوە، کرا پێش نوێژ.

بەشێك لە فەقێیەكانی: مەلا عبداللەی سێبەردانی، مەلا خدری شەمامەری، مەلا عبدالكريم سێبیرانی، لە ٢٢/١١/١٩٨٢ز كۆچی دوایی كرد، لە گۆڕستانی (كەورگۆسك) بە خاك سپێردرا، مەلا ئەمجەدی كوڕی: مامۆستا بوو لە وەزارەتی پەروەردە، لە دەوری ساڵی ٢٠٠٥ز كۆچی دوایی كرد.

سەرچاوە: ژیاننامەی زانایە ئاینیە كۆچ كردووەكان ٤٩٩ – ٥٠٢.

## عبدالرحیم صاڵح زیارەتی (٧١١)

ناوی عبدالرحیمە، كوڕی مەلا صاڵحی كوڕی مەلا ئیبراهیمە، یەكە لە فەقێیەكانی شێخ ئەبوبەكری هەرشەمی، ساڵی ١٣٤١ك – ١٩٢٢ز كۆچی دوایی كردووە، لەژێر گومبەتەكەی شێخ جەعفەر، لە گوندی (زیارەت) بە خاك سپێردرا، مەلا مەزهەر كوڕی ئەو زاتە بووە، كوڕی ئەویش مەلا قاسمە: چەند ساڵە لە زیارەت مەدرەسەی فەقێیانی هەیە، كاروباری مەلایەتی جێبەجێ دەكات، زاتەكی خواناس و دڵپاك و ئەهلی تەریقەتە، ئەو ساڵە مزگەوتێكی نوێ لە نزیك گومبەتی شێخ جەعفەر دروست كردووە، ئەویش نەوەی مەلای هەنە خودای گەورە تەمەنیان درێژبكا، بۆ خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، ئەو ئاگردانە زانستییە، قەت نەكوژێتەوە.

سەرچاوە: چاوپێكەوتنێك لەگەڵ غازی عەزیز قادر زیارەتی.

## عبدالرحیم صەدەقە ئەییوب (٧١٢)

ناوی عبدالرحیمە، كوڕی صەدەقەی كوڕی ئەییوبی كوڕی فەتح الدینی كوڕی شەرەف كوردییە، مەزهەبی شافیعی بووە، ساڵی ٨٤٤ك – ١٤٤٠ز لە (قاهیرە) هاتووتەدنیا، دەستی كردووە بە خوێندن، خەریكی پەیداكردنی زانیاری بووە، بەتایبەت فەرموودەكانی پێغەمبەر (د.خ)، ساڵی ٨٩٨ك – ١٧٩٢ز لە (مەككە)ی پیرۆز دەرسی داوە، هەروەها لە (مەدینە)ی پیرۆز دەرسی داوە، كوڕەكی ناو ئەبوفەتحی هەبووە دەرس بێژبووە.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٢٧٤.

٢. معجم أعلام الكورد ٤٠٥.

## عبدالرحيم عوسمان بناوەسوتە (٧١٣)

ناوی عبدالرحيمە، کوڕی عوسمانی کوڕی حەیدەرە، خەڵکی گوندی (بناوەسوتە)ی نزیك (پێنجوێن)ە، مندال بوو باوکی کۆچی دوایی کرد، خزمەکانی ناردیانە خانەقای (بیارە) لەگەڵ هەتیمەکانی تر، کە ژمارەیان هەژدە بوون، شێخ عومەر (ضیاء الدين) بەخێوی کرد، لەبەر خوێندنی دانا، بووە مەلا لە گوندی (نی) مەریوانی، خەریکی مەلایەتی و دەرسی فەقێیان بوو، تا ساڵی ١٣٥٥ك – ١٩٣٦ز کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی مەلای هەبوو، ناو محەممەد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٨٩.

## عبدالرحيم عەلی دیاربەکری (٧١٤)

ناوی عبدالرحيمە، کوڕی عەلییە، خەڵکی (دیاربەکر)ە، مەزهەبی حەنەفییە، کرایتە قازی، کتێبی (زبدة الدراية في شرح الهداية)ی هەیە، سەرەتایەکەی بە (أحمد الله أن شرح عيون حقائق صدورنا.....) دەست پێ دەکا، هەروەها کتێبی (المهم الضروري في شرح مختصر القدوري). هەیە.

سەرچاوەکان:

١. كشف الظنون ٢/٢٠٣٧.

٢. هدية العارفين ٥/٥٦٢.

## عبدالرحيم عومەر چورستانی (٧١٥)

ناوی عبدالرحيمە، کوڕی عومەری کوڕی شەریفی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی محەممەد ئاغایە، عەشیرەتی (میرادودەلی)یە، دەوری ساڵی ١٢٩٣ك – ١٨٧٦ز هاتووتەدنیا، دوای ساڵی ١٨٨٠ز دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغی سووختەیی تێپەڕکرد،

چووە لای مەلا عبدالقادری (بیارە)، ماوە لەوێ تا کۆتایی بە خوێندن هینا، بووە مەلا لە دەشتی دزەیی پشت هەولێر، ماوەك لە خانەقای سەید ئەحمەد بوو لە (کەرکوك)، ماوەك لە گوندی (ئەحمەد برِوندە) بوو، دوا هەواری بووە (بەرزنجە)، چورستانی زاتەکی بە دین و خواپەرست و پڕ زانیاری بووە، تەریقەتی نەقشبەندی بەکارهیناوە، زۆر دڵسۆزی (ضیاءالدین) شێخ عومەری بیارە بووە.

کۆچی دوایی: لە دەورووبەری ساڵی ١٣٣٤ك – ١٩١٥ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی:

١. نامیلکەی فەرائیز: دانەکی دەستنووسی لای ئێمە هەیە.

٢. چەند حاشیە لەسەر بورهانی گەلەنبەوی.

٣. چەند حاشیە لەسەر ئادابی گەلەنبەوی.

٤. چەند حاشیە لەسەر فەرائیزی شێخ مەعروف.

٥. چەند حاشیە لەسەر (فتح المعین).

٦. چەند حاشیە لەسەر شەرحی عەقائید تەفتازانی.

کوڕەکانی: مامۆستا سێ کوڕی مەلای هەبوون:

١. مەلا محەمەد: لە مەودوا باسی دەکەین – إن شاء الله –.

٢. مەلا عبداللە: مەلایەکی چاك بوو، لە (سلێمانی) دادەنیشت.

٣. مەلا یەحیا: پێش نوێژی سوپا بوو، لە (بەغدا) دادەنیشت.

سەرچاوەکان:

١. یادی مەردان ٢/٥٢٤ – ٥٢٥.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٨٨ – ٢٨٩.

## عبدالرحیم غەفور (وەفایی) (٧١٦)

ناوی عبدالرحیمی، کوڕی مەلا عەفوری کوڕی مەلا نەصراللە یە، ناوبراوە بە میرزا، نازناوی (وەفایی)یە، ساڵی ١٨٤٤ز لە (سابلاغ) هاتووتەدنیا، هەر لەوێ خوێندنی

تەواوکردووە، ئیجازەی وەرگرتووە، ماوەك لـەوێ مایتـەوە، دەرسـی منـداڵانی دایتـەوە، پاشان ساڵی ١٩٠٠ز چوویتە شاری (سلێمانی).

وەفایی جگە لـە مەلایەتی، شاعیرێکی چاك و چالاك بـووە، پایەبـەرز و بـێ هـەمتا بووە، دیوانی شیعری کوردی و فارسی هەیە، ساڵی ١٩٥١ز لە لایەن گیوی موکریانی لە (هەولێر) چاپ کرا، وە لە سـاڵی ١٩٧٨ز لـە چـاپخانەی کـۆڕی زانیـاری کـورد، بـە لێکۆڵینەوەی محەممەد عەلی قەرەداغی دووبارە چـاپ کـراوە، جـەنابی شـێخ عوبیـداللەی نەهری، زۆر حەزی لە شیعرەکانی (وەفایی) دەکرد، بۆیە بانگی لای خۆی کرد و کردیـە نووسەری تایبەتی خۆی.

(وەفـایی) شـیعرەکانی بریتیـە، لـە سـتایش و پاڕانـەوە و کۆمەڵایـەتی و نیشتمانپەروەری و دڵداری، لەو هەموو جـۆرە بابەتانـە دوایـە، بـەڵام بابـەتی (دڵـداری) لەنێوان شیعرەکان لە هەمووان پڕ پێوەدیارە، لەو بابەتەش چامەی (شیرین تەشی دەڕێسێ) لە هەموویان بەهێزتر و پڕماناترە، بە ڕاستی بەڵگەیە بۆ چالاکی بۆ سوارچاکی، لە قۆشمەی مەیدانی ڕەوانبێژی و هونەرمەندی، (وەفایی) لـەو چـامەیەدا، وادادەنـێ کـە یارەکـەی – شیرین – بە پێوە وەستاوە تەشی دەڕێسێ، باریکایی تەشیەکە بە پەنجە دەگرێ، لەسەر ڕانی دادەنێ، ئاوی زاری لە دارەکە دەدا، بەخێرایی بایدەدا، ناچار تەشیەکە سەرو دامەنی دێتـە جووڵە و سەما، داوە ریسەکە لە خۆ وەردەئاڵێنێ، جارجاریش دەستە نازکەکەی بۆ ئاسمان بەرزدەکاتەوە، تاکو داوەکان ئاڵۆزنەبن، ڕێگای درێژبوون وەربگرن.

وەفایی ئەو هەموو کارو کردارە جوانانـەی، لەگـەڵ چـەند تەشـبیە و تەرشـیح و ئیستیعارە و تەورییە و تەوجیە و طیباق لێکدایتەوە، ڕێکی خستووە بەرانبەر سوڕانی ئاسمان لـە دەوری زەوی، لەگـەڵ سـوڕانی مـانگ و ڕۆژ و ئەسـتێرەکان، کـە هەسـتی خـۆت رادەگری سەرسام دەبی، ئەو مەلایە چۆن توانیتی ئەو هەموو جوانکارییـە، لـە وشـەکان و ناوەرۆك کۆبکاتەوە؟ چـۆن تـوانیتی لـە شـتێکی سـادە وەك (تەشـی) ئـەو هـەموو زاراوە ئەستێرەناسییە بەکاربینێ؟؟ ئەو هەموو شتانەی والێکدوور – بە دووری ئاسمـان و زەوی –

چۆن توانی پەیوەندی لە نێوانیاندا پەیدا بکا و بیانکا بە وێنەی یەك؟ بەڵام مەردی چالاك، چیا دەکا بە قەڵات، نمونەك لە چامەی (تەشی دەرێسیٚ):

تایێکی ڕیشەیی دڵ بە نوکی غەمزە دادا
دەستێکی بۆ سەما برد ڕووبەندی ماهی لادا
نافەی گوڵی بەدەرکەوت عەطری بە دەم صەبادا
باریك و لوس نازك وەك زولفی خاوی بادا
وەك شاخی گوڵ بە لادا، شیرین تەشی دەرێسیٚ

نوکی تەشی بە گەردووش چەرخێکە قوطبی پێوە
مەجەڕە بوو بە داوی، کە چەرخی کەوتە نێوە
وەك زوهرە دەستی کێشا، کە بەندی قەوسی زێوە
ئەستێرە ماهی داگرت، سابیت کرا بە پێوە
عەرەق بەڕوو بەڕێوە، شیرین تەشی دەرێسیٚ

کە دەستی برد و هێنا، بە دولبەری بە تادا
بە چەرخی خست و گێڕای، بە ڕانی صاف دادا
عەیان بوو پەنجەیی ڕۆژ، بە خەططی ئیستیوادا
بە صوبحی صادیق ئەنگوت، زەنەب لە نێو سەمادا
حیرەت لە ماسیوادا، شیرین تەشی دەرێسیٚ

کە کەوتە چەرخە و گەردووش، تەشی بە دەستی ڕەنگین
هاودای لە لێو و دەمدا، خورشیدی سینە نەسرین
سەمای بە ذو زەنەب دا، (کف الخضیب)ی شیرین
گرتی خەتی مودارا، شەفەق بە عەقدی پەروین
سیحرێکە بۆ دڵ و دین، شیرین تەشی دەرێسیٚ

مەنعی مەکەن (وەفایی) کە خاوو و دڵ بەلاوە
سەرێکە مەستی نازی، دڵی لە بۆی نەماوە
بە داوی دڵ دڵی خۆی، بە داوی زولفی داوە
دڵم حەقی بە دەستە، فتوایی سەرمی داوە
کە ئەم غەزالە چاوە، شیرین تەشی دەڕێسێ

کۆچی دوایی: (وەفایی) دووجار سەفەری حەجی کرد، جاری سێیەم ساڵی ١٩٠٢ز لە شاری (سلێمانی) بە ڕێکەوت، لەگەڵ شێخ سەعیدی حەفید و سەید ئەحمەدی خانەقا و حاجی تەوفیق بەگ – پیرەمێرد – لە ڕێگای (شام) وەفایی کۆچی دوایی کرد، پیرەمێرد دەڵێ: {لە قومەرانی چۆڵەوانی عەرەبستان، بە دەستی خۆم شاردمەوە}.

سەرچاوەکان:

١. دیوانی وەفایی ٣١ – ٥٦ – ١٩٢ – ١٩٨.
٢. گوڵزاری کوردستان ٢٠٧.
٣. ژیناوەری زانایانی کورد ١٧٥ – ١٨٨.
٤. معجم أعلام الكورد ٤٠٥.
٥. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٥/٣١١.
٦. مێژووی ئەدەبی کوردی ٤/٣٤٧ – ٣٧٩.

## عبدالرحیم قاسم بەرزنجی (٧١٧)

ناوی عبدالرحیمی، کوڕی قاسمی کوڕی حەسەنی کوڕی بایەزیدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی شێخ بابا ڕەسولی گەورەی بەرزنجی یە، یەك بووە لە زانایە چاکەکانی سەردەمی خۆی، لە شاری (سلێمانی) خەریکی جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی و ئامۆژگاری خەڵکان و دەرسدانەوەی فەقێیان بوو، هەر لەوێ کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين. – ٢٨٥ – ٢٨٦

## عبدالرحیم محەممەد هەولێری ( ٧١٨ )

ناوی عبدالرحیمی، کوڕی محەممەدی کوڕی یونسی کوڕی محەممەدی کوڕی سەعیدی کوڕی مالیکی هەولێرییە، ساڵی ٥٩٨ک – ١٢٠١ز لە موصل هاتووتەدنیا، لەوێ ماوە تا (تەتەرەکان) شاری (موصل)یان داگیر کرد، دوایی چووە (بەغدا) لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٦٧٠ک – ١٢٧٢ز لەوێ دابەزی، هەر لەوێ ساڵی ٦٧١ک کۆچی دوایی کرد.

چەند کتێبێکی داناون، لەوانە:

١. التعجیز في إختصار الوجیز.
٢. کورت کرایەوەی (المحصول) لە زانستی (أصول الفقه).
٣. کورت کرایەوەی (طریقة رکن الدین).

سەرچاوەکان:

١. البدایة واالنهایة ١٣/٢٧٠.
٢. معجم المؤلفین ٥/٢١٣.
٣. طبقات الشافعیة/ ئەسنەوی ٢/٥٧٤.
٤. هدیة العارفین ٥/٥٦١.
٥. وفیات الأعیان ٣/٣٨٧.
٦. کشف الظنون ٢/١٦١٦.
٧. منهل الأولیاء ٢٠٣.
٨. شذرات الذهب ٥/٣٣٢.

## عبدالرحیم مەلا زادە زیارەتی ( ٧١٩ )

مامۆستا عبدالرحیم، ناسراوە بە مەلا زادەی شافیعی، خەڵکی گوندی (زیارەت)ە ئەو گوندە دەکەوێتە خوار لوتکەکانی چیای (سەربەن) لە لای باکورەوە، زاتەکی بە دین

و ڕوو لە خوا بووە، دنیای نەویستووە، لە هەموو زانستەکان دەستی بالآ بووە، دانراوی خۆی زۆر بووینە، بەڵام نەماون.

مەولانا خالیدی شارەزووری کتێبی (تهذیب المنطق) لەگەڵ پەراوێزەکانی لە خزمەت ئەو زاتە خوێند، هەروەها مەلا ئەبوبەکری باپیری مەلا ئەفەندی هەولێر و مەلا محەممەدی خەتێ موفتی سۆران، فەقێی ئەو مامۆستایەنە، شێخ مصطەفای نەقشبەندی هەولێر (خوا لێی خۆش بی) دەیفەرموو: {مامۆستا عبدالرحیم زیارەتی ماوەك لە هەولێر دەرسی داوە لە مزگەوتێك، کە ئێستا مزگەوت و خانەقای شێخ ئەبوبەکر لە جێی ئەو دروست کراوە}.

مەلا قاسمی زیارەت – ئەویش لەو بنەماڵەیە – لە چاوپێکەوتنێك لەگەڵیدا، لە مانگی ئابی ساڵی ٢٠٠٤ز باسی کرد: {ئەو بنەماڵە بە ڕەچەڵەك دەچنەوە سەر پێشەوا (جەعفەری طەیار) برای حەزرەتی عەلی (خوا لێی رازی بی)، وە ئەو شێخ جەعفەرەی گومبەتی لەسەر گۆڕەکەی کراوە، نزیك (زیارەت) یەکە لە نەوەکانی پێشەوا جەعفەر}.

کۆچی دوایی: بەپێی نووسراوێك کە لامانە، ئەحمەدی عبدالرحمانی حوسێن دەڵێ: ساڵی ١٨٠١ز تەواوم کرد، لەو کاتە مامۆستا لە ژیان دا بوو، دوای ئەو بەروارە، کۆچی دوایی کردووە، عوسمان ئەفەندی سند قەسیدەکی لە مەتحی مامۆستا نووسیوە دەڵێ:

قصائد لم يطربن إلا لأنها — لها من علا عبدالرحيم مساند
أمام ذكا، فأضحى محله — له سمرت فوق السماك مصاعد
تجسد من علم فمن قال إنه — عباب ففيما قال لاحت شواهد

سەرچاوەکان:


١. حلية البشر ٢/ ٨٤٤.
٢. علماء ومدارس في أربيل ٩٠.
٣. علماونا في خدمة العلم والدين ٥٨٥.

## عبدالرحیم میرزا پەرخی (٧٢٠)

ناوی عبدالرحیمە، كوڕی میرزای كوڕی عبداللەی كوڕی خدرئاغای كوڕی محەممەد ئاغای كوڕی بابەكر ئاغای كوڕی مەولانا ئاغایە، دەچتەوە سەر (فەرخ ئاغا) كە لە گوندی (نورەدین) نزیك (قەلادزێ) باری كردیتەوە و گوندی (پەرخی) ئاوەدان كردیتەوە، ساڵی ١٩٠٧ز هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە لای مامی خەلیفە ڕەزا دەستی كرد بە خوێندن، ساڵی ١٩١٧ز چووە (ویلەدەر) لای مەلا عبدالرحیم، دوایی لە لایەن ئەو مامۆستایانە خوێندنی بردە سەر: سەید غەفور لە گوندی (شێخ وەیس)، مەلا صاڵح لە (هەڵەبجە)، شێخ عبدالكریم لە (ئەحمەدبرندە)، بابارەسول لە (عەبابەیلێ)، مەلا عەزیز لە (پرێس)، موفتی سولەیمانی، مەلا حوسێنی پسكەندی، پاشان چووە خزمەت شێخ عومەری قەرەداغی، ساڵی ١٩٣٥ز ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: یەكەم جار كرا (مدرس) لە (بەرزنجە)، ساڵی ١٩٤٤ز كرا مەلا، لە مزگەوتی شێخ سەلام لە (سلێمانی)، پاشان كرا ئەندامی ئەنجومەنی زانستی ئەوقاف، مامۆستا یەكەم كەس بوو هانی خەڵكانی دەدا بۆ دروست كردنی هۆڵی (تازییە) بۆ پاراستنی مزگەوتەكان، ئەوەبوو ساڵی ١٩٦١ز دەست بەوكارە پەسەندە كرا، ساڵی ١٩٧٥ز ڕژێمی بەعس بڕیاری گواستنەوەی دا بۆ خوارەوەی بەغدا، بەڵام مامۆستا نەچوو وازی لە فەرمانبەری هینا، خانەنشین كرا، وە لە ٢/٣/١٩٨٩ز كۆچی دوایی كرد، لەسەر وەسیەتی خۆی لە گۆڕستانی گردی سەیوان بە خاك سپێردرا.

بەشێك لە فەقێیەكانی: مەلا محەممەدئەمین سەعید زۆراب، مەلا محەممەدئەمین عبدالكریم، شێخ عومەر سەیدگوڵ هەشەزینی، مەلا محەممەد عبدالرحمان، مەلا غەفور بانەیی، مەلا فەرەج شەریف، مەلا سەعید شانەخسی، مەلا فتاح نەصراللە، مەلا عبداللە عبدالكریم فەرخی، مەلا صاڵح قادری كانی چنارەیی، مەلا عبداللە ئەحمەد شەریف.

سەرچاوە: خۆری ئیسلام، ژمارە ٩ / ٢٠٠٠ز صدیق عبدالرحیم

## عبدالرحیم هوشاری (٧٢١)

مامۆستا عبدالرحیم، خەڵکی گوندی (هوشار)ی، نزیکی (سەقز)ە، ساڵی ١٢٩٥ك – ١٨٧٨ز هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغی سوختەیی تەواوکرد، چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادر خوێندنەکەی بردەسەر، تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عومەر (ضیاءالدین) وەرگرت، گەڕاوە وڵاتەکەی خۆی، دەستی کرد بە مەلایەتی و دەرسدانەوە، خزمەتی ئاینی پیرۆز، لە دەوری ساڵی ١٣٦٣ك – ١٩٤٤ز کۆچی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدین ٢٩٠.

## عبدالرزاق رزق الله رەسعەنی (٧٢٢)

ناوی عبدالرزاقە، کوڕی رزق الله کوڕی ئەبوبەکری کوڕی خەلەف کوڕی ئەبولهەیجایە، خەڵکی (رأس العین)ی خاپورە، بۆیە ناوبراوە بە (ڕەسعەنی)، ساڵی ٥٨٩ك – ١١٩٣ز لەو گوندە هاتووتەدنیا، زانایەکی تەفسیر زان و شەریعەت زان بووە، لە وڵاتی خۆی خوێندووە، پاشان چوویتە (بەغدا)، لەوێ چوویتە (دیمشق)، لەوێ و چەند شوێنی تری خوێندووە، کتێبی (المقنع)ی لەبەر کردووە، زانستەکانی تەواو کردووە، گەڕایتەوە (موصل)، لەوێ کرایتە سەرۆکی زانکۆی (دارالحدیث)، لە لایەن خاوەنی موصل و مەلیکانی جزیرە زۆر بە حورمەت بووە، مامۆستا زمان ڕەوان و شاعیر بووە حەق گۆبووە، لەسەر بڕوایی زاناکانی پێشوو ڕۆیشتووە، لە نووسین دەستی باڵا بووە، ململانێی لەگەڵ زەمخشەری کردووە، ساڵی ٦٦١ك – ١٢٦٢ز کۆچی دوایی کردووە.

دانراوەکانی: (رموز الکنوز): تەفسیری قورئانی پیرۆزە لە چوار بەرگ و (مصرع الحسین) و (درة القارئ) و (مطالع أنوار التنزیل) و (مختصر في الفرق) و (القصیدة النونیة). لەگەڵ چەند دانراوی تری شەریعەت و عەروز و عەرەبی.

سەرچاوەکان:

١. طبقات المفسرین ١/٢٩٣ – ٢٩٥.

٢. شذرات الذهب ٥/٣٠٥ – ٣٠٦.

٣. معجم المؤلفين ٥/٢١٧ – ٢١٨.

٤. كشف الظنون ١/٤٥٢.

## عبدالسلام بانەیی (٧٢٣)

مامۆستا عبدالسلام، یەك بووە لە مەلایە چاکەکانی سەردەمی خۆی، لە دەوری ساڵی ١٢٦٠ك – ١٨٤٤ز لە یەك لە گوندەکانی (موکریان) هاتووتەدنیا، دوای تەواوکردنی خوێندنی، بووە مەلا لە دەوروبەری (سابلاغ)، لەوێ ناودەبردرا بە (شیخ الاسلام)، پاشان باری کرد بۆ (بانە)، دەرسی فەقێیانی دەداوە، تا ساڵی ١٣٣٦ك – ١٩١٧ز کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی هەبوو ناو (مەحمود) ئەویش دوو کوڕی هەبوون:

١. مەلا محەممەد: جێگری باوکی بوو.

٢. مەلا یەحیا: لای شێخ عومەری قەرەداغی خوێندنی تەواوکرد، گەڕاوە وڵاتی خۆی، ساڵی ١٣٥٥ك – ١٩٣٦ز کۆچی دوایی کرد، ئەویش دوو کوڕی هەبوو:

١. عبدالغفور: مەلای (گەورەدێ) بوو لە (چوارتا).

٢. عبدالرحمان: لە ١٢/١١/٢٠٠٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٩٠ – ٢٩١ – ٦٢٦ – ٦٢٧.

## عبدالسلام بێسارانی (٧٢٤)

مامۆستا عبدالسلام، لە نەتەوەی شێخ زەکەریای شازەلی یە، لە دەوری ساڵی ١٢٩٥ك – ١٨٧٨ز هاتووتەدنیا، زانایەکی ماقوڵ و بەڕێز بووە، داوای چاکەی کردووە، خەڵکی پاراستووە لە خراپە، خەڵکان بە گوێیان کردووە و لە قسەکانی دەرنەچوون، دەرسی داوە، مریدی شێخ حیسامەدین بوو، بەیانیان و ئێواران یادی خوای دەکرد لە دەوری ساڵی ١٣٥٥ك – ١٩٣٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٩١.

## عبدالسلام عبدالله بن تەیمییە (٧٢٥)

ناوی عبدالسلامە، کوڕی عبداللەی کوڕی خضری کوڕی عەلی کوڕی تەیمییە، ناسراوە بە (مەجدەدین) خەڵکی شاری حەڕانی جزیرەی بۆتانە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، ساڵی ٥٩٠ك - ١١٩٤ز لە شاری (حەڕان) هاتووتەدنیا، هەر لەوێ قورئانی پیرۆزی خوێند و لەبەری کرد، ساڵی ٦٠٣ك - ١٢٠٦ز لەگەڵ مەلا عبدالغنی مامی چووە (بەغدا)، لەوێ شەش ساڵان خەریکی خوێندنی شەریعەت و عەرەبی و حیساب و جەبر و موقابەلە و فەرائیز بوو، شارەزابوو لە تەفسیر و قورئان و ئوصول و نەحو، چووە (شام) ماوەك لەوێ دەرسی داوە، ساڵی ٦٥١ك چووە سەفەری حەج، لەوێوە گەڕاوە (بەغدا)، پاشان گەڕاوە (حەڕان).

ڕۆژی جێژنەی ڕەمەزان، دوای نوێژی هەینی، ساڵی ٦٥٢ك - ١٢٥٤ز لە (حەڕان) کۆچی دوایی کرد.

چەند کتێبی داناون، لەوانە: (أطرف أحاديث الرسول) و (أرجوزة في القراءات) و (الأحكام الكبرى) و (المنتقى في أحاديث الأحكام) و (المحرر في الفقه) و (المسودة في العربية) و (المسودة في أصول الفقه) و (منتهى الغاية في شرح الرواية).

سەرچاوەکان:


١. البداية والنهاية ١٣/١٨٨.
٢. فوات الوفيات ٢/٣٢٣.
٣. طبقات المفسرين ١/٢٩٧.
٤. هدية العارفين ٥/٥٧٠.
٥. كشف الظنون ٢/١٨٥١.
٦. معجم المؤلفين ٢/٢٢٧ /١٣/٣٩٧.
٧. شذرات الذهب ٥/٢٥٧.
٨. إيضاح المكنون ٢/٥٧٠.

٩. معجم أعلام الكورد ٤٢٨.
١٠. الأعلام ٢/٧٩ /٤/ ١٢٩ – ١٣٠ /١٠/ ١٢٦.
١١. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/٢٤٩ – ٢٥٤.

## عبدالسلام عبدالله بارزانی (٧٢٦)

ناوی عبدالسلامە، کوڕی مەلا عبداللّٰهیە، یەکێکە لە شێخەکانی بارزان، زانیاری تەسەووف و پاکی دەرونی لە شێخ سەید طاهای نەهری وەرگرتووە، دوایی سەفەری هەورامانی کرد بۆ زیارەتی مەولانا خالیدی نەقشبەندی، شێخ عبدالسلام خزمەتی ئاینی پیرۆزی کردووە، هەوڵی داوە کاروباری خەڵکانی ناوچەکە بەپێی شەریعەتی ئیسلام بچێتە سەر، نووسراوەکمان لە ناو کتێبە دەستنووسەکانی پەرتوکخانەی خۆمان دیتەوە کە نامەی ئەو شێخە بوو بۆ یەك لە مەلایە چاکەکانی ناوچەکەی نووسیوە، کە مەلا محەممەدئەمینە، بە مەبەستی وەڵامدانەوەی پرسیارەکی هاوڵاتییەك، دەربارەی شەریعەت[1].

مێژوونووس (ئەنوەرمائی) دەڵێ: {شێخ عبدالسلام فەقێی مەلا یەحیای مزوری بووە، حاشیەی لەسەر کتێبی (الأنوار) و باسی (حەیز) لە (توحفەی ئیبن حەجەر) هەیە}.
فەقێ محەممەد کوڕی ئەبوبەکری کوڕی دێوالی کوڕی ئیلیاس دەڵێ: {ساڵی ١٢٧٤ك – ١٨٥٧ز کتێبی (ئیساغۆجی)م نووسییە، لە مەدرەسەی شێخ عبدالسلام لە (بارزان).

شێخ عبدالسلام ساڵی ١٨٧٢ز، یا ساڵی ١٨٨٤ز کۆچی دوایی کردووە، (شێخ محەممەد)ی کوڕی جێگری بوو: ئەویش خەریکی خزمەتی ئایین و پەروەردەی گەلەکەی بوو، دوایی دوو زمان و هەناو پیس لە لایەن حکومەتی عوسمانی زمانیان لێ دا، بۆیە شێخ محەممەد دوورخراوە، ڕەوانەکرا بۆ شاری (بەدلیس) لە تورکیا، ماوەك ماوە لەوێ، دوایی گەڕاوە (بارزان)، ساڵی ١٩٠٣ز کۆچی دوایی کرد.

---

[1] ئەو نامەیە بە دیاری درا بە کاك مەسعود بارزانی لە سەردانەکە بۆ حوجرەی بەحرکە ساڵی ١٩٩٦ز.

کورەکانی شێخ محەممەدی کوڕی شێخ عبد السلام:

١. شێخ عبدالسلام: لە مەودوا باسی دەکەین - إن شاء الله -.

٢. شێخ ئەحمەد: ساڵی ١٩٣٢ز شۆڕشی ئازادبوونی کوردی سازدا، بەڵام حکومەتی عێراق بە پاڵپشتی فڕۆکەکانی ئینگلیز ناوچەکەیان بەردومان کرد، توانی شۆڕشەکە بمرێنێتەوە، شێخ ئەحمەد ئاوارەی تورکیا بوو، لەوێ ڕەوانەی عێراقیان کردەوە، گەڕاوە، دەستگیر کرا، ماوەك لە زیندانی شاری (حیللە) بوو، پاشان ڕەوانی شاری (سلێمانی) کرا و بەردرا، دەوری ساڵی ١٩٧٠ز کۆچی کرد.

٣. شێخ محەممەد صەدیق.

٤. شێخ محەممەد: ناسرابوو، بە (بابۆ)، ساڵی ١٩٧٥ز کۆچی دوایی کرد.

٥. مەلا مصطەفا: لە مەودوا باسی دەکەین - إن شاء الله -.

سەرچاوەکان:

١. البارزاني والحركة التحرريه الكردية ٣/٩٠ - ٩١.

٢. مصطفى البارزاني زعيم الحركة القوميه الكردية ٩٦ - ٩٧.

٣. إسهام علماء كوردستا العراق في الثقافة الاسلامية ٣١٠ - ٣١١.

٤. معجم أعلام الكورد ٤٢٩ - ٧١٠ - ٧١٢.

٥. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/٣٣.

٦. الاكراد في بهدينان ٧٩.

٧. تأريخ مشاهير كورد بە زمانی فارسی ٣/٥١٧ - ٥٣٤ - ٥٩٤.

## عبدالسلام عبدالعزیز نەصیبی ( ٧٢٧ )

ناوی عبدالسلامە، کوڕی عبدالعزیزی کوڕی خەلەفی کوڕی محەممەدی (نانموا)یە، خەڵکی شاری (نوصەیبینە)، مەزهەبی شافیعی بووە، کتێبی (التلخیص)ی لە بابەت شەریعەت داناوە، زانایەکی مەزن بووە، مامۆستا ئیبن صەلاحی شارەزوری فەرموودەی لەو زاتە گێڕایەتەوە.

سەرچاوە: هدیة العارفین ١/٥٧٠.

## عبدالسلام عومەر ماردینی (٧٢٨)

ناوی عبدالسلامە، کوڕی عومەری کوڕی محەممەدی حەنەفییە، ساڵی ١٢٠٠ك – ١٧٨٥ز هاتووتەدنیا، موفتی شاری (ماردین) بووە، ساڵی ١٢٥٩ك – ١٨٤٣ز کۆچی دوایی کردووە.

چەند کتێبی دناون، لەوانە: (أسماء رجال الحدیث) و (أم العبر في التأریخ) و (خلاصة المنطق) و (الشافي في العروض والقوافي) و (مختصر معاهد التنصیص) و تەفسیری سوڕەتی (فاتحە) بە پیتی بێ نوختە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ٥/٢٢٩.

٢. هدیة العارفین ٥/٥٧٢.

٣. ایضاح المکنون ١/١٢٧.

٤. معجم أعلام الکورد ٤٢٩.

## عبدالسلام محەممەد بارزانی (٧٢٩)

ناوی عبدالسلامە، کوڕی شێخ محەممەدی کوڕی شێخ عبدالسلامی بارزانی یە، ئەوە شێخ عبدالسلامی دووەمە، یەکە لە شێخەکانی ناوداری ئەو بنەماڵە، داوای لە حکومەتی عوسمانی کرد مافی گەلی کورد بدات، زمانی کوردی بکرێ بە زمانەکی بڕواپێکراو، وە ئەو ناوچانەی کورد لێی دادەنیشن، خەڵکەکانیان کوردن، بەڕێوەبەریان کورد بی، بێگانە خاوەن دەسەلات نەبی لەسەر کورد، حکومەتی عوسمانی بەرانبەر ئەو هەمو داوایە ڕەوایانە، خۆی لە گێلی دا، هیچ گوێی پێ نەدا، وای زانی (شێخ) بە نیازە کورد جیابکاتەوە لە عێراق، واتە: داوای سەربەخۆیی دەکا، بۆیە لە کۆتایی ساڵی ١٩٠٧ز لەشکرێکی گەورەی بە سەرۆکایەتی (محەممەد فاضل داغستانی) ناردە سەر،

بۆوەی شەڕ نەکەوێتە ناو ماڵ و منداڵ (شێخ) ناوچەی بارزانی بەجێهێشت، چووە (ئێران)، لای سەید طاها شێخ محەمەد صەدیق نەهری دابەزی.

کە (تورکەکان) پێیان زانی تاخمەك چوونە سەری لە کاتی نووستن و بێ ئاگایی، شێخ و هەموو داردەستەکانیان دەستگیر کردن، لەگەڵ خۆیان بردن بۆ (موصل)، لەوێ دادگایان بۆ دامەزراندن، بە سەرپەرشتی سولەیمان پاشا نەزیف، بڕیاری لە سێدارەدانیان دەرچوو، لەبەرورای ١٤/١٢/١٩١٤ز ئەنجام درا.

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ٤٢٩.
٢. شۆڕشەکانی کورد ١٤٨ – ٢٤٥.
٣. تأريخ مشاهير كورد به فارسى ٣/٥١٧ – ٥٣٤ – ٥٩٤.
٤. البارزاني والحركة التحررية الكوردية ٣/٩٠ – ٩١.
٥. الأكراد في بهدينان ١٩٢.
٦. إسهام علماء كوردستا العراق في الثقافة الإسلامية ٣١١.

## عبدالسلام مراد جزیری (٧٣٠)

ناوی عبدالسلامە، کوڕی مرادی کوڕی عبدالسلامە، خەڵکی جزیرەی بۆتانە، ساڵی ١٨٧٨ز چاوی خۆی هەڵهیناوە لە دونیا.

خوێندنی: لە شاری (جزیرە) دەستی کرد بە خوێندن، هەر لەوێ لە لایەن مەلایە چاکەکانی ئەو سەردەمی خوێندنەکەی بردە سەر، لە کۆتایی دا ئیجازەی مەلایەتی لە مامۆستا محەمەد بەشیر عەلی جزیری و مامۆستا شێخ محەمەد سەعید جزیری وەرگرت، بووە مەلا لە شاری (جزیرە)، کاروباری مەلایەتی ئەنجام دەدا، لە مەدرەسەی (حمرا) کە جێگای شێخ ئەحمەدی جزیری یە دەرسی دەدا، هەروەها لە مەدرەسەی (میرئافدەل) کە گۆڕی مەم و زینی لێ یە دەرسی دەدا.

بەشێك لە فەقێیەکانی:

١. مەلا عبدالرحیمی عبدالرحمانی (وسطانی): شەرحی دیوانی شێخ ئەحمەدی جزیری کردیە.

٢. مەلا ڕەمەزانی (بۆت) باوکی دکتۆر محەممەد ڕەمەزان بۆطی یە.

هۆی کۆچ کردنی بۆ سوریا: مصطەفا کەمال پاشای سەرۆکی تورکیا، بە چاوی دوشمنایەتی تەماشای کوردەکانی دەکرد، بە تایبەت ئەوانەی ناسراو و لێهاتوو بوون، زۆر ئازاری دەدان، ئەوانیش نەحەوانەوە، بەلاوبوون، هەریەك بە لایەك داچوو، مامۆستا چونکە هەستی نەتەوایەتی لە دڵدا بوو، ناچار پەڕاگەندە بوو، بۆ (سوریا) لە (عنـدیور) نیشتەجێ بوو، دوایی چووە شاری (دیرك) دەستی کرد بە دەرسدانەوە، وە لە ساڵی ١٩٤١ز ناکۆکی پەیدا بوو، لە نێوان موسوڵمانان و مەسیحییەکانی ئەو ناوچە، بە پشتگیری ئینگلیز مەسیحییەکان چەند گوندی موسوڵمانانیان سووتاند، ماڵی مامۆستاشیان ئاگر تێ بەردا، شمەك و کەل و پەل و کتێبەکانی هەموو سووتان، بۆیە باری کرد بۆ (قامیشلی)، لە ١٩٨٢ز کۆچی دوایی کرد مامۆستا جگە لە مەلایەتی ئەدیب و نووسەر و شاعیریش بووە، زمان ڕەوان بووە لە کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی، دەڵێن دیوانی شیعری هەبووە، بەڵام نەماوە، شەرحی دیوانی شێخ ئەحمەدی جزیری کردووە، بە عەرەبی دوو بەرگە لە ٢٠٠٤ز لە (هەولێر) چاپ کرا.

سەرچاوە: شرح دیوان الشیخ الجزیري ١٥ – ١٩.

## عبدالسمیع ئەحمەد چنارەیی (٧٣١)

ناوی عبدالسمیعە کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەلی کوڕی فاضیلي کوڕی نیظامەدینە، خەڵکی (چنار)ی سەر بە (هەڵەبجە)یە، دەستی کرد بە خوێندن، دوای قۆناغی سوختەیی چووە لای مەلا عبداللە ی جەلی زادە لە (کۆیە)، دوایی چووە لای مەلا عبدالقادری بیارە، پاشان هاتە (هەولێر) ساڵی ١٣٠٢ك– ١٨٨٤ز لە لای مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی لە مزگەوتی قەڵات مەنتیق و فەلەکیاتی تەواوکرد، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

ساڵی ١٣٠٤ك کتێبی (المعفوات)ی مەلا خەلیلی سعێرتی لە گوندی (وەرە) نووسیەوە، هەر لەو ساڵە لە مزگەوتی شێخ عبدالرحمان شێخ ئەبوبەکر، لە (سلێمانی) (الاستعارە)ی مەلا ئەبوبەکری میررۆستەمەی نووسییەوە، ساڵی ١٣١٠ك لە گوندی (حاجی قەرە) کتێبی (سیف الله)ی دانراوی مەلا محەممەدی کوانەدولی نووسیەوە.

لە ساڵانی ١٣١١ك – ١٣١٤ك لە (کەرکوك) و لە (بیارە) کۆمەڵێك کتێبی نووسیەوە ساڵی ١٣١٥ك – ١٨٩٧ز چووە (حەلەب) لەوێ لە قوتابخانەی (ئەحمەدییە) کە تایبەت بوو بە قوتابیانی کورد کرا (مدرس)، شێخ ڕاغیب خاوەنی کتێبی (أعلام النبلاء بتاریخ حلب الشهباء) مەنتیق و فەلەکیاتی لە لای ئەو دەخوێند، لە مانگی (محرم)ی ساڵی ١٣٣٨ك – ١٩١٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الکورد و کوردستان ٢/٢٧٧.
٢. تأریخ مشاهیر کورد ٢/١٦٠.
٣. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٧/ ٨ – ١٥ – ٢٣ – ٢٧.
٤. معجم أعلام الکورد ٤٣٠.

### عبدالسمیع سولەیمان بانەیی (٧٣٢)

ناوی عبدالسمیعە کوڕی سولەیمانی کوڕی ئیبراهیمی بەرزنجی یە، ساڵی ١٢٦٤ك – ١٨٤٨ز لە ناحیەی (سویل) هاتە دونیا، لە کوردستانی عێراق دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە گوندی (حەمزەلان)ی ئێران، لە گوندی (هێمن ئاباد) ژنی هێنا، ساڵی ١٢٩٥ك بووە مەلا، لە گوندی (ئەنجینە)ی ئیبراهیم، ساڵی ١٣٠٢ك – ١٨٨٤ز چووە (بنەخوێ)ی نزیك (بانە)، ساڵی ١٣٠٧ك چووە حەج، تەریقەتی قادری لە کاك ئەحمەدی شێخ وەرگرتیە.

دانراوەکانی:

١. عەقیدەی کوردی: سەرەتایەکەی (ئەووەل ئیبتیدا بە ئیسمی الله) یە، لە کۆتایی دەڵێ: (سەمیع گوناهکار ئیلتیجا دەکا .... بۆ فاتیحایەك صەد ڕەجا دەکا)، شێخ مەعروفی سیاگۆزی بەسەردا چوویتەوە و لەسەری زیاد کردووە.

٢. نامیلکەی نیکاح بە زمانی فارسی.

٣. هۆنراوەی تەجوید بە کوردی، سەرەتایەکەی ئەوەیە:

حەمدی بێ حەد لایقە بۆ خالیقی فەردی موعین

ناردی قورئان بۆ رەسولی، (رحمة للعالمین)

لە کۆتایی دا دەڵێ:

هەر کەس بخوێنێ ئەم نەظمە نەڵێ: ڕەبطی نیە

عوزری مەسموعە (سەمیعە) چونکە تازە ناشییە

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ١/١١٥ – ١١٧ /٥/٣٠٣.

٢. تاریخ مشاهیر کورد ٢/٣٢ – ٣٣.

## عبدالصمد حەسەن بەرزنجی (٧٢٣)

ناوی عبدالصمدە کوڕی حەسەنی کوڕی محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی بابارەسولی بەرزنجی یە مەزهەبی شافیعی بووە، ئەهلی تەسەووف بووە، لە لای مەلا محەممەدی (ابن الحاج)ی خوێندووە، شێخ مەعروفی نۆدەیی گەلێ مەتحی کردووە، زۆر بە دین بوو، بە جگە لە یادی خودا زمانی نەدەجوولا، ساڵی ١٢٢٠ك – ١٨٠٥ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی:

١. حاشیە لەسەر سیوطی شەرحی ئەلفیە.

٢. شەرحی دلائل الخیرات.

٣. مثلثات قطرب: هۆنراوەیە.

٤. تحفة الطلاب: هۆنراوەیە.

٥. باسی شێخەکانی تەریقەتی قادری هۆنراوەیە.

سەرچاوەکان:

١. إيضاح المكنون ٣/٢٥٢ – ٤٧٦.

٢. هدية العارفين ٥/٥٧٤ – ٥٧٥.

٣. إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الاسلامية ٨٣.

٤. معجم المؤلفين ٥/٢٣٥.

٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٩٢.

٦. معجم أعلام الكورد ٤٣٠.

## عبدالصمد عومەر دینەوەری (٧٣٤)

ناوی عبدالصمدە، کوڕی عومەری کوڕی محەممەدی کوڕی ئیسحاقە، خەڵکی (دینەوەر)ە، دەرسی لە لای (ئەصطەخری) و چەندان زانایان خوێندووە، زانایەکی بە دین و بڕوا پێکراو بووە، ڕاستگۆ بووە، ئامۆژگاری خەڵکانی کردووە، نانی دەستی خۆی خواردووە، شەریعەت زان بووە، دەرسی فەرموودەی داوە، لە ٢٧ی مانگی ذي الحجة ساڵی ٣٩٧ك – ١٠٠٧ز لە (بەغدا) کۆچی دوایی کرد، دەگێڕنەوە لە کاتی سەرەمەرگ هاواری دەکرد: {گەورەم بۆ ئەو کاتەم هەڵگرتووی}.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١١/٣٥٥ – ٣٥٦.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٩١ – ٢٩٢.

## عبدالصمد هەجیجی (٧٣٥)

مامۆستا عبدالصمد، لە دەوروبەری ساڵی ١٢٦٠ك – ١٨٤٤ز لە گوندی (هەجیج)ی ناوچەی (مەریوان) هاتووتەدنیا، دەستی بە خوێندن کرد، وازی نەهێنا تا

کۆتایی پێ هێنا، ئیجازەی وەرگرت، بووە مەلا لە گوندی (بالك)ی ناوچەی (مەریوان)، کاروباری مەلایەتی جێبەجێ دەکرد دەرسی دەداوە، ساڵی ١٣٢٢ك – ١٩٠٤ز کۆچی دوایی کرد..

کوڕەکانی: (مەلا عارف): پێش نوێژ بوو لە خانەقای (دورود) و (مەلا عبدالخالق) و (میرزا ڕەشید) و (مەلا عبدالواحید) و (ئەحمەد): ساڵی ١٣٣٤ك – ١٩١٥ز بە دەستی ڕووسەکان نزیك گوندی (کاکۆ زەکەریا) شەهید کرا.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٩٢ – ٢٩٣.

## عبدالله ئیبراهیم حەڕانی ( ٧٣٦ )

ناوی عبدالله یە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی ئەحمەدە، خەڵکی (حەران)ە، لەسەرەتاوە مەزهەبی شافیعی بووە، لە (حەلەب) دابەزی، لە لایەن شافیعییەکان چەند پلە و پایەی پێ درا، کرا قازی (ثەغر)، پاشان هاتە سەر مەزهەبی حەنبەلی، بۆ حەنبەلییەکان لە (حەلەب) کراوە قازی، چەند جار لادرا و چەندجار دەهێندراوە، بەڵام هەر بە چاکە باسی دەکرا، خەڵك لێی ڕازی بوون، لە مانگی شەعبانی ساڵی ٨٢٧ك – ١٤٢٤ز کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٧/١٥١.
٢. الضوء اللامع ٣/٥.
٣. معجم أعلام الكورد ٣٨٧.

## عبدالله ئیبراهیم ( خەطیب ) ( ٧٣٧ )

ناوی عبدالله یە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عەلی کوڕی محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی غیاثە، یەکە لە زانایەکانی صەدەی حەوتی کۆچی، دوای عوسمانی کوڕی عبدالله لە مزگەوتی گەورەی قەڵاتی (هەولێر) وتارخوێن بووە، شاعیر و زمان ڕەوان بووە، هەر خۆی ووتارەکانی دادەڕشت، داخەکەم ئەو زانایە مەزنە تەنیا یەك چاوی هەبوو، ئەوی تری نەمابوو.

سەرچاوە: تأريخ أربيل ١/٢٥٢.

## عبدالله شێخ ئەبوبەکر هەرشەمی (٧٣٨)

ناوی عبدالله یە، کوڕی شێخ ئەبوبەکری کوڕی مەلا محەممەدی هەرشەمی یـە، لـە خانەقای خۆیان لـە (هەولـێر) خوێندوویەتی، هەر لەوێ لەژێر چاودێری بـاوکی پـەروەردە بووە، ماوەکیش چوویتە (بجیـل)ی سورچـیان لای مـەلا سـەید عبـدالکریمی هـەورامی – مریدی باوکی –، پاشان باوکی ناردیە شاری (بەصـرە) بـۆ ئامۆژگـاری و ڕێ نیشـاندان لەسەر داواکاری خەڵکەکە، دوایی گەڕاوە هەولێر، ساڵی ١٩١٠ز باوکی کۆچی دوایی کرد، شێخ محەممەدئەمینی برا گەورەی لە شوێنی باوکی دانیشت، ساڵی ١٩١٥ز ئـەویش کۆچی دوایی کرد، (شێخ عبدالله) کرا جێگری، ئەویش کۆچی دوایی کرد، دوو کـوڕی هەبوون:

١. شێخ عبدالقادر: لە لای شێخ مصطەفای مامی خوێند، پاش کۆچی دوایی باوکی لـە شاری (بەصرە) و دەوروبەری تەریقەتی نەقشبەندی بەلاوەکردەوە، ئەویش کۆچـی دوایی کرد، لە قەزای (زوبێر) نزیك گۆڕی شێخ حەسەنی بەصری بە خاك سـپێردرا چەند کوڕی هەبوون: بورهان، عومەر، عوسمان، ئەحمەد، عبدالحمید، ناجی، محیەدین، یەحیا، عاصم.

٢. شێخ محەممەد: لە خانەقای خۆیان لە هەولێر خوێنـدی و پـەروەردە بـوو، مـاوەکیش چووە (بنەسراوەی گەورە) لای مەلا ئەحمەدی ئاشۆکانی، دوا عـەمری لـە هـۆدەکی تایبەت بە خۆی لە مزگەوتی شێخ مصطەفا دادەنیشت، چەند کتێبـی نایـابی هـەبوو، لە بەرواری ٢٧/٤/١٩٩١ز کۆچی دوایی کرد، سێ کوڕی هەبوو: شـێخ فـاروق، دکتۆر فەیصەڵ، ئەندازیار فاخیر.

## عبدالله ئەحمەد بەندەنیجی (٧٣٩)

ناوی عبدالله یە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەسکەرە، خەڵکی شـاری (بەنـدەنیج – مەندەلی یە) لە (بەغدا) دەرسی فەرموودەی دەداوە، پاشان کرا سەرۆکی قازیان.

سەرچاوە: الأنساب ١/٤٢٣.

## عبداللە ئەحمەد حەیدەری (٧٤٠)

ناوی عبداللە یە، کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا حەیدەری دووەمە، مامۆستایەکی زۆر شارەزا بووە، لە هەموو جۆرە زانستەکان ئاگاداربووە، دەریای زانینی بە کەس پڕنەکراوە، مێرگ و مێرغوزاری زانیاری هەموو کات گوڵی پشکوتووە، هەر چوار وەرزی ساڵ لە لای ئەو هەر بەهار بووە، هەرچەند وەك باوك و باپیرانی خەریکی دەرسدانەوە نەبووە، بەڵام لە چ لایەك پەکی نەکەوتووە، بەو بیرە تیژەی خۆی خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلامی کردووە، مامۆستا کوڕێکی ناو ئەحمەدی هەبووە، ئەویش کوڕێکی ناو عبداللەی هەبووە، ساڵی ١٢٣٧ك - ١٨٢١ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٢٩.

٢. علماء ومدارس في أربيل ٤٤.

## عبداللە ئەحمەد ڕەبەتکی (٧٤١)

ناوی عبداللە یە، کوڕی ئەحمەدە، خەڵکی گوندی (ڕەبەتك)ە، سەر بە ناحیەی مزوری پارێزگای (دهۆك)، ساڵی ١٠٦٠ك - ١٦٥٠ز هاتوتەدنیا، مەزهەبی شافیعی بووە تەریقەتی (قادری) بووە، خوارزای مەلا ئەبوبەکری (مصنف)ی چۆڕییە، پاش تەواوکردنی خوێندنی، چووە شاری (موصل)، لەوێ کرا موفتی و دەرس بێژ، حەزی لە دەرس دانەوەی تەفسیر و فەرموودە بوو، شێخ موسای حەدداد چووە لای بۆ خوێندنی دەرسی حیکمەت، مامۆستا فەرمووی: {من پێم خۆشە دەرسەك بدەم، بڵێم پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی، نەوەك ئەو دەرسە بدەم بڵێم ئەرەسطو وای گوتووە، بڕۆ بۆ لای یەکی دی}، ئەمجا چووە لای مەلا صبغەاللەی حەیدەری.

دانراوەکانی:

١. زواهر الزواجر: کورت کرایەوەی زەواجیری ئیبن حەجەرە.

٢. المنهاج في بيان أحكام العُشر والخراج.

٣. مختار الزواج في شرح المنهاج.

٤. هدى الحكام الى خير الأحكام.

٥. منظومة الأشكال الأربعة: مەنتیقە.

٦. رسالة في بيان الطائفة الرافضة: دەربارەی زەیدییەکانە، ساڵی ١١٤٣ك – ١٧٣٠ز تەواوی کردووە، پێشکەشی بە ئەحمەد پاشا کردووە، پاشان باش مەلای (موصل) محەممەد ئەمین عومەری بە نامیلکە ڕەددی دایەوە.

٧. قەسیدە: پێش کۆچی دوایی دایناوە.

کۆچی دوایی: ساڵی ١١٥٩ك – ١٧٤٦ز لە تەمەنەکی درێژ و پڕ خێر، کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی:

١. شێخ عبدالغفور: مامۆستا بوو لە زانستەکانی قورئانی پیرۆز.

٢. مەلا یاسین: شەرع زانی مەزهەبی شافیعی بوو، دەرسی دەداوە، ساڵی ١٢٠٥ك – ١٧٩٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:


١. بوژاندنەوە ٢/٣٥١ – ٣٥٧ /٣/١٤٥ – ١٤٨.

٢. هدية العارفين ٥/٤٨٢.

٣. إيضاح المكنون ٤/٥٨٢.

٤. معجم المؤلفين ٦/٢٤.

٥. مشاهير الكورد ٢/٤١.

٦. الأكراد في بهدينان ١٩٠ – ١٩١.

٧. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٤٩.

٨. معجم أعلام الكورد ٣٩٨.

٩. منهل الأولیاء ٢٥١ – ٢٥٢.

١٠. رسالة كفر الرافضة/ به لێكۆڵینەوەی حەمدی سەلەفی.

## عبدالله ئەحمەد ڕێكانی (٧٤٢)

ناوی عبدالله یە، كوڕی مەلا ئەحمەدە، عەشیرەتی (ڕێكانی)یە، مەزهەبی شافیعی بووە، لە شاری (زاخۆ) و دەوروبەری موفتی بووە،، كتێبی دانراوی خۆی و حاشیەی لەسەر كتێبانی خوێندن هەیە، ساڵی ١٢١٠ك – ١٧٩٥ز كۆچی دوایی كردووە.

سەرچاوەكان:

١. غاية المرام ١٠٨.

٢. معجم أعلام الكورد ٣٨٨.

٣. مشاهير الكورد ٢٨٩.

## عبدالله ئەحمەد قامیشی (٧٤٣)

ناوی عبدالله یە، كوڕی مەلا ئەحمەدی كوڕی مەلا عەبباسی، خەڵكی گوندی (قامیشە) سەر بە (ماوەت)، لای مەلا محەممەدئەمینی برای دەستی كرد بە خوێندن، دوایی پێكەوە چوونە لای مەلا عبداللهی جەلی لە (كۆیە)، مەلا محەممەدئەمینی برای زوو خوێندنی تەواوكرد، گەڕاوە (ماوەت)، مەلا عبدالله ڕووی كردە هەولێر لە مزگەوتی قەڵا لای مەلا ئەبوبەكر ئەفەندی تەواوی كرد.

دەستنووسەكانی: (توحفەی ئیبن حەجەر): هەر چوار بەرگ و (مختصری تەفتازانی) و (شەرحی عەوامیل): ساڵی ١٩١٠ز لە گەلالەی شینكایەتی نووسیتیەوە و چەند كتێبی مەنتیق و چەند كتێبی (بەیان).

مامۆستا دانراوی هۆنراوەی خۆی هەیە، لە باسی (اسم المصدر) دەڵێ:

وإن ترد تعريف إسم المصدر فذاك نظم القامشيّ الأشهر

مەلایەتی: پاش تەواوكردنی خوێندنی، بووە مەلا لە گوندی (سەرسیانی) ڕەسول ئاغا، ساڵی ١٩١٠ز باری كرد بۆ گەلالەی شینكایەتی، ماوەی هەشت ساڵان لەوێ

ماوە، دوایی چووە (قەشەن)، ساڵی ١٩٢٠ز چووە (پشدەر) لە گوندانی: (کەستانە) و (بێناسیّ) و (نورەدین) مەلا بوو، پاشان باری کرد بۆ (قەلاّدزێ)، ساڵی ١٩٢٥ز کە ئینگلیزەکان ئەو شارەیان بۆمباباران کرد مامۆستا ئاوارە بوو، بۆ (گەرمیان) و (مرە) و (درونە).

مامۆستا شێست ساڵان خەریکی دەرسدانەوە و فەتوای شەرعی و جێبەجێ کردنی کاروباری ئاینی بوو، بۆ کێشەکان خەڵکی ناوچەکە، هانایان دەبردە بەر ئەو، دوا تەمەنی چووە گوندی (گردمەند)ی بیتوێن، ساڵی ١٩٥٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: پەیامی زانایان، ژمارە ١١/ ١٢٣ – ١٢٨.

## عبدالله ئەحمەد گرتکی (٧٤٤)

ناوی عبدالله یە، کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی عبدالخالقی کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی مەلا ئادەمە، لە دەوروبەری ساڵی ١٨٦١ز هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، ماوەك لە (ڕۆستێ) ماوە، دوایی چووە (خەتە)، خوێندنی تەواوکرد، بووە مەلا لە (گرتك)، مامۆستا مەلا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی دەڵێ: {لەوانە، ئەوەی ئەو زەمانە، واتە ساڵی ١٩٢٥ز هەموو زانستەکانی هەوراز بلێتەوە، ئیجازە بە فەقێیانی قۆناغی سەرەوە بدا، دوو کەسن: یەکیان مەلا عبدالله ی گرتکی یە، کە ئێستا لە (پەسوە)ی لاجان مودەرریسی قەرەنی ئاغای مامەشە، ئەوی تر مەلا محەممەد ڕەشید بەگی مەریوانە}.

مامۆستا زاتەکی سەخی و بەدڵ بووە، ڕەشید بووە، ناهەقی قەبول نەکردووە، یارمەتی هەژارانی داوە، ساڵی گرانی ١٩١٧ز دز و جەردە لە (گرتك) زۆربوون، مامۆستا لەگەڵ فەقێیەکان شەوان دەستیان دەدا چەك، تا بەیانی پاسەوانی گوندەکەیان دەکرد، هەروەها لە جەنگی دژ ڕوسیای داگیرکەر، مامۆستا لەگەڵ محەممەد هەویلانی و شێخ وەهابی پیرەسنی سەرلەشکری سوپای کوردی موسوڵمان بوو.

مامۆستا لەگەڵ بەگەکانی مەلا شەرەفی – کە حوکمداری ناوچەکە بوون – ناکۆکی لی پەیدابوو، بۆیە باری کرد بۆ ناوچەی (لاجان)، لەوێ لە گوندی (پەسوە) لای

سەرۆکی مامەشان – قەرەنی ئاغا – بووە مەلا، لە دەوری سالّی ١٩٢٦ز لە (مهاباد) کۆچی دوایی کرد.

سێ کوڕی هەبوو: (مەلا عەلی): مەلای گوندی حەمامیان بوو و (مەلا محەممەدئەمین) و (مەلا عبدالرحمان).

سەرچاوەکان:

١. یادی مەردان ٢/٥٢٢ – ٥٢٣.

٢. بنەماڵەی بەناوبانگی ڕواندز ٧٧ – ٨٣.

## عبدالله ئەحمەد محەممەد تەکیەیی (٧٤٥)

ناوی عبدالله یە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی شێخ محەممەدە، لە دەوری سالّی ١٣٠٣ك – ١٨٨٥ز لە گوندی (تەکیە) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە (ئەحمەد برندە) و (بیارە) و (عەبابەیلیّ) و (سلێمانی)، لای شێخ بابەعەلی و مەلا قادر خوێندنەکەی بردەسەر، سالّی ١٣٣٠ك ئیجازەی لە مەلا قادر وەرگرت، گەڕاوە (تەکیە) دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی، دەرسدانەوەی فەقێیان، پاشان چووە (سێوسێنان) دوایی گەڕاوە (تەکیە).

دانراوەکانی:

١. شەرحی تەصریفی مەلا عەلی.

٢. چەند حاشیە لەسەر (جمع الجوامع).

٣. شەرحی هۆنراوەی (زبدة المعاني، في البيان والبديع والمعاني)ی ئیبن شوحنە.

دەڵێن: چەند زەوی بەراوی هەبوو، نیو سەعات لە گوندەکە دووربوو، کە دەچووە سەردانی زەوییەکە، بە پێ خواسی دەڕۆیشت، پرسیاریان لێ دەکرد، بۆچی؟ وەڵامی دەداوە: {پێلاوەکەم بە پارەی مزگەوت بۆ کڕاوە بۆ نوێژ و کاری مزگەوتی لە پێ دەکەم، نابی بۆ ئیشی خۆم بەکاربینم}، وە دەڵێن: چەندجار لە خەودا بە خزمەت پێغەمبەر (د.خ) گەیشتووە، لە یەك لەو جارانە دەڵێ: {لە خەو کتێبی گەلەنبەوی

ئادابم بە یەك دەرس لە خزمەت خوێند یەك یەك پەڕەکانی بە پەنجەی پیرۆزی وەردەگێڕا تا تەواوبوو}، وە دەڵێن: باغێکی هەبوو، هەر شتلەکی دەیچاند سورەتی (یاسینی) لەسەر دەخویند.

کۆچی دوایی: ئەو زاتە لە (٥)ی مانگی مەولودی ساڵی ١٣٦٧ك – ١٩٤٨ز کۆچی دوایی کرد، لە نزیك گۆڕی ئیمام هەمزە کە لە گۆڕستانێکی ئەو دەڤەرەیە بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: بنەماڵەی زانیاران ٢١٩ – ٢٢١.

## عبدالله ئەسعەد جەلی زادە (٧٤٦)

ناوی عبدالله یە، کوڕی مەلا ئەسعەدی کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی مەلا عبدالرحمانی جەلییە، لە ٢٢ مانگی شەووال ساڵی ١٢٥٠ك – ١٨٣٤ز هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە لای مامۆستایان: شێخ طاهای سورسوریێ، مەلا محەممەدی خەتێ، مەلا محەممەدی کاك عبداللەی شێخ وەتمانی، ماوەکیش لەگەڵ حاجی قادری کۆیی چوونە لای مەلا ئەحمەدی کوڕی (ئیبن ئادەم)، پاشان هاتەوە خزمەت باوکی زانستەکانی تەواوکرد.

ساڵی ١٨٧٦ز چووە (بەغدا) پیاوماقولانی شارەکە وەکو: نەقیب سەید سولەیمان، موفتی زەهاوی، دەروێش حەیدەری، جەمیل زادە ئەفەندی، ڕێزیان گرت، هەروەها لەوێ لەگەڵ کاك ئەحمەدی شێخ یەکتریان دیت و برادەراتیان بتوون بوو، گەڕاوە (کۆیە)، ساڵی ١٨٧٧ز بەشداری جەنگی دژ بە ڕوسیای کرد، ساڵی ١٨٩١ز ناکۆکی لەنێوان حکومەتی عوسمانی و حکومەتی ئێران پەیدابوو، لەسەر فەرمانی سوڵتان عبدالحمید خان مامۆستا لەگەڵ عبدالله پاشای ڕواندز بۆ ئەو مەبەستە چوونە (مهاباد)، هەردوولایان ڕازی کرد، بۆیە لە لایەن هەردووك حکومەت (کاسی) شەرەفیان بۆ هات.

مامۆستا هەموو هێزی خۆی لە دەرسدانەوە بەکاردەهینا، ڕۆژ وابوو بیست و چوار دەرسی فەقێیانی دەداوە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا محەممەدئەمینی (کونەفلوسە)، مەلا عوسمانی شەوەکی (مەلای بەحرکە)، مەلا عبدالحمید مەلا طاهیر (مەلای دهۆك)، مەلا یاسین ئەفەندی بریفکانی، مەلا ئەحمەد ئەفەندی ئامێدی (نەوەی مەلا یەحیای مزوری)، مەلا خضری بەرزنجی، مەلا ئەحمەد بەهائەددین کۆیی، مەلا محەممەد (کوڕی خۆی)، مەلا محەممەد ڕەسول ئاغا وەرتی، مەلا عەلی باداوە.

لە مەتحی مامۆستادا گوتراوە:

دەفتەری ئەهلی هونەر بگرن ئەگەر لەم عەسرەدا

مالّی بێ ئیقبال نەبی (والله) جەلی سەردەفتەرە

هەروەها، حاجی قادری کۆیی، دەڵێ:

بە غیری جەددی ئێوە کێ یە دانا؟ لە کوردستان بناغەی عیلمی دانا

(دانا)ی یەکەم بە مانا: مەلای چاکە، (دانا)ی دووەم بە مانا: دامەزراندنە، لە نێوان هەردوو وشە، لە جۆری (بەلاغە) جوانکاری (الجناس التام) هەیە، هەروەها (رد العجز علی الصدر)ی تێدایە، بۆیە ئەم شیعرە کە دەبیستی تام و بۆی تایبەتی لێ هەست دەکەی، ئایا شیعرەکانی شاعیرەکانی ئەو سەردەمەش ئەوها خەستن لە وردەکاری؟ لە کێشان دەردەچن لەگەڵ سەنگەکانی عەروز و قافیە؟

مامۆستا سەفەری (بەغدا)ی کرد، لەوێ ناسیاری لەگەڵ شێخ عومەری (بیارە) پەیداکرد، یەکدیان خۆش ویست، پاش گەڕانەوەیان (شێخ عومەر) نامەکی بۆ دەنووسی بە مەلا (عبدالصمد)ی شێواشان، ڕەوان دەکا، دەقی نامەکە:

دەمێکە کاغەزت نایەتە لامان، عەجەب سستی لە پەیغام و سەلامان

(جەلی) داییم دەبی جیلوەی دیاربی لەنێو گێژاوی شەت بی یا کەنار بی

(عومەر) عومرێکە بۆ تۆ ئینتیزارە لە شەوقی توو، وەکو ئاو بێ قەرارە

دەقی وەڵامی مامۆستا مەلا عبدالله ی جەلی:

ئەمرنامەت بە دۆستی گۆجی موخلیص گەیشتە دەستی سستی عەبدی موفلیس

لە پاش بۆسیدەن و بۆییدەنی تام — نیامە سەر سەر و چاوم، بە ئیکرام
نیگاهم کرد، هەموو لوتف و عیتاب بوو — بە هەم ئامێژەشی قشر و لوباب بوو
سەلامی من چی یە بۆ توو بنێرم ؟ — ئەتوی عەذب و فورات من تاڵ و سوێرم
(جەلی) ئیسمم خەف ڕەسمم دوو ڕەنگی — میسالی مەسئەلەی کافور و زەنگی
سوهای بێ چارە قوربان چۆن دیارە؟ — کە وەعدەی شەعشەعەی (شمس النهار)ە
(عومەر) عومرێکە گەر مەیلی بەلامە — ئەدی بۆ مەرکەزی دەرد و بەڵامە
حەیاتم من لە دووری تۆ مەماتە — عەجاییب نیسبەتێك و ئیرتیباتە
هەموو عومرم، بە پاییز چوو لە هیجران — بەهارم هیچ نەدی، بۆ گەشت و سەیران
بە قوربان (شارەزور)ی چۆن ببینم — زەڕ و زۆڕم نیە شاقاو هەڵێنم
لە باتی کێوی (هەورامانی) پڕ نور — لەژێر کێوی غەمان کەوتووم وەکو موور
ئەگەر لوتفت هەبێ بێ ڕادەکێشم — لە قافلەی مەتلەبا هەردەم لە پێشم
لەوێ ڕۆژی ئەتووم دیوە لە (بەغدا) — ملم داوە بە هەق (والله) وە (بالله)
لە بۆ بەعزێکی زۆر نادانی بێ فام — لە جێ یێە شەقی دام و لەقی دام
ئیجازە و خیرقە و تاجی موصەللا — بسێنم بۆ ڕەواجی کاری دونیا
فرەخاسە گەلێ چاکە، بە جێ‌یە — وەلێ گەر حەز بکەی ئێرەش ئەوێ یە
لە لای تۆ دەرهەقم، بێ ئیلتیفاتی — نیە بڕوات بە ئیستیحقاقی زاتی
لەبەر شێخان ئەگەرچی دین بڕاوە — بە تیغی توو زمانی من بڕاوە
وەلێ بۆ خاتری تۆ بەندەیانم — زمان دەگرم لە هەقیان، تا بتانم
لــە پاشی تۆ خودا بۆ خۆی عەلیمە — لە (کەرکوکیش) دوعا گۆیی (عەلی)مە

هەروەها مامۆستا عبدالله ی جەلی بـە هـۆنراوە، زنجـیرەی تەریقـەتی نەقشـبەندی داناوە، وە بە زمانی فارسی، لە پێغەمبەر (د.خ) دەست پـێ دەکـا، لـە شـێخ ئەبوبـەکری هەرشەمی هەولێر کۆتایی دێ، دەقەکەی ئەوەیە:

محمد مصطفی بوبکر سلمان — دگر قاسم چراغ ملك و إيمان

پس از وی صادقست و پیر بسطام ازوشد بو حسن برهان إسلام
بیمنش بوعلی اشکال بکشاد بشد یوسف عزیز مصر إرشاد
به عبدالخالق امد کار روشتن زعارف شد طریقت همچو گلشن
بود محمود شاه ملك ومعنی از و ابادشد انجیر فغنی
علی نساج هم بابای سماس أمیر سید گلالی أزهد الناس
بهاء الحق والدین شاه دلبند نقشبند و نقشبند و نقشبند
علاءالدین مهی چرخ مروق أز و یعقوب چرخی بافت و رونق
شه احرار شاه انس و جانست مه و خورشید برخوانش روانست
محمد زاهد و درویش محمد مثال خواجەکی با قیست امجد
مجدد احمد فاروق هندی أز و نوشد طریق نقشبندی
پس از وی عروة الوثقی ی معصوم أز و عبدالاحد شد شاه این بوم
چو سیف الدین لوای شرع أفراشت درو ماه طریقت خوب بگما شت
اگر اوصاف سید نور دانی خودت از چنگ ظلمت میر هانی
حبیب الله مظهر جان جانان نهنگ قلزم ارشاد عرفان
زشاه دهلی عبدالله أنور محمد خالد ما یافت زیور
سراسر نسبتش دریای نورست ضیابخش لوای شهرز ورست
پس أز وی کیست ماه چرخ أیمان سراج دین و دنیا شیخ عثمان
اگر داری حواس و شمەی شم نبوی جز گلی گلزار هرشم
غیاث الدین ابوبکر موفق طریقت یافت أزوی زیب وورنق
اگر گویم که او قطب زمانست عجب نبود که شیخ انس و جانست
(جەلی) خواهی ره پیر نقشبند قدم دروه بنه لبرا فروبند

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٢٦ك - ١٩٠٨ز کۆچی دوایی کرد، وشەی (مغفور)یان بە ژمارەی ئەبجەد بۆ داناوە: م=٤٠، غ=١٠٠٠، ف=٨٠، و=٦، ر=٢٠٠ سەرجەم دەکاتە = ١٣٢٦ك.

سەرچاوەکان:

١. منظومة السلسلة العلية النقشبندية: دەستووس.
٢. مێژووی ئەدەبی کوردی ٤٠/٤ - ٤٢.
٣. المصقول ٩.
٤. أربيل في مختلف العصور ١٣٤.
٥. علماء ومدارس في أربيل ٦٤.
٦. یادی مەردان ٥٣٩/٢ - ٥٤٠.
٧. محمد بن عبدالله الجلي ٩٤ - ٩٨.
٨. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٥١ - ٣٥٤.
٩. بنەماڵەی زانیاران ٥٦٠ - ٥٦٣.

## عبدالله ئیسماعیل خەرپانی (٧٤٧)

ناوی عبدالله یە، کوڕی ئیسماعیلی کوڕی محەممەد کۆسەی کوڕی عەلی کوڕی خضری کوڕی وەیسی کوڕی نورەددینی کوڕی مصطەفای کوڕی صەڵاحەدینی کوڕی عیوەضی نەتەوەی ئیمام هەمزەیە.

لە دەوروبەری ساڵی ١١٥٩ك - ١٧٤٦ز لە گوندی (خەرپان) سەر بە (هەڵەبجە) لە دایك بووە، لە خزمەت باوکی قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، دوایی چووە قوتابخانەکانی: (بیارە) و (خورماڵ) و (هەڵەبجە)، دوایی چووە (تەڕەمار)ی سورداش، پاشان چووە لای سەید عبدالکریم لە (کەرکوك)، لە قۆناغی کۆتایی چووە لای مەلا خضر ئەحمەد حەیدەری لە خزمەت ئەو ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (خەرپان) دەستی کرد بە دەرسدانەوەی فەقێیان.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەولانا خالیدی شارەزوری، مەلا ئەحمەدی هەڵەبجەیی، مەلا مەعروف طالیع، مەلا یوسف نشاری، مەلا یاسین تەوێڵەیی، مەلا محەممەد زەهاوی، مەلا خضر (نالی شاعیر).

مامۆستا لە خەرپان باری کرد بۆ (سلێمانی)، ماوەی پێنج ساڵان ماوە، دوایی گەڕاوە (خەرپان)، خەڵکان ڕێزیان لێ دەگرت، بە تایبەت پاشایەکانی (بابان) زۆر خۆشیان دەویست، خەرجی فەقێیان و قوتابخانەکە لەسەر شانی ئەوان بوو، هەروەها برادەراتی لەگەڵ سیراجەدین شێخ عوسمان هەبوو، هاتووچوی مەلا ئیبراهیمی بیارە و مەلا جەلالەدینی خورماڵی دەکرد، لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٢٥٤ك – ١٨٣٨ز کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی: پێنج کوڕی هەبوو:

١. شێخ مەحمود: موفتی هەڵەبجە.
٢. شێخ محەممەد.
٣. شێخ مەعروف: ساڵی ١٢٨٢ك – ١٨٦٥ز کۆچی دوایی کرد.
٤. شێخ عبدالکریم: ساڵی ١٢٣٣ك – ١٨١٧ز لە خەرپان کۆچی دوایی کرد.
٥. شێخ عبدالرحمان: ساڵی ١٢٦٦ك – ١٨٤٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٤٠.
٢. بنەماڵەی زانیاران ١٩١ – ١٩٧.

## عبدالله ئیسماعیل سکتانی (٧٤٨)

ناوی عبدالله یە، کوڕی مەلا ئیسماعیلی کوڕی خەلیفە محەممەدی کوڕی مەلا عبدالله یە، ساڵی ١٨٩٦ز لە گوندی (ماویلیان) سەر بە ڕواندز، هاتووتەدنیا.

لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (بالیسان) لای مەلا شێخ طاها، وە بۆ خوێندنی ڕیازیات و فەلەك چووە (کۆیە) لای مەلا بەهائەدین، ساڵی

١٩٢١ز چووە (گڕاو) لای مەلا عبدالله پاشان لەسەر فەرمانی باوکی چووە (هەولێر) لای شێخ مصطفەفای نەقشبەندی، ماوە لەوێ تا ساڵی ١٩٣١ز ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (سکتان) دەستی کرد بە دەرسدانەوەی فەقێیان.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا شێخ عومەری بالیسانی، مەلا شێخ محەممەدی بالیسانی، مەلا وەیسی ڕۆستێ، مەلا عبدالقادر کانی دەربەندی، مەلا عبدالعزیز هیرانی، مەلا کاك عەلی هیرانی، مەلا عبدالعزیز شاخەپیسکەیی، مەلا محەممەدی قیرژەی، مەلا ئەحمەدی تورك، مەلا عەلی حاجی تەوفیق.

مامۆستا زاتەکی سەخی بوو، ڕووخۆش و بێ فیز بوو، خزمەتی مێوانانی دەکرد، یارمەتی هەژارانی دەدا، لەگەڵ مەلا عبدالله ی بەحرکەی (باوکم) زۆر برادەر بوو، ولاش فەقێ بوون لە مزگەوتی شێخ مصطفا لە (هەولێر).

قسەکی خۆش: لە مەلا عبدالقادر کانی دەربەندی دەگێڕنەوە، دەڵێ: {لە کۆیە لای مەلای گەورە باسی قیاسم دەخوێند، ڕۆژەك لە دەرەسەکە نەگەیشتم، لەو شەوی لە خەودا بە خزمەت مامۆستا عبداللهی سکتانی گەیشتم، جێیەکەی چاك بۆ ڕۆنکردمەوە، بەیانی چوومەوە خزمەت مەلای گەورە، دووبارە دەرسەکەی بۆ دامەوە، مامۆستای سکتانی لە خەودا چی گۆت، ئەویش هەروای گۆت، منیش سوپاسم کرد و خەونەکەم بۆ گێڕاوە}.

مامۆستای سکتانی ساڵی ١٩٤٥ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (پاش گەروو) لە گوندی (سکتان) بە خاك سپێردرا، مەلا طاهای کوڕی: لە (کۆیە) پێش نوێژ بوو، دوایی هاتە (هەولێر)، پاشان کۆچی دوایی کرد، بەروارەکەم لا نیە.

سەرچاوەکان:


١. النجم الزاهر ٦٨.

٢. نامەی مەلا طاهای کوڕی مامۆستا، پێش ئەوەی کۆچی دوایی بکا.

## عبدالله ئیسماعیل شەنەغەیی (٧٤٩)

ناوی عبداللە یە، کوڕی مەلا ئیسماعیلی کوڕی مەلا عوسمانی کوڕی مەلا عبدالرحمانی کوڕی مەلا عوسمانی کوڕی مەلا پیرۆتە، ساڵی ١٣٠٨ك - ١٨٩٠ز لە گوندی (سێکانیان) نزیك (طەق طەق) هاتووتەدنیا.

لەلای باوکی دەستی کرد بەخوێندن، قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکردن، توانای دانانی هۆنراوەی کوردی و عەرەبی و فارسی پەیدا کرد، پاشان چووە (هێبان) لای مەلا حەسەن ڕەزانی، ماوەك ئاودیو بوو بۆ (ئێران) گەڕاوە ناوچەی (پشدەر)، لەوێوە چووە (کۆیە) لای مەلا محەممەدی جەلی، هەشت ساڵان لەوێ ماوە، هاتە (هەولێر) مزگەوتی قەڵات لای مەلا ئەفەندی ماوە، ساڵی ١٩٢٣ز ئیجازەی وەرگرت.

کرا پێش نوێژ و وتارخوێن لە مزگەوتی گەورەی ناوبازاڕ، ناوەناوەش دەرسی دەدا، وتارەکانی بە زمانی کوردی بوون، لەو سەردەمی کەم وابوو ووتاری هەینی بە کوردی بی، زۆربەی وتارەکانی هێرش بوو لەسەر خەڵکی بازاڕ، فێڵ و فڕ و کڕین و فرۆتنی ناڕەوا، لە ناو دووکاندارەکان و چەرچییەکانی بازاڕ، یەك لە وتەکانی ئەوەبوو: {لە بەیانی تا نوێژی شێوان، سی و سێ دانەی تەسبیحان، بادەدەن وەکو کلکی کەران، قەت جارەك ناوی خواتان نایێتە سەر زوبان}.

کۆچی دوایی: لە بەرواری ١٩٦٩/١٠/٧ز کۆچی دوایی کرد لە گۆڕستانی ناو بازاڕ بە خاك سپێردرا.

دوو کوڕی هەبوو:

١. مەسعود: پێش نوێژ بوو لە مزگەوتی خەلیفە خالید، دیوانی شیعری چاپکراوی هەیە، نازناوی (بێ بەش)ە.

٢. مەحمود زامدار: ڕۆژنامەنووسە.

سەرچاوە: الإكليل في محاسن أربيل ٣٧٢.

## عبداللە ئیسماعیل نۆغەرانی (٧٥٠)

ناوی عبداللە یە، کوڕی مەلا ئیسماعیلە، ساڵی ١٩٢٨ز لە گوندی (نۆغەران) هاتووتەدنیا، لە گوندی خۆیان دەستی کرد بە خوێندن لە قوتابخانەکانی حوجرەی فەقێیان قۆناغی سوختەیی بڕی، لە قۆناغی موستەعیدی چووە لای ئەو بەڕێزانە: مەلا محەممەدی باشوری، مەلا عبدالقادر ماجیداوەیی، مەلا ئەبوبەکری کۆیی، پاشان چووە (هەولێر) لای جەنابی شێخ مصطفای نەقشبەندی، ماوە لە خزمەتی تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، کرا مەلا لە مزگەوتی (ڕەشە) لە (کۆیە)، مامۆستا زانایەکی زیرەك و فەڕائیز زان بوو، خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بوو، تا ساڵی ١٩٩٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عبداللە ئەصەم هەولێری (٧٥١)

مامۆستا عبداللەی ئەصەم (ئەصەم، واتە: کەڕ) ناسراوە بە عبدالعزیز، خەڵکی هەولێرە زانایەکی بەرز بووە، دەستی شیعری هەبووە، کتێبی (الفتحیة في شرح الخمریة)ی دانایە، ساڵی ١١٤٨ك – ١٧٣٥ز تەواوی کردیە، گۆیا لە کاتی خەریکبوونی بە خوێندنەوەی ئەو کتێبە لەشکر و سوپا بە تەپڵ لێدان بە ڕۆخی داچووە، سوێندی خواردیە ئاگاداری سوپایەکە نەبووە، لەبەر خەریکی کتێبەکە، لەو ڕۆژە ناوبردرا بە (کەڕ)، دەنا کەڕ نەبووە، شتێکی واش لە مامۆستا یوسفی ئەصەم دەگێڕنەوە، مامۆستا ساڵی ١١٦٥ك – ١٧٥١ کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. غایة المرام ٧٩.
٢. الإکلیل في محاسن أربیل ٢٣٢ – ٢٣٣.
٣. مشاهیر الکورد ٢/٤٦.
٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/١٢٧.
٥. معجم أعلام الکورد ٣٨٣.

## عبدالله بانەیی (٧٥٢)

مامۆستا عبدالله (بانە)یی، خەڵکی گوندی (نەمەشێر)ە، لە دەوری ساڵی ١٣١٢ك – ١٨٩٤ز هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (هەورامان) لە قوتابخانەی شێخ عەلائەدین لای مەلا محەممەدی (مەریوانی) تەواوی کرد، بووە مەلا لە گوندی (گوڵپ)ی شارەزور، پاشان چووە (هانەگەرمەلە) نزیك (بیارە)، دوایی چووە (پیاویلە)، باری کرد بۆ (دەرەشیش)، ساڵی ١٣٥٥ك – ١٩٣٦ز کۆچی دوایی کرد، مەلا محەممەدی کوڕی جێگری بوو.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٦٢ – ٣٦٣.

## عبدالله بەکر بارزانی (٧٥٣)

ناوی عبدالله یە، نازناوی تاجەدینە، کوڕی مەلا بەکری کوڕی مەلا عوسمانی کوڕی مەلا طاهیری بارزانی یە، لە بنەماڵەکی ئایین پەروەر و مەلا زادەیە، دەچێتەوە سەر کاربەدەستەکانی (ئامێدی)، باپیرە گەورەیان لە (هەفنکا)ی نزیك بارزان دابەزیوە، پاشان خۆی و نەتەوەی لە بارزان جێگر بووینە، مەلا عبدالله وەکو فەقێیەکانی کوردستان چەند قوتابخانەی بەسەر کردنەوە لە کۆتاییدا چووە (ئامێدی) لای مەلا یەحیای مزوری ئیجازەی وەرگرت.

گەڕاوە (بارزان) دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی و دەرسی فەقێیان، تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ طاهای (نەهری) وەرگرت، لە لایەن شێخ کرا (خەلیفە)، بەم جۆرە بەختەوەر بوو بە هەڵگرتنی بڕوانامەی زانستی و تەصەووف، خزمەتگوزاری ئایینی پیرۆزی ئیسلام و خانەقاکەی (بارزان) بکا، بەرواری کۆچی دوایی لام ڕۆن نیە.

کورەکانی: سێ کوڕی زانای هەبوو:

١. شێخ عبدالرحمان: جێگری باوکی بوو.

٢. شێخ عبدالرحیم: لەسەر دەستی مەلا یەحیای مزوری دەرچووە، زانیاری لە ئوصول بەهێز بووە، شەرحی (مختصر المنتهی)ی کردووە.

٣. شێخ عبدالسلام: لە پێشدا باسمان کرد.

سەرچاوەکان:

١. إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٣١٠ – ٣١١.

٢. الأكراد في بهدينان ٧٩.

٣. معجم أعلام الكورد ٤٢٩.

## عبداللە پیرەبابی (٧٥٤)

مامۆستا مەلا عبداللە پیرەبابی، خەڵکی گوندی (دیبوکر)ی سەر بە (مەهاباد)ە، لەلای مەلا عەلی قزلجی و چەند زانایان خوێندنی بردەسەر، لە گوندەکانی (وەتەمیش) و (ئاگریقاش) دەرسی دەداوە، لە دوا عمری چووە قوتابخانەی عەبباس ئاغا، لە (مەهاباد).

ئەو زاتە ناسراوە بە مەلایەکی زیرەك و ووردبین، لەمەنتیق و کەلام و ئەستێرەناسی و گەردون ناسی پسپۆر بوو، شەرحی (جەواد) و ئوصولی ئیقلیدس و بەرجەندی و ئوسطرلابی کردووە، حاشیەی لەسەر (تشريح الأفلاك) و فەرائیزی شەرحی مەنهەج و (تقريب المرام) هەیە، لە کۆتاییدا دەنووسیت (إني عبدالله).

بەشێك لە فەقێیەکانی:

١. میرزا عەلی: قازی مەهاباد، ساڵی ١٣١٠ك – ١٨٩٢ز کۆچی دوایی کرد.

٢. مەلا عبداللەی وەلزی: ساڵی ١٣٦٠ك – ١٩٤١ز کۆچی دوایی کرد.

٣. مەلا عبدالرحمان: نەوەی مەلا محەممەدی (یایی) مەلای مزگەوتی سۆر بوو لە مەهاباد.

٤. مەلا محەممەد حوسێن تورجانی.

٥. مەلا محەممەدی مەحوی شاعیر: ساڵی ١٩٠٦ز کۆچی دوایی کرد.

٦. مەلا سالی سنەیی: ساڵی ١٨٧١ز ئیجازەی وەرگرت.

٧. مەلا محەممەد کەریم: سەقزی (کەوثەر).

مامۆستا (عبدالله ی پیرەبابی) ساڵی ١٣٠٩ك - ١٨٩١ز یا ساڵی ١٣١٨ك - ١٩٠٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. ژیناوەری زانایانی کورد ٢٢١ - ٢٢٢.

٢. مشاهیر الکورد ٢/٤٥ - ٤٦.

٣. تاریخ مشاهیر کورد ٢/٤٤ - ١٢٦.

٤. معجم أعلام الکورد ٣٩٤ - ٣٩٥.

## عبدالله چۆڕی (٧٥٥)

مامۆستا عبدالله ی چۆڕی لە نەتەوەی مامۆستا ئەبوبەکری (مصنف)ە، لە دەوروبەری ساڵی ١٢٦٦ك - ١٨٤٩ز لە گوندی (چۆڕ)ی سەر بە (مەریوان) هاتووتەدنیا، هەر لەو گوندە دەستی کرد بە خوێندن، دوایی لە چەند قوتابخانان سوڕا و گەڕا، تا لە شاری (سنە) جێگیر بوو، پاش تەواوکردنی قۆناغەکان لە مزگەوتی (دارالإحسان) کرا دەرس بێژ، فەقێیان ڕوویان تێ کرد و لە دەورەی کۆبوونەوە، بە داخەوە تەمەنی درێژ نەبوو، ساڵی ١٣١٠ك - ١٨٩٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدین ٣٥٤.

## عبدالله حوسێن ڕەحیماوا (٧٥٦)

ناوی عبدالله یە، کوڕی حوسێنی کوڕی مەحمودە، عەشیرەتی (لەك)ە، لە گوندی (بەردەسپی) ساڵی ١٩١٠ز چاوی خۆی هەڵێناوە لە دونیا.

پاش خوێندنی قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکان، چووە لای مەلا عومەری سنجاوی دوایی چووە (سێکانی) لای مەلا عبدالرحمانی بەگزادە، دوایی چووە (قەشقە) لای مامۆستا ئیسماعیلی (ناقیص)، پاشان چووە (کەرکوك) لای مەلا عومەری ئۆمەرگومبەت، ماوە لە خزمەتی تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، بووە مەلا لە (دوبز) و

(یارمجە) و (پەنجە عەلی)، پاشان هاتە مزگەوتی ڕەحیماوا، لە (کەرکوك)، مامۆستا زاتەکی قسەخۆش و سەخی و بە دین بوو، لەگەڵ مامۆستا عبدالمجیدی گراوی زۆر برادەر بوو، بۆیە کوڕەکی خۆی بەناو ئەو کرد، لە ١٠/٩/١٩٩٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عبدالله حوسێن کوردی ( ٧٥٧ )

ناوی عبدالله یە، کوڕی حوسێنی کوڕی عەلی هەولێری یە، نازناوی مەجدەدین ئەبو محەممەدە، مەزهەبی شافیعی بووە، خواناس و بە دین بووە، ناوبانگی چاکەی ڕۆیشت بوو، لە زانستەکانی قورئانی پیرۆز شارەزا بوو، خەریکی فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) بوو و بەلاوی دەکردنەوە، لە (شام) دەرسی دەدا، لە ٦٧٧ك – ١٢٧٨ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (صۆفییەکان) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الکورد ٢/٥١.
٢. علماؤنا في خدمة العم والدین ٣٣٣.
٣. الإکلیل في محاسن أربیل ١٧٦ – ١٧٧.
٤. شذرات الذهب ٥/٣٥٨.
٥. طبقات الشافعیة / ئەسنەوی ١/١٥٤.
٦. معجم أعلام الکورد ٣٨٨.

## عبدالله حەیدەر حەیدەری ( ٧٥٨ )

ناوی عبدالله یە، کوڕی حەیدەری کوڕی ئەحمەدی کوڕی حەیدەری (ماوەرانی)یە، زانایەکی بە توانا و لێهاتوو بووە، تاریکەستانی نەزانی بە زانیاری ئەو ڕۆناك بووە، وەك پاپۆڕ مەلەوانی دەریای هەموو زانستەکان بوو، چ ڕێگایەك نەما پێدانەچی، چ ڕەوڕەوەك نەما پێ هەوراز نەچی، چ پلەیەك نەما وەری نەگری، چ قۆناغەك نەما لێی تێنەپەڕی، دانراو و حاشیەی زۆرن، لەوانە:

١. شەرحی (الزوراء)ی جەلالەدینی دەوانی.
٢. رسالة في نسب القضايا.
٣. رسالة في الإنشاء.
٤. رسالة في تفسير آية (الله نور السموات والارض).
٥. حاشية على شرح عصام الدين في البيان، ساڵی ١١٠٠ك – ١٦٨٨ز دایناوە، دانەیەکی دەستنووسی (عبدالسلام سەعید شەوواف)مان لە لایە، ساڵی ١٢٥٦ك – ١٨٤٠ز نووسیتیەوە.
٦. حاشية على حاشية (قول أحمد) في المنطق، لە ١١٠٤ك – ١٦٩٢ز دایناوە.
٧. حاشية على حاشية (مير أبو الفتح) في الآداب، لە ١١٠٤ك – ١٦٩٢ز دایناوە.
٨. حاشية على حاشية اللاري في الحكمة: ساڵی ١١١٢ك – ١٧٠٠ز دایناوە.
٩. حاشية على شرح عصام الوضع: دانەیەکی دەستنووسی (حەمەد صاڵح)مان لە لایە، بۆ مەلا ئەحمەدی مەلا عبدالرحمان ڕۆژبیانی نووسیتەوە.
١٠. حاشية على شرح عصام الدين في الآداب: دانەکی لە لای ئێمە هەیە.
١١. حاشية على فرائض التحفة.
١٢. حاشية على حاشية عبدالغفور على الجامي.

ساڵی ١١٣٠ك – ١٧١٨ز کۆچی دوایی کردووە، کوڕێکی ناو صاڵحی هەبووە، ئەویش دانراوی هەنە.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٢٩.
٢. معجم أعلام الكورد ٣٨٨.
٣. بنەماڵەی زانیاران ٢٣١ – ٢٣٢.
٤. علماء ومدارس في أربيل ٤٥.
٥. کاروان، ژمارە ٨٧، ١٩٩٩ز.

٦. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٢١٧ – ٢٢٩.

## عبدالله خضر شێخ مەموندی (٧٥٩)

ناوی عبداللە یە، کوڕی خضرە، خەڵکی گونـدی (شـێخ مەمونـدیان)ی سـەر بـە (حەریرە) مێژووی لە دایکبوون و چونیەتی خوێندنی لە لام دیار نیـە، بـەڵام لـە گونـدی (سارتکە) لای مەلا ئەبوبەکری (میرڕۆستەمە)ی خوێندووە و ئیجازەی لێ وەرگرتووە.

بوویتە مەلا لە (شێخ مەمووندیان)، دوایی لەسەر داوای میرانی (بایزبەگ) ماوەك چوویتە (شەقڵاوە) دەرسی داوە، پاشان گەڕایتەوە (شێخ مەمووندیان)، لـە (کـاکم) مـەلا طەیبم بیست: {شێخ مەمووندی چووە (بەغدا) گـوێی لـە دەرسـی مـەلا محەمـەد فـەیزی زەهاوی ڕاگرت، لە شوێنەکی ڕەق و ئالۆز زەهاوی وەستا، شـێخ مەموونـدی تـەنیا یـەك قسەی لێ کرد، جێگاکە ڕۆن بۆوە و حـەل بـوو، (زەهـاوی) بەرچـێری پەسـتەکی شـێخ مەمووندی گرت و بۆ لای خۆی ڕاکێشا، پێی گۆت: ئێستا مەلا چاکی کوردان تەنیا مـن و تۆینە}.

هەروەها دەڵێن: {شێخ مەمووندی چووە (ئەستەمبۆڵ) بۆ بڕینـەوەی مووچـە بـۆ تاقیکردنەوە، ناردیانە لای سەرۆکی زانایان، ئەویش کتێبەکی پێـداوە و سـێ ڕۆژ مۆڵـەتی دا، دوایی گاز کرا، پلەی چاکی وەرگـرت، دەرچـوو بـە (مـدرس) جوببـە و مەنـدیل و عەبایان پێ بەخشی، بەڵام مامۆستا کەیفی پێ نەهات، هەناسـەکی هەڵکێشـا، ئاووهـەوای کوردستانی هاتەوە یاد، گۆتی: {خۆزیا ئێستا لەسەر گوفـەکی شـێخ مەموونـدیان بامـە}، هەرچەندە کردیان لەوێ نەماوە، گەڕاوە کوردستان}.

دانراوەکانی: دوو دانراوی مامۆستام دیتووە:

١. روضة الأذكيـاء: شەرحی (بیان البیان)ی ئیسـتیعارەکەی مامۆسـتای میرڕۆسـتەمەیە، دەستنووسەکی (مەلا ئیسماعیلی ناقیص)مان لە لایـە، نووسـراوە کـە ئـەو شـەرحە ساڵی ١٢٨٣ك – ١٨٦٦ز دانـراوە، بـەڵام محەمـەد عـەلی قـەرەداغی دەڵـێ: لـە دەستنووسەك دیتوومە، ساڵی ١٢٥٥ك – ١٨٣٩ز دانراوە.

٢. شەرحی (خلاصة الوضع)ی مامۆستای میرڕۆستەمی، دانەکی خەتی باوکمان لە لایە.

مامۆستا ساڵی ١٢٦٥ك – ١٨٤٨ز لە شێخ مەموونەدیان مەلا بووە، پاش ئەو بەروارە کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/١٣٦ – ١٤١.

٢. علماء ومدارس في أربيل ١١٣.

٣. نامەی مەلا ئیسماعیلی شێخ مەموونەدی.

## عبدالله داغستانی جەوانشێر (٧٦٠)

مامۆستا عبدالله، ناسراوە لەناو مەلایان بە (جەوانشێر)، خەڵکی (داغستانی) قەفقازە، لەوێوە هاتووتە (تورجان)، لای مەلا عەلی قزلجی زانستی زاهیری خوێندووە، بۆ زانستی نهێنی تەصەووف چووە لای سیراجەدین شێخ عوسمانی تەوێڵەیی، شەش مانگ لە لای ئەو (مەلا عەلی قزلجی) و شەش مانگ لە لای ئەم (شێخ عوسمانی تەوێڵەیی)، لە نێوان هەردوو جێگادا کۆچی دوایی کرد.

مامۆستا نامیلکەیەکی بە زمانی (ڕووسی) دەربارەی فەلەکیاتی نوێ دانا، پێشکەشی بە مەلا عەلی (قزلجی) کرد، هەروها چەند حاشیەی بە نرخی لەسەر کتێبانی خوێندن هەیە، زانایەکی زمان ڕەوان بوو لە عەرەبی و فارسی، خەتی خۆش بوو، کتێبەکانی خوێندنی فەقێیانی ئەو سەردەمی هەر هەموو بە دەستی خۆی نووسیەوە.

سەرچاوە: ژیناوەری زانایانی کورد ٢٢٥ – ٢٢٦.

## عبدالله ڕەسول عیرفان (٧٦١)

ناوی عبدالله یە، کوڕی مەلا ڕەسولە، ناسراوە بە (عیرفان)، ساڵی ١٢٧٦ك – ١٨٥٩ز هاتووتەدنیا، عەرەبی و فارسی و تورکی باش زانیوە، دەرسی لە لای مەلا عبدالرەحمانی پێنجوێنی خوێندووە و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، ساڵی ١٣٣٧ك – ١٩١٨ز

کۆچی دوایی کردووە، کتێبانی (ئوسطرلاب) و (ربع المجیب)ی لە زمانی تورکی هینایتە سەر زمانی کوردی.

سەرچاوە: تأریخ مشاهیر کورد ٢/١٥٦.

## عبدالله سولەیمان ئاشۆکانی (٧٦٢)

**مامۆستا مەلا عبدالله - باوکی دانەری ئەم مێژووەیە - کوڕی حاجی مەلا سولەیمانی کوڕی فەقێ محەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەزیزی کوڕی ڕەسولە، عەشیرەتی (گەردی)یە، ساڵی ١٨٩٦ز لە گوندی (ئاشۆکان)ی ناوچەی بەڕانەتی هاتووتەدنیا، ناوبراوە بە (بەحرکەیی) چونکە ماوەکی زۆر مەلا بوو لەوێ، هەر لەوێش کۆچی دوایی کرد.**

**خوێندنی: دەوری ساڵی ١٩٠٠ز دەستی کرد بە خوێندی قورئانی پیرۆز و وردە کتێبەکانی عەرەبی و فارسی لە لای باوکی، جار جاریش دەچووە لای باپیری، خۆی دەیفەرموو: منداڵ بووم بە بیرمە باپیرم لەسەر سینگی خۆی دادەنام و هەڵیدەپەڕاندم، بە نزم هۆنراوەی (ذات الشفا)ی بۆ دەگۆتم تا فێربیم، سەرەتایەکەی باسی زنجیرەی پشتەکانی پێغەمبەرە (د.خ)، بە عەرەبی دەڵێ:**

**محمد نبینا إن ینتسب فهو ابن عبدالله عبدالمطلب**

**ساڵی ١٩٠٠ز دەستی کرد، بە (تەصریفی زمنجانی) لە لایەن مەلا ئەحمەدی مامی، لە گوندی (مورتکە)، ساڵی ١٩١٢ز دەستی کرد بە (شەرحی موغنی)، دوایی لەگەڵ (مامی) هاتە گوندی (گردارەق) لە بەڕانەتی، لەوێ ساڵی ١٩١٣ز دەستی کرد بە کتێبی (سەعدینی) سەرپاکی کتێبەکە و هەموو پەراوێزەکانی بە ماوەی دوو مانگان نووسیەوە، دوایی دەستی کرد بە خوێندنی (سعدالله)ی گەورە.**

**پاشان گرانی و نەهاتی وڵاتی داگرت، لەبەر نالەباری ئەرکی ژیان، کەس نەیتوانی بخوێنێ، بە داخەوە حوجرەکانی فەقێیان چۆڵکران و داخران، باوکم گەڕاوە لای باپیرم مەلا سولەیمان لە (ئاشۆکان)، خەریکی ئیش و کاری ماڵ بوو پاشان باریان کرد بۆ**

(بەحرکە)، ماوەك لەوێ مانەوە، گرانی هەر لە توندی دابوو چوونە (بەربیان)ی دەوبەستۆرە، ئاشی ئاویان لە مصطفا ئاغا بە زەمان گرت، دوایی چوونە (کۆڕە)ی خۆشناوەتی، لەوێش بە هەمان شێوە ئاشی ئاویان لە مصطفا ئاغای گوندەکە بە زەمان گرت.

پاشان خوای گەورە دەرکەی ڕەحمەتی خۆی لەسەر گەلی کوردستان کردەوە خونچە دەمی داوە، کانی وشك ژیاوە، بالدار هاتنە خرۆش، جۆگە و روبار هاتنەجۆش، درەخت هاتنەبەر، میوە کەتنەدەر، کشتوکاڵ و گەنم و جۆ، گەردەنیان بەرز بۆوە هاتنە ئەژنۆ، حوجرەکانی فەقێیان ئاوەدان بوونەوە، ئەوانەی حەزیان لە خوێندن بوو، دووبارە دەستیان پێ کردەوە، (باوکم) یەك بوو لەوانە مەراقی زانیاری هەر لە دڵ بوو، بۆ بردنە سەری خوێندنەکەی دڵ کول بوو، بۆ ئەو مەبەستە چووە (جدیدە)ی بەڕانیان، لای (مامی) مەلا حوسێن، ساڵی ١٩٢٠ز لە خزمەت ئەو دەستی کرد بە (جامی)، هەر لەو ساڵە کتێبانی (ئیساغۆجی) و (حیسامکاتی) و پەڕاوێزەکانی نووسیەوە.

ساڵی ١٩٢٢ز دەستی کرد بە (سیوطی)، هەر لەو ساڵە بەشێکی عبداللە یەزدی نووسیەوە، دوایی چووە گوندی (کەوڕەبەن) لای مەلا محەممەدئەمینی گەرەژێری دەستی کرد، بە (فەنناری)، ئەمجا گەڕاوە (جدیدە) لەوێ ساڵی ١٩٢٣ز دەستی کرد بە حاشیەی (قول ئەحمەد) لەسەر فەنناری، هەر لەو ساڵە کتێبانی ئادابی گەلەنبەوی و حاشیەی پێنجونی و محەممەدئەمینی جیهەت وەحدەی نووسیەوە، هەروەها بەشێکی لە کەمالی شەرحی شافیە نووسیەوە، لەو کاتە مەلای مانگی ڕەمەزان بوو، لە (چاروکی گەورە).

پاشان چووە (بنەسراوەی گەورە)، لە خزمەت مامی مەلا ئەحمەد، دەستی کرد بە (ئادابی گەلەنبەوی)، هەر لەوێ دوای یەك مانگ دەستی کرد، بە (کەمال) ساڵی ١٩٢٤ز دەستی کرد بە شەرحی (شەمسیە)، هەر لەو ساڵەدا (الرسالة الحنفیة)ی لەگەڵ پەڕاوێزەکان نووسیەوە، ئەمجارە چووە ناوچەی خۆشناوەتی، لە گوندی (قەراسنج) لای مەلا شێخ حوسێنی سورچی ماوەکی خوێند، دوایی ڕۆیشت هاتە (بەحرکە) لای مەلا

عوسمانی شەوەکی، لەوێ شەرحی شەمسیەی تەواوکرد، ساڵی ١٩٢٥ز دەستی کرد بە (شرح العقائد)، دوای کۆتابوونی ئەو کتێبە، دەستی کرد، بە (مختصر) هەر لەو ساڵەدا (بورهانی گەلەنبەوی) لەگەڵ پەراوێزەکانی نووسیەوە، ساڵی ١٩٢٦ز دەستی کرد بە (قازی) حیکمەت هەر لەو ساڵەدا (میر ابو الفتح) لەگەڵ پەراوێزەکانی نووسیەوە، بەحرکەی بەجێهێشت، ڕووی کردە خانەقای شێخ ئەبوبەکر لە (هەولێر)، چەند ساڵان لە خزمەت شێخ مصطەفای نەقشبەندی خوێند.

وە لەو ماوەیە چەند کتێبی نووسینەوە، لەوانە:

١. شەرحی عەقائیدی مەلا جەلال، لە ١٩٢٦ز تەواوی کرد.
٢. (خلاصة الحساب) و پەراوێزەکانی، لە ١٩٢٧ز تەواوی کرد.
٣. (فرائض شرح المنهج) و پەراوێزەکانی، لە ١٩٢٧ز تەواوی کرد.
٤. (شرح الوضع) و پەراوێزەکانی، لە ١٩٢٧ز تەواوی کرد.
٥. (شرح الاستعارة) و پەراوێزەکانی، لە ١٩٢٧ز تەواوی کرد.

لێرەدا کۆتایی بە خوێندنەکەی هێنا، ساڵی ١٩٣٢ز جەنابی شێخ مصطەفا ئیجازەی مەلایەتی پێدا، لەگەڵ مەلا مصطەفای برا گەورەی و مەلا ئیسماعیلی سوسەیی و مەلا محەممەدی باشوری.

مەلایەتی: گەڕاوە گوندی (مام خاران)ی زرارەتی لای باپیرم مەلا سولەیمان، ئاغای گوندەکە -ئەسعەد شێخ حوسێن- حوجرەی فەقێیانی بۆ دروست کرد، (باوکم) دەستی کرد، بە دەرسدانەوە، هەر لەوی ساڵی ١٩٣٥ز شەرحی حوسێن پشدەری لەسەر (تشریح الأفلاك) نووسیەوە، دوایی باری کرد بۆ (شەوزار)ی دەوبەستۆرە، هەروەها هەمزاغای گەردی حوجرەی فەقێیانی بۆ دروست کرد، ماوەك لەوێ ماوە، گەڕاوە (مام خاران)، ئەمجارەش لەوێ باری کردەوە، لەگەڵ فەقێیەکان بۆ گوندی (دارەبەن) لەوێ ساڵی ١٩٣٨ز خوای گەورە مەلا طەیبی کوڕی پێ بەخشی، ساڵی ١٩٣٩ز لەسەر داوای جەمیل ئاغای سەرۆك عەشیرەتی گەردی، باری کرد بۆ (بەحرکە)، ساڵی ١٩٤٠ز

حوجرەکانی فەقێیانیان بۆ نوێ کردەوە، ساڵی ١٩٤٥ز خوای گەورە مەلا طاهیری کوڕی - کە دانەری ئەم مێژووەیە - پێ بەخشی.

دەستنووسەکانی: خەتێکی زۆر خۆشی هەبوو، لە دەوری فەقێیەتی لە (بنەسراوە) مەشقی لەسەر خەتی فەقێ ئەحمەدی خێلی خۆشنووس کردبوو، کتێبەکانی پێویستی خوێندنی ئەو سەردەمی بە پەراوێزەوە بە دەستی خۆی نووسینەوە، ئێستا ماون ژمارەیان دەوری بیست کتێبە، لە پەرتوکخانەی خۆمان هەڵگیراون لە (بەحرکە).

سەفەرەکانی: دووجار سەفەری حەجی کرد، جاری یەکەم: ساڵی ١٩٥٦ز ئەوانەی لەگەڵ بوون: حاجی محەممەدئەمین سمایل، حاجی صەمەد (بەننا)، حاجی عبدالله ناڵبەند، جاری دووەم: ساڵی ١٩٦١ز، ئەوانەی لەگەڵ بوون: مەلا عبدالقادری برا گچکەی، مەلا عبدالله محەممەدئەمین خدر ئاغا، حاجی حوسێن حاجی سولەیمان، حاجی داود حەمەد، حاجی ڕەسول پیرداود.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبدالکریم سێیرانی، مەلا عەلی لەیلانی، مەلا محەممەدی سەلماسی، مەلا عبدالرحمان زیارەتی، مەلا عبدالله سێ بەردانی، مەلا عوسمان هەرشەمی، مەلا محەممەد شێخ شەروانی، مەلا عوسمان گاینجی، مەلا ئەحمەد شەوزاری، مەلا محەممەدئەمینی برای، مەلا عبدالعزیزی برای، مەلا عبدالقادری برای، مەلا مەسعودی ئامۆزای، مەلا جەمیلی کاوانی، مەلا ئیسماعیلی گۆمەزەردی، مەلا ئەحمەدی گردمامکی، مەلا عەلی مەلا یەحیا، مەلا محەممەد مەولود بەحرکەیی، مەلا مەولود میلی، مەلا ئیبراهیم شاوێسی، مەلا ڕەسول شاوێسی، مەلا ڕەسولی قەراتەسۆران، مەلا محەممەد مصطفا بەحرکەیی، مەلا عەزیزی ماستاوەیی، مەلا طەیی کوڕی، مەلا عوسمانی برازای، مەلا یاسینی خرابەدراوی، مەلا ئەحمەدی زیلکەی، مەلا ئیسماعیل گردارەقی، مەلا محەممەد گردەشێری، مەلا ئەحمەدی هەرشەمی، مەلا ڕەشیدی مۆریلان، مەلا ڕەشیدی شێخان، مەلا سەید محەممەدی مەلا قەرەی، مەلا عەلی گردەچاری، مەلا طاهیری کوڕی، لەگەڵ زۆرانی تر.

کاروباری کۆمەڵایەتی: زاتەکی دڵ صاف و دڵپاك و خاوەن بیروڕای ڕاست بوو، بە سام و بە هەیبەت بوو، خەڵکان لە قسەی دەرنەدەچوون، حەزی لە ئاشتی بوو، هەستی ناگوزوری لە شوێنەك کردبا هەوڵی لابردنی دەدا، لە پێکهێنانەوەی خەڵکان بوو، بۆ نمونە:

١. دەورووبەری ساڵی ١٩٤٠ز ناکۆکی لە نێوان ڕیش سپییەکانی عەشیرەتی زراری پەیدابوو، ئەویش لە پێشدا، ماوەکی زۆر لەگەڵیان ژیا بوو، چووە ناویان، ئامۆژگاری کردن، لە قسەی دەرنەچوون، سوپاس بۆ خودا بە ئاسانی پێکهاتنەوە، گەڕاوە (بەحرکە).

٢. ساڵی ١٩٥٩ز ناخۆشی پەیدا بوو، لە نێوان خەڵکی (بەحرکە) و برا گەورەکانی گوندەکە، ڕۆژەك دوای نوێژی عەسر، بانگی کردنە پشت حوجرەی فەقێیان، هەموویان کۆبوونەوە لەسەر خۆڵ دانیشتن بەڕیز، ئەویش ئامۆژگاری کردن، وتارەکی بۆ خوێندنەوە، کە کۆتایی بە وتارەکە هات، پێش ئەوەی داوای پێکهاتنەوەیان لێ بکا، خۆیان هەستان، دۆقەیان کرد و چاك بوونەوە.

دەقی وتارەکە: {بسم الله الرحمن الرحيم، الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على خير خلقه محمد وآله أجمعين، أوصيكم عباد الله ونفسي الخاطئة العاصية بتقوى الله وطاعته، فإن الله مع الذين اتقوا والذين هم محسنون، حەمد بۆ ئەو خودایە تاق و تەنها، کە ئێمەی لە عەدەمەوە بە فەیزی وجود گەیاند، وەشوکر هەر لۆ وی، کە ئێمەی لە تاریکی زوڵم و جەهلی کوفر دەرهێنا، بە نیعمەتی عەدل و ڕۆناکی دینی ئیسلامی لاواندینەوە، وە لەپاش ئیمان نیعمەتی لە هەموو نیعمەتان چاکتر کە بە شەرافەتی حەزرەتی فەخری عالەم (د.خ) لەگەڵ ئێمەی فەرمووە، ئەوەیە: کە هەزار بار گوناه بکەن، مادام بە دڵێکی خالیص خۆمان هاویتە قاپیەی ئەو وە تۆبەکی خالێصمان کرد، خودا بە فەزڵی خۆی لێمان خۆش دەبی، ولێشمان مەعلومە عاقیبەتی خراپە هەر زەرەر و پەشیمانی یە،

قال النبي صلى الله عليه وسلم ﴿اتقوا الظلم، فأن الظلم ظلمات يوم القيامة﴾، رواه مسلم، نقلاً عن تاج الاصول ٥/٢٠.

وقال صلى الله عليه وسلم: ﴿من كانت عنده مظلمة لأخيه فليتحلل منه اليوم قبل ان لايكون دينار ولا درهم، إن كان له عمل صالح أخذ منه بقدر مظلمته، وأن لم يكن له حسنات أخذ من سيئات صاحبه فحمل عليه﴾، رواه البخاري، انظر فتح الباري ١٠/١٨٣. وقال صلى الله عليه وسلم: ﴿المفلس من أمتي من يأتي يوم القيامة بصلاة وصيام وزكاة، ويأتي قد شتم هذا، وقذف هذا، وسفك دم هذا، وضرب هذا، فيعطى هذا من حسناته، وهذا من حسناته فإن فنيت حسناته قبل أن يقضى ماعليه أخذ من خطاياهم، فطرحت عليه ثم طرح في النار﴾ رواه الترمذي، انظر تحفة الأحوذي ٣/٢٩١، وقال صلى الله عليه وسلم:﴿الدين النصيحة﴾ رواه مسلم، انظر صحيح مسلم بشرح النووي ٢/٣٧. والنصيحة هي: أن تحب لهم ما تحب لنفسك، وتكره لهم ماتكره لنفسك، تتمنى أن يكونوا في ما بينهم من الألفة والمودة، وقال صلى الله عليه وسلم: ﴿من لايرحم الناس لايرحمه الله﴾، رواه مسلم، انظر صحيح مسلم ١٥/٧١. وقال الله عز وجل في الحديث القدسي ﴿ان كنتم تريدون رحمتي فارحموا خلقي﴾، نزهة الناظرين ١٦٧.

٣. ساڵی ١٩٦٣ز دەنگوباس بەلاوبۆوە، کەوا عارەبەکانی ناوچەی (شەمامك) بە تایبەت ئەوانەی چەکی حکومەتیان هەڵگرتبوو بە ناوی (حەرەس قەومی)، هێرشیان هێنایە سەر دەشتی (هەولێر)، ئەوا بەرێدەکەون بۆ بەرانیان و بەحرکە، چی کەوتە بەرچەنگیان دەرناچی، گرتن و کوشتن و تالان کردنە، خەڵکەکە زۆر تەنگاو بوون، لە ماڵەوە دەرچوون، بۆ کۆلانان و سەربانان، لەو کاتە تەنگەبەریەدا (باوکم) هەرچەندە نەخۆش بوو، هاتە ناویان، ئامۆژگاری کردن، فەرمووی شەڕ لەناو ماڵ و منداڵان مەکەن، نەوەك زەرەر دەکەن، چەکدارەکان لە دەورەی گوند خۆتان حەشار بدەن، ئەگەر عەرەبەکان هاتنە سەرتان بێ تەخسیر لێیان بدەن، ئەگەر زانیتان حکومەتیان لەگەڵە بە تۆپ و تەیارە پاڵپشتیان دەکات، توانای شەڕتان نیە

لەگەڵیان، لەو کاتە شێرانەخۆتان قورتار بکەن، بڕۆنە چیاکان، ئەوان کە هاتنە لای ئێمە دەبینن تەنیا پیرەمێرد و ژن و منداڵە بەرۆکمان بەردەدەن، وەئەگەر ماڵیان برد بابەن، ئەمجا لەسەر فەرموودەی ئەو خۆیان قایم کرد، خوای گەورە چەپارەی ئێمەی دا، عەرەب نەهاتن، خەڵکەکەش هێوربوونەوە گەڕانەوە، بەسەر بڵندی هاتنەوە.

چۆنیەتی دەرسدانەوەی: پاش جەمی بەیانیان، دەست نوێژی دەشووشت، چێشتەنوێژی دەکرد، لە ماڵ بەڕێ دەکەوت، عەبایەکی بە سەر سەرێ خۆی دادەدا، ئەوەی لەسەر ڕێگابا سەلامی لێ دەکرد، لە حوجرەی فەقێیان دادەبەزی، کاتی دەرسدانەوە وەك فەقێیەکی بەوێر، لەسەر چۆك دادەنیشت، ڕووی لە فەقێ دەکرد، دەنگی بەرز نەبوو، نزمیش نەبوو، دەقەکەی بەشێوەکی وارێك و پوخت دەخوێندەوە جار وابوو تەنیا بە خوێندنەوەکەی فەقێ فێر دەبوو پێویستی بە مانا لێدانەوە نەدەکرد.

بێ فیزی: بە خۆ و بەو هەموو زانیاریەی کە هەی بوو، بێ فیز بوو، بە خۆی نەدەنازی، خۆ هەڵکێش نەبوو، ڕێزی خەڵکی دەگرت، سەلامی لە منداڵان دەکرد، گازی خەڵکی دەکرد بە (باوە)، ناوی کەسی بە سووکی نەدەهینا، بە (سمایل)ی دەگوت ئیسماعیل، بە عەلای دەگوت عبداللە، بە قالەی دەگوت عبدالقادر خزمەتی مێوانانی دەکرد، ئیش و کاری بۆ فەقێیان دەکرد، کە سەلامی مامۆستایەکەی خۆی بۆ دەهات، لەبەر سەلامەکە هەڵدەستا.

بێ تەماعی: زاتەکی بێ تەماع بوو، چاوبڵند و سەخی بوو، خوازۆك و چاو لە دەست نەبوو، پشتی بە دنیا نەدەبەستا، ساڵی ١٩٥٧ز خالید نەقشبەندی پارێزگاری هەولێر هاتە (بەحرکە) نوێژی هەینی لە مزگەوت کرد، گەڕاوە (دیوەخان) بە بایز ئاغای گوت: بە مامۆستا بڵێ: بێتە لام تا مووچەی بۆ ببڕمەوە، کە پێیان گوت، فەرمووی: {ئەمن چاوم لەو شتانە نیە}.

چەند جاران سەرۆك عەشیرەت و پیاوی زەنگین لە دوویان دەنارد، کە (بەحرکە) بەجێ بێڵێ و بچیتە لایان، بەرانبەر بە مووچە و سامانی زۆر، دەیفەرموو: {ئەو ئەستوکە

جۆیەی خوای گەورە بە منی بەخشیوە تا ماوم لەگەڵ خەڵکی ئەو گوندە دەیخۆم بەسمە چی ترم ناوێ} .

نیشتمانپەروەری: ساڵی ١٩١٥ز حکومەتی (ڕوس) لەشکری هینا سەر (ڕواندز) بە نیازی داگیرکردنی کوردستان، مەرد و دلێرانی کورد دەستیان دا چەك، وەستان بەرانبەری دوژمن، ناچاریان کرد بە پاشەکشە و گەڕانەوە، باوکم و باپیرم و مامەکانم بەشداربوون، لەگەڵ فەقێیەکانی حوجرەکان، لەو سەربازییەی هێزی کوردی موسوڵمان.

پیشەسازی: دەست ڕەنگین بوو، خەتی خۆش بوو، لە جزوبەند و شیراز و بەرگ کردنی کتێبان چازان بوو، بۆ دامەزراندنی ئاشی ئاو وەستا بوو، ئیشی کشتوکاڵی خۆی هەر بە دەستی خۆی دەکرد، لە ئەندازیاری دامەزراندنی خانووبەرە ئازابوو، دارتاشی دەزانی، پینەدۆزی پێلاوەدڕاوی فەقێیانی دەکرد.

خۆڕاگری و ئارامی: زۆر خۆڕاگر و بە سەبر و ئارام بوو، زۆربەی ژیانی هەر بە نەخۆشی بردەسەر بەرانبەر ئەو هەموو ئازارەش خۆڕاگر بوو، بەتایبەت لەو ساڵانەی دوا عەمری، جار وابوو هەر لە ئێوارە تا بەیانی دادەنیشت، خەو لە چاوانی نەدەکەت، نەیدەتوانی درێژ بی، بەیانی لێمان دەپرسی چۆنی؟ دەیفەرموو: باشم، قەت وەزعی نالەباری خۆی بۆ کەس باس نەدەکرد، نەوەك ببیتە ناشوکری بەرانبەر نیعمەتانی خوای گەورە.

کۆچی دوایی: ڕۆژی دووشەمە، ١٠ی مانگی (محرم)، ساڵی ١٣٨٥ك – ١٢/٥/١٩٦٥ز لە ماڵی خۆی لە (بەحرکە) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی شێخ وەیس، بە خاك سپێردرا، مەلا ئەحمەد ناسراوە بە مەلا محەمەد مصطفا بەحرکەیی مێژووی ئەبجەدی بەم شێوەیە بۆ نووسیوە: (ونجم فجر غاب) ٩٩ + ٢٨٣ + ١٠٠٣ = ١٣٨٥ك، ڕاستی فەرموو و ئەستێرەی بەرەبەیانی کوردستان کوژاوە، ئەو ڕێگایە حەقەی زانایانی پێشوو گرتیان، ئەویش بە دوویان دا چوو، بەپێی بانگەوازی حەق: ﴿یا أیتها

النفس المطمئنة ارجعي إلى ربك راضية مرضية، فادخلي في عبادي، وادخلي جنتي﴾، سورەتی فەجر ئایەتی (٢٧-٣٠).

مامۆستا مەلا صالحی کۆزەپانکەی، خۆی لە تازییەکە ئامادەبوو، چەند دێرە شیعری هۆنراوەی خۆی بۆ سەرەخۆشی خوێندەوە، دەقەکەی ئەوەیە:

واریسی شەرعی محەممەد، ئەی چرای دینی نەبی

جێگەت ئینشا (الله) بەهەشتە، کەس شکی تێدا نەبی

عیلم و تەدریست حیجابێکی مەتین بوو بۆ گوناه

تاعەت و تەقوات چرا بوو، بۆ نەزانان و غەبی

دین و ئەهلی دین دەگرین، زۆر بەجۆش

بۆ زەمانێ کە ببینن، بێ تو تووی تێدا نەبی

هەر مەپرسە ئەهلی عیلم و ئەهلی دین چەند عاجزن

بۆ (وەفاتی) لە زەوزەمانە، یاخودا جێی چۆڵ نەبی

خوا بدا تەوفیقی نەجلی (طەییبی) کە (عن قریب)

لە هەموو ئەوصافی باوکی، قەت لەوی کەمتر نەبی

ئێمە جەمعا زۆر موهەییاین، مامەکانی (سیمعا)

بۆ هەموو خزمەت مەلا (طەییب) لە لای ئێمەی هەبی

دوو کوڕی لە پاش بەجێما:

١. مەلا طەییب: کە کوڕە گەورەیە، ئەوە بوو مامۆستا مەلا صالح لە سەرەخۆشییەکە ناوی هینا، وەپاش کۆچی دوایی خوالێخۆشبوو، لە شوێنی دانیشت بە مەلایەتی و دەرسدانەوە و کاروباری ئاینی، چەند دانراوی هەیە، خوای گەورە تەمەنی درێژ بکا، بۆ خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، ژیاننامەمان لە پێشدا بە درێژی نووسیوە.

٢. مەلا طاهیر: لەگەڵ مامۆستا و براگەورەی خەریکی دەرس دانەوە و جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی یە، چەند دانراوی هەیە، نووسەری ئەو مێژووەیە کە لەبەر

دەستت دایە، خوای گەورە وابکا، بەلاو بکرێتەوە، لێم وەربگـری بـە ڕەزامەنـدی، ژیاننامەی خۆشم لە پێشدا باس کردووە.

سەرچاوەکان:

١. النجم الزاهر ٦٨ – ٦٩.

٢. الإكليل في محاسن أربيل ٣٠٧ – ٣٠٩.

٣. دەنگی زانا، ژمارە /٢٢/ ١٩٩٨ز.

٤. گۆڤاری هەولێر، ١٧/٢٠٠٦ز.

٥. سەرەخۆشی دەستنووسی مامۆستا مەلا صالحی کۆزەپانکەیی.

## عبداللە سولەیمان گردەسۆری (٧٦٣)

ناوی عبداللە یە، کوڕی شێخ سولەیمانی کوڕی محەممەدە، لە سـەیدەکانی گونـدی (جلبەسەر)ە، دەوری ساڵی ١٩٢٠ز لە گوندی (صۆفی برایم) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چـووە (کۆیـە) لای خـاڵی مەلا محەممەد مەلا ئیبراهیم عەبدالانی، پاشـان چـووە (گردەسـۆر) لای مـەلا شـەریف دوو شیوانی، دوایی چووە (دیبەگە) لای مەلا ئیسماعیل جدیدەیی، دوایی چووە (هێلـەوە) لای مەلا ئەبوبەکری کۆیی، پاشان چووە خانەقای شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی لە (هەولێر) لای جەنابی شێخ مصطەفای نەقشبەندی، ماوە لە خزمەتی تا ساڵی ١٩٤٣ز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، لەسەر فەرموودەی شێخ ئیجازەنامەیەکە مـەلا عبـداللە ی بەحرکـەیی (بـاوکم) خوێندویەوە.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (بەردەسپی) دوایی چـووە (گردەسـۆر)، پاشـان، کرا (واعیز) لە (کۆیە)، دوایی لە مزگەوتی محەممەد ئاغـا، کـرا مـەلا و (مـدرس)، دوایـی گەڕاوە (گردەسۆر)، لەوێ کرا بەڕێوەبری پەیمانگای ئیسـلامی، دوایـی بـاری کـرد، بـۆ (هەولـێر) ماوەك کرا (مدرس) لە پەیمانگای وەزارەتی پەروەردە، دوایی گەڕاوە (ئەوقاف)، کرا پێش نوێژ لە مزگەوتێك لە گەڕەکی مەنتکاوە، هەروەها ئەندامی ئەنجومەنی زانستی یە

لە وەزارەتی ئەوقاف، ئەندامی فتوای لیژنەی بالآیە لە یەکیەتی زانایانی کوردستان، ماوەك وانەبێژ بوو لە قوتابخانەی (نانەکەلی) ئاینی سەربەخۆ، مامۆستا سەید زاتەکی هێمن و نەرم و لەسەرخۆیە، زیرەك و بەتوانایە، زەین تیژ و خاوەن هەست و بیرە، لە ناو خەلکان زۆر بەرێزە، خوای گەورە تەمەنی درێژبکا بۆ خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

سەرچاوەکان:

٤. النجم الزاهر ٦٨.

٥. الإکلیل في محاسن أربیل ٢٧٥ – ٢٧٧.

## عبدالله سۆر هەرتەلی (٧٦٤)

مامۆستا مەلا عبدالله، یەك بووە لە مەلایە چاکەکانی سەردەمی خۆی لە ناوچەی خۆشناوەتی، خەلکی گوندی (هەرتەل)ە، لە گوندی (شیرێ) نزیك (بالیسان)، مەلا بوو دەرسی دەداوە، فەقێیەکانی لە وەرزی هاوین دەچوونە گەرەکی سەرەوە، کاتی زستان دەهاتنە گەرەکی خوارەوە، لەوانە: مەلا محەممەد چیوەیی، مەلا عبدالله فەرهادی.

سەرچاوە: الإکلیل في محاسن أربیل ٢٩٧ – ٢٩٨.

## عبدالله طاها تەرجانی (٧٦٥)

ناوی عبدالله یە، کوڕی مەلا طاهای کوڕی مەلا حسەنە، دەچێتەوە سەر مەلا زادەکانی (زیارەت)، لە دەوری سالی ١٨٨٠ز لە گوندی (خۆران)ی خۆشناوەتی چاوی خۆی هەلێناوە لە دنیا.

خوێندنی: مامۆستا وەکو دەستووری فەقێیانی کوردستان، لە چەند شوێنان گەڕا لە حوجرەکانی فەقێیان، لەوانە: ناوچەی خۆشناوەتی، ڕواندز، کۆیە، دیبەگە، گردەڕەشە، پاشان چووە خانەقای شێخ ئەبوبەکر لە هەولێر لای شێخ مصطەفای نەقشبەندی، زانستەکانی تەواو کرد، ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: ئەمجا کۆتایی بە خوێندن هینا، دەستی کرد بە کاروباری مەلایەتی، دەرسی فەقێیانی داوە لەو شوێنانە: گوندی (کەندار)، گوندی (نۆغەران)، گوندی (تەرجان).

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبدالمجیدی گڕاوی، مەلا عومەری تەرجانی، مەلا ئەحمەدی خەلیفەی، شێخ محەممەد شێخ بەهائەدین نەقشبەندی، مەلا ئەبوبەکری کۆیی، مەلا خضری تەرجانی، مەلا ئیسماعیلی نۆغەرانی، مەلا عبدالرحیمی گاینجی، مەلا محەممەدی کوڕی.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٤٨ز کۆچی دوایی کرد.

دوو کوڕی مەلای هەیە:

١. مەلا محەممەد: ئیجازەی لە شێخ مصطفای نەقشبەندی وەرگرتووە، ماوەك مەلا بوو لە (تەرجان)، ئێستا پێش نوێژ و وتارخوێنە، لە مزگەوتی شێخ مصطفا، لە (هەولێر).

٢. مەلا جەلال: مامۆستا بوو لە وەزارەتی پەروەردە، ئێستا خانە نشین کراوە، ناوە ناوە دەرسی شەریعەت و تەفسیر دەداتەوە.

سەرچاوەکان:

١. النجم الزاهر ٦٦ – ٦٨ – ٦٩.

٢. دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عبدالله عبدالرحمان بزینی (٧٦٦)

ناوی عبداللە یە، کوڕی مەلا عبدالرحمانی کوڕی ئەصفەهانی کوردیە، ناوبراوە بە (بزینی) لە (شذرات الذهب) دەڵێ: {بزین = بوزەین: عەشیرەتێکە لە کوردان}، بە دووری نازانم ئەو عەشیرەتە، (شێخ بزێنی) ئێستا بی.

مامۆستا دەرسی شەریعەتی لە خزمەت باوکی خوێند، بۆ (نەحو) چووە لای مەلا حوسێنی ئامێدی، بۆ مەنتیق چووە لای مەلا نەصیر لە (سەمەرقەند)، کەلامی لە لای مەلا

عەلی کوردی تەواوکرد، ساڵی ٩٤٩ك بۆ دەرسی (بەلاغە) چووە لای کوڕی حەنبەلی، مامۆستا تەفسیری مەولانا جامی بە دەستی خۆی نووسیەوە و پێدا چۆوە، ساڵی ٩٦٢ك – ١٥٥٤ز لە شاری (قەصیر) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٨/٣٣١ – ٣٣٢.

٢. مشاهیر الکورد ٢٩٥.

٣. معجم أعلام الکورد ٣٨٩.

## عبدالله عبدالرحمان جەلی (٧٦٧)

ناوی عبدالله یە، کوڕی مەلا عبدالرحمانی جەلی یە، نازناوی (واثق بالله)یە، ناسراوە بە (کاکی جەلی)، زانایەکی بەرز بووە، لە هەموو بوارەکانی زانست شارەزا بووە، زۆر بە دین بووە، دنیا نەویست بووە، ساڵی ١٨٠٢ز کرا جێگری باوکی، پاشان چووە شاری (سلێمانی) تەریقەتی نەقشبەندی لە مەولانا خالید وەرگرت، دوایی چووە سەفەری حەج، لە گەڕانەوە لە (بەغدا) دابەزی، لەوێ مەولانا ئیجازەی خەلیفاتی پێدا، ساڵی ١٨١٧ز لەسەر فەرمودەی مەولانا شەش مانگ لە خانەقا ماوە، گەڕاوە (کۆیە).

دانراوەکانی:

١. وسیلة الوصول لساحة عنایة الرسول، ژیاننامەی پێغەمبەرە (د.خ).

٢. علوم القرآن: لە شێوەی ئیتقانی ئیمامی سیوطی.

٣. رسالة في إبطال ثواب صدقة من علیه دَین مستغرق جمیع ماله.

٤. حاشیة علی فتح الباري شرح البخاري.

٥. حاشیة علی إنسان العیون (السیرة الحلبیة).

٦. حاشیة علی (جامع الأصول) لابن الأثیر.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٨٣٠ز بە نەخۆشی تاعون کۆچی دوایی کرد، زۆربەی بەرەبابی حەویزییەکان، لە کۆیە بەودەردەچوون، تەنیا بابەکرئاغا قورتار بوو.

سەرچاوەکان:
١. المصقول ٧.
٢. علماء ومدارس في أربيل ٦٢.
٣. یادی مەردان ١/٩٢.
٤. هدية العارفين ٥/٤٨٩.
٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٥٠ – ٣٥١.
٦. معجم المؤلفين ٦/٦٨.
٧. محمد بن عبد الجلي ٨٨ –٩١.
٨. بنەماڵەی زانیاران ٥٥٧ – ٥٥٨.
٩. معجم أعلام الكورد ٣٨٩.

## عبدالله عبدالرحمان دیاربەکری (٧٦٨)

ناوی عبداللە یە، کوڕی عبدالرحمانە نازناوی (خيرالدين)ە، مەزهەبی حەنەفی بووە، لە زانستەکانی ئەقلی شارەزا بووە، ساڵی ٨٣٥ك – ١٤٣١ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الضوء اللامع ٥/٥٣.

## عبدالله عبدالرحمان دینەوەری (٧٦٩)

ناوی عبداللە یە، کوڕی عبدالرحمانە نازناوی ئەبولقاسمە، خەڵکی (دینەوەر)ە، بوێژ و ڕۆشنبیر بووە، لە خوراسان سەرۆکی نووسەران بوو، ساڵی ٣٩٠ك – ١٠٠٠ز کۆچی دوایی کرد، دەوری سی دانراوی خۆی هەیە.

سەرچاوەکان:
١. معجم المؤلفين ٦/٦٩.
٢. معجم أعلام الكورد ٣٨٩.

## عبداللە عبدالرحمان قولتەپەیی (٧٧٠)

ناوی عبداللە یە، کوڕی عبدالرحمانی کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەدی کوڕی مەلا ئەحمەدە، ساڵی ١٨٩٧ز لە گوندی (قولتەپە) هاتووتەدنیا.

لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (دیبەگە) لای مەلا صاڵحی کۆزەپانکە، پاشان چووە (ترپەسپیان) لای مەلا شێخ جەلال، دوایی چووە (سۆربەش) لای مەلا مەحمودی (ڕاجی)، لەوێ کۆتایی بە خوێندن هینا، ماوەك مەلا بوو لە (قولتەپە)، ماوەك لە (دۆرەبەکرە)، دوایی باری کرد بۆ (گۆمەگرو)، مامۆستا لەو ساڵانە حەجی ماڵی خوای کردووە: ١٩٣٥ز، ١٩٣٦ز، ١٩٣٧ز ، وە لە ١٩٤٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عبداللە عبدالصمد سەرانی (٧٧١)

ناوی عبداللە یە، کوڕی شێخ عبدالصمدی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی مەلا مەحمودی کوڕی مەلا ئیبراهیمی کوڕی مەلا کامیلی کوڕی شێخ عومەری سەرانە، دەوری ساڵی ١٨٨٥ز لە گوندی سەران هاتووتەدنیا.

خوێندنی: قورئانی پیرۆزی خەتم کرد لە (سەران)، دوایی چووە (بێتواتە)، ماوەك چووە (خەتە) پاشان چووە (ڕواندز)، سێ ساڵان لە لای مەلا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی ماوە، پاشان چووە (کەرکوك) لای مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی سیاە مەنصوری، کەلام و ئوصول و تەفسیر و حەدیس و شەریعەت و حیکمەتی تەواوکردن، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، هەر لەوێ ساڵی ١٣٢٦ك – ١٩٠٨ز شەرحی مەلا حوسێنی پشدەری لەسەر (تشریح الأفلاك) نووسیيەوە.

مەلایەتی: گەڕاوە (سەران) مەدرەسەی فەقێیانی دانا.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عەلی ڕواندزی، مەلا صادیقی ماویلیان، مەلا کاك ئەحمەدی ناوبەرگەی، مەلا عەزیزی هیرانی، مەلا شێخ طاهیری سەران، مەلا محەممەد ڕەسول ئاغا.

مامۆستا زانیاری تایبەتی هەبوو لە شەریعەت و فەرائیز و بەلاغە و مەنتیق و ریازیات، مێژووناس و ئەدیب و نووسەر بوو، زەین تیژ و زیرەك بوو، دەڵێن: {کە کتێبی دەنووسینەوە، دێڕەکی یەکجار دەخوێندەوە، دەهاتە بەری، ئەو دێڕەی دەنووسیەوە، یەکی تری دەخوێندەوە، دەهاتە بەری دەینووسیەوە، تا کۆتایی بە کتێبەکە دەهات، بەو شێوەیە دەچووە دوێ}. هەروەها کەمالی شەرحی شافییەی لەگەڵ هەموو پەراوێزەکانی کە (٣٥٨) لاپەڕەیە بە ماوەی (٣٩) ڕۆژ تەواو کردووە، چەند کورتە حاشیەی لەسەر ئاداب و جمع الجوامع و توحفە هەیە.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٤٧ز کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی ناو (محەممەد ئەسعەد)ی هەبوو، ساڵی ١٣٢٥ك – ١٩٠٧ز لە دایك بووە.

دانراوەکانی:

١. الربع المجیب: ساڵی ١٣٢٤ك – ١٩٠٦ز لە کەرکوك تەواوی کردووە.
٢. رسالة في معرفة ساعة الوقت: لەسەر فەرمانی مامۆستایەکەی دایناوە، ساڵی ١٣٢٤ك لە وولاتی (خۆزستان) تەواوی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. النجم الزاهر ٦٦ – ٦٧.
٢. علماء ومدارس في أربیل ١٢٠.
٣. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/١١٩ – ١٢٢.
٤. چەند دەستنووس لە لایەن مەلا ئیسماعیل شێخ عیزەدین ئەویش لەو بنەماڵەیە.

## عبدالله عبدالأحد حەڕانی (٧٧٢)

ناوی عبدالله یە، کوڕی عبدالأحدی کوڕی عبداللهی کوڕی خەلیفەیە، لـە ١٥ی مانگی شەعبانی ساڵی ٦٣٣ك – ١٢٣٦ز لە (حەڕان) هاتووتەدنیا، دەرسی لـە لای ئـیبن تەیمیە خوێندووە، ئیجازەی فەرموودەی بە چەند زانایان داوە، ناسراوە بە زاتـەکی بـەڕێز، کاربەدەستان ڕێزیان گرتووە، ساڵی ٧٠٨ك – ١٣٠٨ز لە ڕێگای (قاهیرە) کۆچی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٢/١٦١.

## عبدالله عبدالأعلى حەڕانی (٧٧٣)

ناوی عبدالله یە، کوڕی عبدالأعلیی، کوڕی محەممەدی حـەڕانی جزیرەیـە، سـاڵی ٣٦٤ك – ٩٧٤ز هاتووتەدنیا، ساڵی ٣٨٦ك چووە (بەغدا)، زانایەکی شـەرع زان بـوو، خەریکی فەرموودەش بوو، ساڵی ٤٤٣ك – ١٠٥١ز لە شـاری (ڕەحبـە)ی سـەر ئـاوی (فوڕات) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: طبقات الشافعية / ئەسنەوی ١/٤٢٦.

## عبدالله عبدالحليم بن تەیمییە (٧٧٤)

ناوی عبدالله یە، کوڕی عبدالحلیمی کوڕی عبدالسلامی کوڕی ئەبوقاسمی کوڕی خضری کوڕی محەممەدی کوڕی تەیمییەیە، برای تەقیەدین ئـیبن تەیمییـەیـە، لـە ١١ی مـانگی (محرم)ی ساڵی ٦٦٦ك – ١٢٦٧ز لە (حەڕان) هاتووتەدنیا، شیرخۆر بوو، لەگـەڵ مـاڵی خۆیان هاتە (دیمشق)، دوایی دەسـتی کـرد بـە خوێنـدنی فـەرموودە، شـەریعەتی خوێنـد، زانیاری تەواوی پەیا کرد، لە فەرائیز و ژمێریاری و بڕوایی و عەرەبی و ئەستێرەناسی، کرا (موفتی).

مامۆستا زۆر بە دین بوو، دەچووە مزگەوتەکانی چۆڵەوانی بۆ خواپەرسـتی، دوور لە دنیا بوو، ماڵی خۆی بـە خێـر دەدا، چـەند کـەراماتی لـێ دەگێڕنـەوە، چـەند جـاران سەفەری حەجی کرد، ماوەك لە (میصـر) دادەنیشـت، ڕۆژی چوارشـەمەی ١٤ی مـانگی جیمادی یەکەم، ساڵی ٧٢٧ك – ١٣٢٧ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/٧٦ – ٧٧.

٢. الدرر الكامنة ٢/١٦٢.

٣. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/٣٨٢ – ٣٨٤.

## عبدالله عبدالعزیز سیواسی (٧٧٥)

ناوی عبدالله یە، کوڕی عبدالعزیزی کوڕی موسایە، خەڵکی شاری (سیواس)ە، ساڵی ٧١٦ك – ١٣١٦ز کتێبی (أعمدة الفحول) شەرحی فصولی (بەقراط) لە بابەت دکتۆری داناوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٦/٧٦.

٢. كشف الظنون ٢/١٢٦٨.

## عبدالله عبدالقادر باداوەیی (٧٧٦)

ناوی عبدالله یە، کوڕی مەلا عبدالقادری کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی حەیدەری کوڕی عبداللەیە، باپیرەگەورەی لە (سەران) دانیشتووە، لەوێ هاتوونە (بالیسان)، لەوێش لەسەر داخوازی مەلا ئەفەندی هەولێر، هاتوونە گوندی (باداوە)، لەوێ ساڵی ١٣٢٧ك – ١٩٠٩ز مەلا عبدالله لە دایك بوو، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، زۆربەی قۆناغەکانی لە لای ئەو بردەسەر، دوایی چووە مزگەوتی شێخ نورەدین لە (هەولێر) لای مەلا صاڵحی کۆزەپانکەیی، ماوە لەوێ تا لە ١/٩/١٩٥٤ز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، گەڕاوە (باداوە) دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی، خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، تا ڕێکەوتی ٢٣/١٢/١٩٨٧ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (شێخ مەعروف) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: ژیاننامەی زانایە ئاینیە کۆچ کردووەکان ٣١٥ – ٣١٨.

## عبدالله عبدالقادر وەلزی ( ٧٧٧ )

ناوی عبداللّٰهیە، کوڕی عبدالقادری کوڕی مەلا عەلی (فەوزی)یە، خەڵکی گوندی (وەلزێ)یە، لە ناوچەی (بالەکان)، ساڵی ١٢٦٨ك – ١٨٥١ز هاتووتەدنیا، یەك بووە لە فەقێیەکانی مەلا عەلی (قزلجی)، شارەزا بووە لە ڕیازیات و مەنتیق و حیکمەت و کەلام، ماوەی بیست ساڵان خەریکی دەرسدانەوە بوو لە گوندی (پەسوێ) لای محەممەد ئاغای مامەشان، ساڵی ١٣١٣ك – ١٨٩٥ز چووە ناوچەی (بۆکان)، پاشان باری کرد بۆ (تورجان)، مەلا عبدالقادری کانی کبودی – کانی کەوەی – یەك بوو لە فەقێیانی ئەو.

کۆچی دوایی: شەوی هەینی ١٠ی مانگی (محرم) ساڵی ١٣٤٩ك – ١٩٣٠ز کۆچی دوایی کرد، لە تەك مەلا عەلی قزلجی مامۆستای خۆی بە خاك سپێردرا، مامۆستای وەلزی خێزانەکەی لە مەلا زادەکانی خزمی مەلا عەلی ئەشنەوی بوو.

کوڕەکانی: چوار کوڕی لێ هەبوو، هەموو بونە مەلا: مەلا عەلی و مەلا عبدالقادر و مەلا محەممەدئەمین و مەلا عبدالرحمان.

سەرچاوەکان:

١. ژیناوەری زانایانی کورد ٢٣٦ – ٢٣٧.
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٥٨.
٣. تأريخ فرهنگ وأدب مكريان ٢٩١ – ٢٩٢.

## عبدالله عبدالكريم سنەیی ( ٧٧٨ )

ناوی عبدالله یە، کوڕی مەلا عبدالکریمی کوڕی مەلا عارف کوڕی مەلا شەریفە، ساڵی ١٣١٣ك – ١٨٩٥ز هاتووتەدنیا، مامۆستایەکی بە دین و بەڕێز و بە سام بووە، لە مزگەوتی مەلا وەیسی لە شاری (سنە) پێش نوێژ و دەرس بێژ بووە، ساڵی ١٤٠٤ك – ١٩٨٣ز لە (سنە) کۆچی دوایی کردووە.

دانراوەکانی: (پەیام بە برادەرانی دینی) و (نامیلکەی مەنتیق – فارسی) و (نامیلکەی حیجاب – فارسی) و (کشف الغواية دەر ڕەدی شبهات) و (نامیلکەی

حیساب و جەبر) و (نامیلکەی دژی دیانەکان) و (نامیلکەی حەج) و (مەولودنامەی کوردی).

سەرچاوە: تأریخ مشاهیر کورد ٢/٥١٧.

## عبدالله عبدالكريم گڕاوی (٧٧٩)

ناوی عبدالله یە، کوڕی عبدالكریمی کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی عبدالله یە، لە گوندی (گڕاو)ی نزیك (سەریّ ڕەش) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: دەستی کرد بە خوێندن بەشێوەی فەقێیانی کوردستان، لە چەند شوێن گەڕا، تاکو قۆناغی سوختەیی بڕی، ئەمجا چووە (بەحرکە) لای مەلا عوسمانی شەوەکی، ماوەك لە (هەولێر) بوو لای مەلا ڕەسولی گڕاوی، دوایی چووە مزگەوتی قەڵات لای مەلا ئەبوبەکر (ئەفەندی)، پاشان چووە (ڕواندز) لای مەلا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی، ماوە لەویّ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: کۆتایی بە خوێند هینا، گەڕاوە گوندەکەی خۆیان (گڕاو) مەدرەسەی فەقێیانی نویّ کردەوە، ناوبانگی مەلایەتی ڕۆیشت، لە دور ڕا فەقێیان دەهاتنە لای، لەوانە: جەنابی شێخ مصطفای نەقشبەندی، مەلا عبدالرحمانی بەگزادە (لارە). دەڵێن: مەولانا خالیدی نەقشبەندی لە شارەزور هاتووتە (گڕاو)، ماوەك دەرسی لە لای مەلا عبدالله ی باپیری ئەو مامۆستا عبدالله یە خوێندووە.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٢٩ز کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی: چوار کوڕی هەبوون:

١. مەلا شەهاب: پێش نوێژ بوو لە مزگەوتێك لە (سەربەن).

٢. مەلا عبدالمجید: لە مەودوا بە درێژی باسی دەکەین – إن شاء الله –.

٣. حاجی محەممەد: قورئان خوێن و بە دینە.

٤. عبدالکریم.

سەرچاوە: دەستووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عبدالله عبدالطیف قەرەداغی (٧٨٠)

ناوی عبدالله یە، کوڕی عبداللطیفی کوڕی عبداللەی کوڕی عوسمانی کوڕی عبداللطیفی کوڕی شێخ مەعروف (دەرەقولە)یە، دەوری ساڵی ١٢٤٤ك – ١٨٢٨ز لە (قەرەداغ) هاتووەتەدنیا.

لە بنەماڵەیەکی ئایین پەروەر و ڕەوشت چاك پێگەیشتووە، لە قوتابخانەی باوك و باپیرانی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە خزمەت سیراجەدین شێخ عوسمانی تەویڵەیی تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت، زۆر پێ نەچوو لە لایەن شێخ کرا (خەلیفە)، بەو دڵپاکیە، دەروون ڕووناکیە سەرکەوت و پلەی بەرزی بە چەنگ هینا، توانی ئامۆژگاری خەڵکان بکا و بیان هێنێتە سەر شەقامی ڕاست، تەمەنەکەی بەو جۆرە بردە سەر، دەگێڕنەوە: لە هیکەوە شەوێك (شێخ) بانگی مریدەکانی کرد، فەرمووی: وەرن نوێژی مردوو (صلاة الغائب) بە جەماعەت لەسەر مەلا عبدالله بکەین، نوێژەکەیان کرد، پاش چەند ڕۆژ خەبەر هات کە مامۆستا کۆچی دوایی کردووە، کە ئەوە کەرامەتێکی شێخ سیراجەددین بووە، دەنا چۆن بە مردنی زانی؟

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٥٧.

## عبدالله عوسمان قەرەداغی (٧٨١)

ناوی عبدالله یە، کوڕی عوسمانی کوڕی شێخ عبداللطیفی گەورەیە، زانایەکی مەزن بووە، یەك بووە لە مەلایە چاکەکانی سەردەمی خۆی، خەریکی دەرس دانەوە و خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بووە تا کۆچی دوایی کرد.

سێ کوڕی مەلای هەبوون: (شێخ محەممەد ئەمین) و (شێخ حەسەن): مەلا بوو لە (کفری) و (شێخ عبداللطیف): لەو مەودوا باسی دەکەین – بە ئیزنی خودا –.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٥٦ – ٣٥٧.

## عبدالله عەلی ژەنگاری (٧٨٢)

ناوی عبدالله یە، کوڕی عەلی کوڕی عومەرە، ساڵی ٧٢٢ ك -١٣٢٢ز لە (ژەنگار) هاتووتەدنیا، لە (ژەنگار) و (ماردین) و (موصل) و (هەولێر)ی خوێندووە، دوایی چوویتە (دیمشق)، پاشان چووە (میصر) لەوێ کرا (مدرس) و (موفتی)، گەڕاوە (دیمشق)، مامۆستا مەزهەبی حەنەفی بوو، شەرع زان و نووسەر و شاعیر بوو، زاتەکی بێ فیز و بە خوڵق و خو بوو، قسەخۆش و هێمن بوو، چیرۆکی پەندی پێشینانی زۆر لەبەربوون، لە مانگی ڕەبیعی دووەمی ساڵی ٧٩٩ك - ١٣٩٧ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: (البحر الحاوي في الفتاوي) و (نظم المختار) و (نظم السراجية في الفرائض) و (نظم سلوان المطاع).

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/٣٥٨ - ٣٥٩.
٢. مشاهير الكورد ٢٨٧.
٣. معجم أعلام الكورد ٣٩٠.
٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٦٥٦.
٥. تاج التراجيم ١٧٩.
٦. كشف الظنون ٢/١٢٤٩.
٧. معجم المؤلفين ٦/٩٢.
٨. هدية العارفين ١/٤٦٨.

## عبدالله عەلی ضیائی (٧٨٣)

ناوی عبدالله یە، کوڕی شێخ عەلی یە، یەك بووە لە زانایەکانی تەریقەتی نەقشبەندی ساڵی ١٩١٠ز لە (کەرکوك) هاتووتەدنیا، لە لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (هەولێر) ماوەیەك لای قازی محەممەد ئەسعەدی خوێند، پاشان گەڕاوە (کەرکوك)، ماوەك لای مەلا عبدالمجیدی قوطب و ماوەك لای مەلا ئەحمەدی مەلا

حەکیم، ساڵی ١٩٣٢ز کۆتایی بە خوێندن هینا، ساڵی ١٩٣٥ز کرا مەلا لە مزگەوتی (یایچی)، ساڵی ١٩٣٧ گواستراوە مزگەوتی حەبیب ئاغا لە (کەرکوك)، لە ١٩٤٥ز چووە (داقوق)، لە ١٩٥٣ کرا پێش نوێژ و وتارخوێن لە (پردێ)، لە ١٩٦٢ز چووە مزگەوتی نائیب لە (کەرکوك)، لە ١٩٦٦ز چووە مزگەوتی (دەباش) لە (بەغدا)، لە ١٩٦٧ز کرا واعیز لە مزگەوتی حوسێن عاص، لە ١٩٧٧ز خانەنشین کرا.

سەرچاوە: تأريخ علماء بغداد ٤٢٢.

## عبدالله عیسا حەیدەری (٧٨٤)

ناوی عبدالله یە، کوڕی غیاسەدین عیسای کوڕی صبغةاللهی حەیدەریە، لە شاری (بەغدا) چاوی خۆی هەڵێناوە لە دنیا، زانایەکی بەناوبانگی سەردەمی خۆی بوو، لە (بەغدا) کرا (مدرس) و (موفتی) شافیعییەکان، حاشیەی لەسەر توحفە هەیە، لە دەوروبەری ساڵی ١٢٣٣ك - ١٨١٧ز کۆچی دوایی کرد، مەلا محەممەدئەمینی کوڕی دوای خۆی کرا (موفتی) بەغدا، ئەویش کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی هەبوو:

١. محەممەد دەروێش حەیدەری.
٢. محەممەد صالح وەجیهی: زانایەکی مەزن بووە، لە وڵاتانی ئیسلام گەڕاوە، چوویتە (ئەستەمبۆڵ) دوای گەڕانەوە، کتێبی (التحفة الحيدرية في خدمة الدولة العلية)ی داناوە، بۆ هاندانی خەڵك، گوێ ڕایەڵی فەرمانی حکومەتی عوسمانی بکەن.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٢١ - ١٢٩ - ١٣٠ - ١٥٠.
٢. علماء ومدارس في أربيل ٥٤.
٣. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٢٦٥.

## عبدالله عیسا کوردی ( ٧٨٥ )

ناوی عبدالله یە، کوڕی عیسای کوڕی عبداللّٰهیە، مەزهەبی شافیعی بووە، لە (قاهیرە) دابەزیوە، زانیاری قورئانی پیرۆزی خوێندووە، تا سەرکەوتووە، دەرسی داوە، سەفەری حەجی کردووە، ساڵی ٨٨٣ك – ١٤٧٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ٥/٣٧.

٢. مشاهیر الکورد ٢٩٤.

٣. معجم أعلام الکورد ٣٩٠.

## عبدالله فەرهاد فەرهادی ( ٧٨٦ )

ناوی عبدالله یە، کوڕی فەرهادی کوڕی مەولودی کوڕی عوسمانە، تیرەی (ممەمان)ە، لە دەوروبەری ساڵی ١٩١٨ز لە گوندی (لهێبان) هاتووتەدنیا، پاش دوو ساڵ باریان کرد بۆ (هێلەوە)، یەك مانگ لەوێ مانەوە، چوونە (گردعازەبان) لەوێ باوکی کۆچی دوایی کرد، لە تەمەنی حەوت ساڵان لەبەر خوێندنیان دانا، پاش خەتم کردنی قورئانی پیرۆز و تەواوکردنی نامیلکە فارسییەکان – باغەبان و نان و ماست و جورم بەخش – دەستی کرد بە (گولستان) لە لای مەلا ئەحمەدی گەزنە، دوایی چووە (خورمەلە)، دوایی چووە (خۆران) لای مەلا خضری دەشتی، چووە (ئازیانە)، چووە (سیاو) چووە (دالداغان) چووە (نۆغەران) چووە (باداوە) چووە (پیرداود) چووە (دووسەرە) چووە (خرابگە) لەو هەموو شوێنانە زۆربەی دەرسەکانی، لە لایەن برایەکانی خۆی بوو – مەلا صادق و مەلا محەممەد و مەلا سەعید و مەلا ئیبراهیم – دوایی چووە (عالـلا) لای مەلا مصطەفا قەرەبەگی، چووە (گردمەلا) چووە (دۆلەزە) چووە (باشتەپە) چووە (پیرزین) مەدرەسەی مەلا ئیسماعیلی سوسەیی، ساڵی ١٩٣٥ز چووە (هیران) دوایی چووە (ئاخورە) چووە (کۆیە) گەڕاوە خۆشناوەتی: (شیرە) و (کونەفلوسە) و (بێلینگە) و (سوسێ).

ساڵی ١٩٤٠ز چووە تەکیەی خەلیفە کەریم لە (کەرکوك)، ساڵی ١٩٤١ز گەڕاوە (کردەسۆر) چووە (قەشقە) چووە (گراو)ی قەراج، چووە (بالیسان)، گەڕاوە (شیرێ) چووە (ئۆمەراوە) چووە (قوشقایە)، چووە مزگەوتی شێخ نورەدین لە (هەولێر) لای مەلا صالحی کۆزەپانکەیی، چووە (جدیدەی لەك)، چووە (ماجید) گەڕاوە (هەولێر) مەردەسەی شێخە ڕەشکە، گەڕاوە (ماجید) چووە (ماجیداوە) چووە (عەوێنە) لای مەلا عوسمانی خورمەڵە، گەڕاوە هەولێر لای عێزەدین ئەفەندی لە (قەڵات) ئیجازەی وەرگرت.

ئەمجارە بۆ پەرەپێدانی زانیاری ڕووی کردە شاری (بەغدا) لەوێ لە مەدرەسەی سولەیمانیە، لای مەلا ئەمجەد ئەفەندی زەهاوی، دەستی بە (مینهاجی بەیزاوی) کرد، وە لە لای مەلا محەممەدی قزلجی دەستی کرد بە سەرەتای تەفسیری (کشاف)، لە لای مەلا سولەیمانی تورك لە مەدرەسەی (عبدالالە) دەستی کرد بە (جمع الجوامع) و (تهذیب الکلام)، هەر لە (بەغدا) ئیجازەی (علوم الحدیث)ی لە شێخ محەممەدی شەنقیطی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا، لە (سوریژە) مەدرەسەی فەقێیانی هەبوو.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبدالواحیدی (دارەتوویی)، مەلا صابیری (دارەتوویی)، مەلا ئەسعەدی (دارەتوویی)، مەلا عبدالقادر (کونەگورگی).

قۆناغەکانی فەرمانبەری: لە ١٨/٦/١٩٤٧ز، کرا (واعیز)، دوایی لە دادگای شەرعی هەولێر، کرا کاتب، ساڵی ١٩٥٧ز چووە دادگای (موصل)، گەڕاوە (هەولێر) کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی (مەلا نەبی)، ساڵی ١٩٦٠ز بەشداری دەورەی مامۆستایەتی کرد، لە (کەرکوك) ساڵی ١٩٦١ز کرا مامۆستا لە وەزارەتی پەروەردە، ماوەك لە گوندی (گاینج) بوو پاشان گەڕاوە وەزارەتی ئەوقاف کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن لەو مزگەوتەی خۆی دروستی کرد، دەکەوێتە باشوری مزگەوتی (صەووافی) ئێستا.

دانراوەکانی:

١. إيقاع الخلاف: لە ١٩٥٦ز چاپ کرا.

٢. لمعة البيان في التجويد: لە ١٩٥٢ز چاپ کرا.

٣. أحسن الصياغة في البلاغة: دووجار چاپ کراوە.

٤. الحج المبرور لە: ١٩٥٧ز چاپ کرا.

٥. الإكليل في محاسن أربيل: لە ٢٠٠١ز چاپ کرا.

٦. منافع الصوم ومضار الخمر: لە ١٩٥٧ز چاپ کرا.

٧. حديث الازهار في مولد المختار لە: ١٩٨٥ز چاپ کرا.

٨. فەرائیزی رەحەبییە: هۆنراوەیە، چاپ کرا.

٩. بغية الحكام.

١٠. وجها لوجه رسول الله: چاپ کرا.

١١. تبصرة المبتدي: نظم المقاصد النووية.

١٢. مێرغوزار: دیوانی شیعرە چاپ کرا.

١٣. أزاهير في رياض الأدب وجواهر من بلاغة العرب.

١٤. مەولودنامەی کوردی.

١٥. قدسية المسجد.

١٦. مناهل الحكمة.

١٧. کورتە مێژووی هەولێر.

١٨. نزاهة القرآن الكريم.

سەرچاوەکان:

١. إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الاسلامية ٢١٢.

٢. الإكليل في محاسن أربيل ٣٩١ – ٣٩٨.

٣. خۆری ئیسلام، ژمارە ١٢ / ٢٠٠١ز.

## عبدالله قادر عەبابەیلیٚ (٧٨٧)

ناوی عبدالله یە، کوڕی شێخ قادرە، خەڵکی گوندی (ئەبوعوبەیدەیە)، دەوری ساڵی ١٢٩٥ك – ١٨٧٨ز هاتووتەدنیا، لە منداڵییەوە دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە (بیارە) تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عومەر وەرگرت، خەریکی خوێندن بوو تا کۆتایی پیٚ هینا، زاتێکی خواناس و ڕوو لە خوا و دوور لە دنیا بوو، بۆیە ناوبراوە بە (ئیلاهی) – واتە: خوایی – هۆدەکی داری بۆ خۆی لە مزگەوت دروست کرد بوو، دەرسی لیٚ دەداوە، دەرکە هەبوو لەو هۆدەیە بۆ مزگەوت، یا دەرسی دەداوە، یا دەچووە مزگەوت.

دانراوەکانی:

١. الوضع المحمدي: بۆ محەممەدی کوڕی دایناوە.

٢. نامیلکەی بەیان: سەرەتایەکەی بە (الحمد لله حمدا یوافي نعمه، ویکافيء مزیده) دەست پیٚ دەکا.

٣. نامیلکەك دەربارەی (تاپۆ)ی عوسمانی.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٥٧ك – ١٩٣٨ز لە گوندی (عەبابەیلیٚ) کۆچی دوایی کرد، سیٚ کوڕی هەبوو:

١. مەلا محەممەد: مزگەوتی (دارالاحسان)ی دروست کرد لە (هەڵەبجە).

٢. مەلا عبدالقادر: لە (خانەقین) مەلا بوو.

٣. ئەحمەد.

سەرچاوەکان:

١. یادی مەردان ٢/ ٥٧٥ – ٥٧٦.

٢. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/١٣٠ – ١٣١.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٦٠ – ٣٦١.

## عبدالله قاسم عبدالله شارەزوری ( ٧٨٨ )

ناوی عبدالله یە، کوڕی قاسمی کوڕی عبدالله ی شارەزوری یە، زانایەکی مەزن و شەریعەت زان بووە، کتێبی (المهذب)ی ئەبو ئیسحاقی شیرازی کورت کردیتەوە، لە مانگی ذوالحجەی ساڵی ٥٧٥ك – ١١٨٠ز لە شاری (موصل) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. المنتظم ١٠/٥٣٩.

٢. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٨٠.

٣. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ٢/١١١.

## عبدالله قاسم مظفر شارەزوری ( ٧٨٩ )

ناوی عبدالله یە، کوڕی قاسمی کوڕی مظفری کوڕی عەلی کوڕی قاسمی شارەزوریيە، نازناوی (ئەبومحەمەد)ە، مەزهەبی شافیعی بووە، زانایەکی ئەهلی تەصەووف بووە ساڵی ٤٦٥ك – ١٠٧٢ز هاتووتەدنیا، لە (موصل) کرایتە قازی، کتێبی (القصيدة الموصلية)ی، دەربارەی تەصەووف داناوە، لە ٥١١ك – ١١١٧ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. تأريخ أربيل ١/٢٠٢ /٢/ ٣٤١.

٢. وفيات الاعيان ٢/٢٥٢ – ٢٥٥.

٣. البداية والنهاية ١٢/١٩٦.

٤. هدية العارفين ٥/٤٥٤.

٥. أربيل في مختلف العصور ٢٢.

٦. مشاهير الكورد ١/٢٦٢.

٧. شذرات ٤/١٢٤.

٨. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٣٤.

٩. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٨٠.

١٠. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ٢/٩٧.

١١. تأريخ مشاهير كورد ١/٣٤ – ٣٥.

## عبدالله کانی سانانی (٧٩٠)

مامۆستا عبدالله، لە گوندی (کانی سانان)ی، سەر بە (مەریوان) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە چەند شوێنان گەڕا، دوا قۆناغ چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادر، هەر لەوێ تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ نەجمەدین وەرگرت، خەریکی ئامۆژگاری خەڵکان و دەرسدانەوە بوو، تا ساڵی ١٣٣٢ك – ١٩١٢ز لە بانەوە کەوتە خوار، لە ئەنجامدا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٦٤.

## عبدالله گەلالی (٧٩١)

مامۆستا عبدالله گەلالی، زانایەکی مەزن و بە تەمەن بووە، دەرسی لە لای مەلا محەمەد ئبن ئادەمی ڕووستەیی خوێندووە، هاوچەرخ بووە لەگەڵ مەلا محەمەدی خەتێ، دەرسی بە مەلا ئەحمەدی گەلالی و مەلا ئیبراهیمی ڕمکی، داوە.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٤٥.

٢. علماء ومدارس في أربيل ١٠٠.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٣٧.

٤. بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندز ٣١.

## عبدالله کوردی (٧٩٢)

مامۆستا عبدالله کوردی لە چیایەکانی کوردستان هاتووتەدنیا، بۆ خوێندن چوویتە (بەغدا) دوایی چوویتە (دیمشق) لەوێ نیشتەجێ بووە، پاشان گۆڕانکارییەك هاتە سەر ژیانی، کتێبەکانی خۆی هەموو فڕەدا ناو ئاو، مامۆستا زانایەکی بەڕێز بوو، خەڵکان بە کەرامەتداریان دەزانی، ساڵی ١٠٠٣ك – ١٥٩٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. جامع كرامات الأولياء ٢/٢٦١ - ٢٦٢.

٢. غاية المرام ٢٧٠.

٣. خلاصة الأثر ٣/٨٥.

٤. معجم أعلام الكورد ٣٩٩.

٥. مشاهير الكورد ٢٩٠ - ٢٩١.

## عبدالله ماردینی (٧٩٣)

مامۆستا عبدالله، نازناوی جەمالەدینە خەڵکی ماردینە، لە زانایە ئەستێرەناسەکانی صەدەی نۆیەمینە، ساڵی ٨٤٣ك - ١٤٣٩ز کتێبی (النجوم الزاهرات، في العمل بربع المقنطرات)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٦/١٠٥.

٢. كشف الظنون ٢/١٩٣٢.

## عبدالله محەممەدئەمین بێتواتی (٧٩٤)

ناوی عبدالله یە، کوڕی مەلا محەممەدئەمینی کوڕی مەلا شێخ محەممەدی کوڕی مەلا داودی کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی مەلا حوسێنە، ساڵی ١٣٠٩ك - ١٨٩١ز هاتووتەدنیا.

خوێندنی: دەستی کرد بە خوێندنی قورئانی پیرۆز، چەند نامیلکەی سەرەتایی خوێندن، دەستی کرد بە شەرحی موغنی، لەو کاتە تەمەنی ١٢ ساڵان بوو،ماڵیان بارکرد بۆ (هەولێر) ماوەك لەوێ بوون، ماوەك چووە (بەحرکە) لای مەلا عوسمانی شەوەکی، دوایی گەڕاوە بۆ (هەولێر)، لە مزگەوتی حاجی قادر لەگەڵ فەقێیەکانی باوکی خەریکی خوێندن بوو، هەروەها دەرسی بە فەقێیەکانی بەرەژێری خۆی دەدا، تا ساڵی ١٩٢١ز ئیجازەی مەلایەتی لە باوکی وەرگرت.

مەلایەتی: کرا پێش نوێژ و دەرس بێژ لە مزگەوتی حاجی قادر، ووتارخوێن لە مزگەوتی شێخی چۆلی، فەقێیانی باوکی و فەقێیانی خۆی لە دەورەی کۆبوونەوە، تاقمەکی بەرێ دەکردن چینەکی نوێ جێیان دەگرت، ئەوەی نووسراوە تا ساڵی ١٩٥٥ز صەد و بیست و پێنج ئیجازەی مەلایەتی داوە.

دانراوەکانی: (نادی الإسلام في علم الكلام) و (الجهاد في التقليد والإجتهاد) و (الوسيلة) و (الصيام) و (القبلة) و (القصر والجمع) و (طلاق الأكراد) و (تحقيق الإسلام) و (المدفع الرحماني في الرد على القادياني) و (المنحة الوهبية في شرح الإرادة الجزئية لمولانا خالد الشهرزوري).

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٦١ز کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی مەلای هەبوون: مەلا عەلی و مەلا فائیز، لە مەودوا باسیان دەکەین - إن شاء الله -.

سەرچاوەکان:

١. نادي الاسلام ٢ - ٤.
٢. أربيل في مختلف العصور ١٣٤.
٣. علماء ومدارس في أربيل ٩٧.
٤. محمد بن عبدالله الجلي ١٣١.
٥. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٣/١٠٥ - ١٠٨.

## عبداللە محەممەد بێتوشی (٧٩٥)

ناوی عبداللە یە، کوڕی محەممەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عێزەدینی ئالانی بێتوشی یە، مەزهەبی شافیعی بووە، یەکەم جار باوك و باپیرانی لە گوندی (خانخل) بووینە، پاشان باریان کردووە بۆ (بێتوش)، لەوێ لە دەوروبەری ساڵی ١١٣٦ك - ١٧٢٣ز مامۆستا هاتووتەدنیا.

خوێندنی: قورئانی پیرۆز و چەند کتێبی نەحو و صەرف و ڕێزمانی عەرەبی لە خزمەت باوکی خوێند، تەمەنی پازدە ساڵان بوو باوکی کۆچی دوایی کرد، لەگەڵ مەلا

مەحمودی برای چووە گوندی (سنجۆی) لای مەلا محەممەدی (ابن الحاج)، پاشان چووە لای مەلا صبغةالله ی ئیبراهیم حەیدەری دووەم.

مەلایەتی: لەگەڵ مەلا مەحمودی برای چووە شاری (ئەحسا) – عەرعەر –، حاکمی شارەکە هەر یەکی دانان بە (مدرس) لە مزگەوتێك، هەر لەوێ کتێبی (کفایە)ی دانا، پێشکەشی کرد بە شێخ ئەحمەدی (ئەحسائی)، وە لە ساڵی ١١٧٢ك – ١٧٥٨ز شەرحی ئەلفییەی نووسیەوە، وە لە شاری (مبرس) ساڵی ١١٧١ك کتێبی (زوبەد)ی نووسیەوە، پاشان لەگەڵ مەلا مەحمودی برای گەڕاوە (بێتوش)، ساڵی ١١٧٩ك هۆنراوەی عەروز و قەوافی دانا، ساڵی ١١٨٠ك دووبارە گەڕاوە (ئەحسا) لە ڕێگای (بەصرە)، ساڵی ١١٨١ك چوار بەرگی شەرحی بەهجەی شێخ زەکەریای ئەنصاری نووسیەوە، ساڵی ١١٨٦ك گەڕاوە (بێتوش)، پاشان سەفەری گوندی (هەزار مەرد)ی کرد بۆ زیارەتی مەلا محەممەدی (ابن الحاج)، لەوێ لە هۆدەکەی تایبەت بە شێخ مەعروف نۆدەیی دابەزی، ماوەك لەوێ ماوە، دەرسی شیعر و ئەدەبیاتی بە شێخ مەعروف دەداوە، ساڵی ١١٨٨ك کوردستانی بەجێهێشت چووە (بەغدا)، ساڵی ١١٨٩ك کرا (مدرس) لە قوتابخانەی (ڕەحمانیە) لە (بەصرە)، هەر لەوێ ساڵی ١١٩٠ك (زەواجیر)ی بن حەجەری کردە هۆنراوە، گەڕاوە شاری (ئەحسا) شێخ ئەحمەدی حاکمی شارەکە زۆر ڕێزی لێنا، دەنگوباسی مەلا چاکی بەلاوبۆوە، خەڵکەکە بە جارەك ڕوویان تێ کرد، ئەویش درێغی نەکرد لە دەرس و نووسین و ئامۆژگاری.

خووڕەوشتی: زاتەکی دیمەن گچکە بوو، ڕەنگ ئەسمەر بوو، خوێن شیرین بوو، لە سەرەتاوە خەریکی تەسەووف بوو، پاشان پتر خەریکی خوێندن بوو، حەزی لە زانیارییەکانی قورئانی پیرۆز دەکرد، بە دەست کورتی ڕازی بوو، دنیاداری نەدەکرد، نەفس بەرز بوو، چاوی لە دەستی کەس نەبوو، جەماعەتی نەدەچوو، خەڵکی هان دەدا بۆ وەفاداری، ڕکی لە پیاوی سفرە دەبۆوە.

پلەی مەلایەتی: زانایەکی بەرز بوو، لە زانستەکان شارەزا و پسپۆڕ بوو، ناودەبردرا بە (سیبەوەیهی) دووەم، لە عەرەبی و کوردی و فارسی زمان ڕەوان بوو، هەر چوار بەرگەکانی قاموسی فەیرۆز ئابادی، لەگەڵ مەقاماتی حەریری هەر هەمووی لەبەر بوون، قەصیدەیەکی پێشکەش بە مامۆستا مەلا محەممەد (ابن الحاج) کردووە سەرەتایەکەی ئەوەیە:

یا سیدي زاد اکتسابي في الهوىٰ ‌ ‌ ‌ ‌ کربي علا، من زفرتي وعویلي

ئەو قەصیدەیە، وەکو سیحرە ڕۆشنبیران لێ وەستاون و داماون، شاعیران زمان کورت و قەڵەم شکاون، فەقێیان دەڵێن: (مەلای ئێمە وا سەرکەوتووە، لە حوجرە و لە سەر حەسیری مزگەوت ئەم زاتە دەرچووە)، خۆی یەك قەسیدەیە لە بەحری (کامیل) گۆڕانکاری بکەی شازدە قەسیدەی تری لێ دەردەچی، شێخ محەممەدی خاڵ، لە کتێبی (البیتوشی) لاپەڕەی ٤٣ تا ٥٣ بە درێژی لێدوایە و ڕۆنی کردتەوە.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٢١٠ك – ١٧٩٥ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: چەند دانراوی خۆی هەیە، لەوانە:

١. منظومة الکفایة: لە ١١٩١ك دایناوە، لە ١٢٨٩ك – ١٨٧٢ز لە ئەستەمبوڵ چاپ کرا.
٢. صرف العنایة شرح الکفایة: لە ١١٩٨ك لە (ئەحسا) دایناوە، لە ١٣٤١ك لە میصر چاپ کراوە.
٣. الحفایة شرح الکفایة: لە ١١٩١ك لە (ئەحسا) دایناوە.
٤. اللؤلؤالمنقوش: شرح الکفایة.
٥. منظومة زواجر ابن حجر.
٦. شرح منظومة الزواجر.
٧. حاشیة علی شرح الفاکهي في النحو: لە ١٢٠٩ك دایناوە.
٨. منظومة حدیقة السرائر: ساڵی ١١٩٠ك دایناوە.

٩. نظم الكافي في العروض والقوافي: ساڵی ١١٥٥ك دایناوە.

١٠. طريقة البصائر، شرح حديقة السرائر لە: ١١٩٥ك دایناوە.

١١. منظومة المكفرات: ساڵی ١١٩٤ك دایناوە.

١٢. المبشرات شرح المكفرات: لە ١١٩٤ك دایناوە

١٣. خلاصة الوافي بحل نظم الكافي: ساڵی ١١٧٩ك دایناوە.

١٤. تحفة الخلان: في شرح الألغاز العربية.

١٥. حاشية على البهجة المرضية للسيوطي.

١٦. منظومة في الأفعال التي استوى فيها اللزوم والتعدي.

١٧. شرح هذه المنظومة.

١٨. منظومة في الأفعال الواوية واليائية.

١٩. شرح هذه المنظومة.

٢٠. منظومة الموائد المبسوطة.

٢١. منظومة في المصادر الشاذة.

٢٢. منظومة في المؤنثات السماعية.

٢٣. منظومة تعداد حروف المعاني.

٢٤. منظومة خصائص الأسماء.

٢٥. منظومة في كتابة لفظ (ابن).

٢٦. مقطوعه في بيان علامات الأفعال.

٢٧. مقطوعة في بيان أسماء الخيل.

٢٨. مقطوعة في بيان أسماء الضيافات.

٢٩. مقطوعة في بيان استتارالضمير.

٣٠. مقطوعة فيما جاء مونثه على فعلانة.

٣١. مقطوعة في صيغ العموم.

٣٢. مقطوعة في بيان بعض خصائص النبـي صلى الله عليه وسلم.

٣٣. حاشية على (الطرة)

٣٤. تەرجومەی (مەلحەمەی دانیال) لە فارسی، بۆ عەرەبی، لە ١١٧٩ك نووسیوە.

٣٥. منظومة في مثلثات الأسماء والأفعال، ساڵی ١١٩٠ك دایناوە

٣٦. شرح منظومة مثلثات الأسماء والأفعال.

سەرچاوەکان:


١. الأعلام ٢/٦١ /٤/٢٧٥ /١٠/١٣٦.

٢. البيتوشي / محمد الخال.

٣. ژیناوەری زانایانی کورد ٣٥٤ – ٣٦١.

٤. هدية العارفين ٥/٤٨٧.

٥. معجم أعلام الكورد ٣٩٣.

٦. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/٧٥ – ٧٦.

٧. مشاهير الكورد ٢/٣٧ – ٣٨.

٨. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٤١ – ٣٤٨.

٩. معجم المؤلفين ٦/١٣٨ – ١٣٩.

١٠. مێژووی ئەدەبی کوردی ٣/٣٦.

١١. تأريخ السليمانية ٢٦٩ – ٢٧١.


## عبداللە محەممەد توتمەیی (٧٩٦)

ناوی عبداللە یە، کوڕی مەلا سەید محەممەدی کوڕی سەید قادرە، خەڵکی گوندی (توتمە)ی خۆشناوەتی یە، ساڵی ١٩٢٩ز هاتووتەدنیا، تەمەنی پێنج ساڵان بوو باوکی کۆچی دوایی کرد لە گوندی (چل هەوێزە)، بۆ خوێندن و پەروەردەکردن ناردیانە لای شێخ محەممەدئەمینی زێخان، ئەویش زاتەکی خێرخواز بوو، هێتیمی بەخێودەکردن، لە ڕاهی خودا.

خوێندنی: دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (زێوە) لای مەلا عبداللّٰەی هەرتەلی، لەوێ چووە (خەتێ) لای مەلا ئیبراهیم، لەوێ چووە (ڕواندز) لای مەلا عبدالکریم ئەفەندی، پاشان هاتە (هەولێر) مزگەوتی حاجی قادر، لای مەلا عبداللّٰە ی بێتواتەیی، کۆتایی بە خوێندن هێنا، ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (هەرمك)، دوایی باری کرد بۆ (دەراش)، لەوێ چووە (گۆمەشین)ی قەراج، ماوەکیش مەلا بوو لە (گەزوك)، دوایی گەڕاوە (توتمە)، لەوێ هاتە (شاوێس)، ساڵی ١٩٥٣ز چووە (خورماڵ)، لە ١٩٥٦ز چووە (چەمچەماڵ)، ساڵی ١٩٦١ز هاتە هەولێر لە قوتابخانەی ئاینی (قەلات) دەرسی دەدا، پێش نوێژ و وتارخوێن بوو لە مزگەوتی حاجی عبدالله حەمامچی لە گەڕەکی (تەیراوە)، دوایی چووە مزگەوتی حاجی بەکر زێڕینگر، لە گەڕەکی (ئیسکان).

خووڕەوشتی: ڕووخۆش بوو، دیمەن جوان بوو، دەم بە پێکەنین و قسەخۆش بوو، حەزی لە تێکەڵاتی و هاتووچۆ بوو، گران و بەوێر بوو، حەق گۆ بوو، لەسەر دین بە جواب بوو، نووسەر و شاعیر بوو، بە کوردی و عەرەبی شیعری هەیە، نازناوی (عاجیز)ە.

کۆچی دوایی: لە کاتی وتارخوێندنەوەی ڕۆژی هەینی تووشی نەخۆشییەکی کوشندە هات، بانگی مەلا ئیسماعیل محەممەد میکائیلی کرد وتارەکەی تەواوکرد، مامۆستایان بردیانە نەخۆشخانەی (هەولێر) لەوێ چارەی نەکرا، بردیانە (موصل) لەوێ لە بەرواری ٢/٥/١٩٦٧ز کۆچی دوایی کرد، لە مزگەوتی یونس پێغەمبەر (د.خ) شووشترا، لەوێ کۆمەڵێك مەلایان هێنایانەوە (هەولێر)، منیش لە خزمەتیان بووم، لە گۆڕستانی مزگەوتەکە بە خاك سپێردرا.

کوڕەکانی: سێ کوڕی هەبوون:

١. مەلا سەید محەممەد: لە جێی باوکی دانرا، لە قوتابخانەی ئەوقاف دەرسی دەدا، لە چەند شوێنان لە هەولێر وتاری هەینی دەخوێندەوە.

٢. سەید ئەحمەد: مامۆستای قوتابخانەیە.

٣. سەید مەهدی: ساڵی ١٩٦٩ز جوانەمەرگ بوو.

بەرهەمەکانی:

١. الروض الفصيح تخميس بردة المديح: لە ١٩٥١ز دایناوە.

٢. مواهب الرحمان: لە ١٩٥٤ز دایناوە.

٣. كشف الأسرار لدقائق الانظار.

٤. ضيافة الأمراء: ساڵی ١٩٥٤ز دایناوە.

٥. حەج نامە.

٦. الزهرة النضرة: ژیانی پێغەمبەرە (د.خ) لە ١٩٦٥ز دایناوە.

٧. دیوانی عاجز: کوردی و عەرەبی: ساڵی ١٩٨٦ز لە بەغدا چاپ کرا.

تەرجومەی شیعرێکی مەولەوی کردووە دەربارەی (میعراج) لە کوردی وەلای زمانی عەرەبی هەر بە هۆنراوە، بە ڕاستی ئازاییەکی زۆری تێدا هەیە، کاکم مەلا طەیب دەڵێ: {کاتێ لە مزگەوتی شێخ مصطەفام دەخوێند لە (هەولێر) مەلایان زۆرباسی جوانکاری و ڕەوانبێژی شیعری سەید عبدالرحیمی مەولەوی یان دەکرد، کە دەربارەی میعراجی خۆشەویست (د.خ) دایناوە، دەڵێ:

ڕێی چەند هەزار ساڵ طەی چەند حیجابات

زاتی حەق، کەلام، سوئاڵ جەوابات

چوو، بوو، دی، وتی، کریا و، دریاوە

هاتەوە حەلقە، هەر دەلەر یاوە

مامۆستا سەید یەکسەر فەرمووی منیش دەتوانم بکەمە عەرەبی، پاش چەند ڕۆژ هاتەوە، تەرجوومەی کردبوو، بەم جۆرە:

درب كم الفِ من الأعوام، وكم حجبا بلا ظلام

ربه الحق، كلاما، سؤال، جواباته بدون ملال

قطع، طوى، رأي، وقال، وجه، ردت، رجع، ال

ولما تسكن حلقة الباب، والوضوء يجري على التراب[١]

لە کۆتاییدا نووسی (المترجم عبدالله الحسيني البرزنجي، كتبها في ١٥/٦/١٩٦٦م في مسجد الشيخ مصطفى بأربيل، تبقى تذكرة عند الاخ ملا طيب العزيز).

## عبدالله محەممەد جەلی (٧٩٧)

ناوی عبدالله یە، کوڕی محەممەد مەلا زادەی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەسەنی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەسەنی کوڕی مەلا ئەبوبەکری کوڕی شێخ ئیبراهیمی جزیرییە، ساڵی ١٧٠٤ز هاتووتەدنیا، خوێندنی تەواو کردووە، ئیجازەی مەلایەتی لە مەلا محەممەد خضر حەیدەری وەرگرتووە، زانایەکی بەناوبانگی چەرخی خۆی بووە، بەشێوەی باب و باپیرانی خزمەتی فەقێیان و مزگەوتی کردووە، ئەو مامۆستایە باپیرەی مامۆستایە بەناوبانگەکانی گوندی (جەلە)، کە نازناویان بە (جەلیزادە) تۆمارکراوە، ساڵی ١١٨٠ك – ١٧٦٦ز کۆچی دوایی کرد، مەلا عبدالرحمانی جەلی کە لە پێشدا بە درێژی باسمان کرد کوڕی ئەو زاتەیە.

سەرچاوەکان:

١. المصقول ٥.

٢. محمد بن عبدالله الجلي ٨٤.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٥٠.

## عبدالله محەممەد جۆزی (٧٩٨)

ناوی عبدالله یە، کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالله یە، خەڵکی گوندی (جۆزە)یە، لە ناو چیایەکانی ناوچەی (هەکاری) لە تورکیا، دەرسی لە لای ئەبو ئیسحاقی کوڕی

---

[١] ئەو ڕستەیە: (والوضوء يجري على التراب)، مانایەکەی لە شیعرەکەی مەولەوی دا نیە، بۆ ڕێککەوتنی کێشەکە لەسەری زیاد کردووە.

ئیلیاسی جیلی خوێندووە، (هبةاللە)ی شیرازی فەرموودەناس یەکە لە فەقێیەکانی ئەو زاتە. لە (جۆزە) لە خزمەتی خوێندووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم البلدان ٢/١٨٤.

٢. معجم أعلام الكورد ٣٩٢.

## عبداللە محەممەد دێرەبڕوشەیی (٧٩٩)

ناوی عبداللە یە، کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی مەلا حەسەنە، خەڵکی گوندی (دێرەبڕوشە)یە، سەر بە ناحیەی (حەریر)، باوکی باری کرد هاتە (هەولێر)، پاش بیست و هەشت ساڵ، واتە: ساڵی ١٨٧٤ز مامۆستا عبداللە لە گەڕەکی عارەبان لە هەولێر هاتە دنیا، لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە مزگەوتی شێخ عبداللە، لە لای مەلا شێخ نیعمەتواللە کۆتایی بە خوێندن هینا، ساڵی ١٩٠١ز بووە مەلا لە (دێرەبڕوشە)، ساڵی ١٩٠٤ز باوکی کۆچی دوایی کرد، ئەویش گەڕاوە (هەولێر) لە مزگەوتەکەی ئەو دەستی کرد، بە جێبەجێ کردنی کاروباری ئاینی، وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی شەرعی، بەتایبەت مەزهەبی ئیمامی شافیعی (خوا لێی رازی بێ)، لە بەرواری ٢٤/١٢/١٩٥٦ز کۆچی دوایی کرد، دوو کوڕی هەبوو:

١. مەلا ئیبراهیم جوانەمەرگ بوو، خوێندنی تەواونەکرد.

٢. مەلا سولەیمان: لە پێشدا باسمان کردووە.

## عبداللە محەممەد دینەوەری (٨٠٠)

ناوی عبداللە یە، کوڕی محەممەدی کوڕی وەهەبە، نازناوی (ئەبو محەممەدە)، خەڵکی (دینەوەرە)، زانایەکی گەڕیدەی فەرموودەناس بووە، دەرسی فەرموودەی دایتەوە، دانراوی خۆی هەیە، ساڵی ٣٠٨ك – ٩٢٠ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٦/١٤٤.

٢. إيضاح المكنون ٢/١٤٦.

## عبدالله محەممەد سروجی (٨٠١)

ناوی عبدالله یە، کوڕی محەممەدی کوڕی محەممەدی کوڕی بەهرامە، خەڵکی سروجی نزیك ئورفەیە، ساڵی ٧١٢ك – ١٣١٢ز هاتووتەدنیا، زانایەکی شەرع زان بووە، لە (عەینتاب) کرایتە قازی، خۆشنووس بووە، دانراوی خۆی هەیە، لە ٧٩٣ك – ١٣٩٠ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٦/٣٢٨.

## عبدالله محەممەد سێبەردانی (٨٠٢)

ناوی عبدالله یە، کوڕی محەممەدی کوڕی ڕەسولی کوڕی محەممەدی کوڕی ئەحمەدە، عەشیرەتی (بلّباس)ە، ساڵی ١٩١٣ز لە گوندی (سێبەردان) هاتووتەدنیا.

لە سەرەتاوە لای مەلا ئیسماعیلی سووسەیی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان لە لایەن ئەو مامۆستایانە خوێندنەکەی بردەسەر: مەلا عومەری تەرجانی، مەلا محەممەدئەمینی سوێری، شێخ عومەری بالیسانی، مەلا قادری گۆپتەپەیی، مەلا محەممەدی چل هەویزەیی، مەلا عبداللهی بەحرکەیی (باوکم). پاشان چووە مزگەوتی حاجی قادر دەباغ لە هەولێر لای مەلا عبداللهی بێتواتەیی، ماوە تا ساڵی ١٩٤٥ز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: کۆتایی بە خوێندنەکەی هێنا، ماوەك مەلا بوو لە (سێبەردان) ماوەك لە (مەحەل) ماوەك لە (شاوێس)، دوایی وەزعی دەشت ئاڵۆز بوو، ئاژاوە لە نێو خەڵکەکە پەیدابوو، مامۆستا باری کرد هاتە مزگەوتی (کوێتی) لە گەڕەکی تەیراوە لە (هەولێر)، لەوێ ووتارخوێن و پێش نوێژ بوو، جارجارەش لە مزگەوتی قەلات و ناوبازاڕ دەرسی دەدا.

خووڕەوشتی: زانایەکی زیرەك بوو، هێمن بوو، بە ئارام بوو، چاو بلّند بوو، چاو لە دەست نەبوو، نەفس بەرز بوو، بۆ خەڵکانی دنیا دای نەدەینا، خواناس و خواپەرست بوو، ڕاست و ئەمین بوو، بە ئەمەك و وەفاداربوو.

کۆچی دوایی: لە ٢٠/٢/١٩٩٣ز لە ماڵی مەلا عومەری کوڕی، لە (بەغدا) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (پیرەش) ڕۆژهەڵاتی هەولێر، بە خاك سپێردرا.

کوڕەکانی: محەممەد و ئەبوبەکر و عوسمان و مەلا عومەر: پێش نوێژ و وتارخوێن بوو لە مزگەوتێك لە گەڕەکی (صلیّخ) لە (بەغدا)، دوای تەواوکردنی خوێندنی (باڵا) لە بەغدا، گەڕاوە (هەولێر) بۆ گوندی سێبەردان، لە قوتابخانەی مزگەوتی (خەدیجة الکبری) دەرس دەداتەوە لە هەولێر، خوا تەمەنی ئەو و برایەکانی درێژ بکا بۆ خزمەی ئاین.

سەرچاوە: نامەی مەلا عومەر کوڕی مامۆستا.

## عبداللە محەممەد گۆران (٨٠٣)

ناوی عبداللە یە، کوڕی محەممەدی کوڕی خضری کوڕی ئیبراهیمە، لە دەوری ساڵی ٨١٨ك – ١٤١٥ز هاتووتەدنیا، لە سەرەتاوە لە (جزیرەی بۆتان) لای مەلا ناصیرەدینی مارنوسی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی لەگەڵ مامۆستای چووە (ئەستەمبۆڵ)، پاشان چووە (بروسە) لای مەلا غیاسەدین حەمید، کتێبانی مەطالیع و سەید شەریف و شەرحی میفتاحی تەواوکرد، لەو ماوەیە مامۆستایەکەی زۆر لێی ڕازی بوو، مەتح و سەنای دەکرد، دوایی چووە (قاهیرە) تەفسیری کەششاف و مەواقیف و چەند کتێبی تری خوێند، مامۆستا زانیاری لە تەفسیر و قورئان و بڕوایی بەهێز بوو، لە مانگی شەعبانی ساڵی ٨٩٤ك – ١٤٨٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ٥/٤٤.
٢. مشاهیر الکورد ٢/٥٠.
٣. معجم أعلام الکورد ٣٩١.

## عبداللە محەممەد کوردی (٨٠٤)

ناوی عبداللە یە، کوڕی محەممەدە، ناسراوە بە (مدرس)، لە شاری مەدینەی پیرۆز قازی بووە، ساڵی ١٠٦٤ك – ١٦٥٣ز کۆچی دوایی کردووە.

دانراوی هەنە، لەوانە: حاشیە لەسەر تەفسیری بەیزاوی.

سەرچاوەکان:

١. هدیة العارفین ٥/٤٧٧.

٢. معجم المؤلفین ٦/١٣٨.

٣. معجم أعلام الکورد ٣٩٢.

٤. مشاهیر الکورد ٢٨٩.

## عبدالله محەممەد وانی (٨٠٥)

ناوی عبداللە یە، کوڕی محەممەدی کوڕی ئیبراهیمە، نازناوی (شەرەفوددینە)، خەڵکی (وانە)ی تورکیایە، لە (دیمشق) دانیشتووە، کتێبی (أربعین البلدانیة)ی داناوە لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ)، ساڵی ٧٤٩ك - ١٣٤٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ٦/١٠٧.

٢. کشف الظنون ١/٥٥.

٣. هدیة العارفین ١/٤٦٥.

٤. الدرر الکامنة ٢/١٧٢.

٥. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٣٤٩.

## عبدالله محەممەد هەولێری (٨٠٦)

ناوی عبداللە یە، کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالرحمانی هەولێری یە، نازناوی (ابن السدید)ە، لە دەوری ساڵی ٦٦٨ك - ١٢٦٩ز هاتووتەدنیا، خەریکی خوێندن و گوێ ڕاگرتنی فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) بووە، هەروەها بە قوتابیانی ڕاگەیاندووە و بەلاوی کردۆتەوە، لە ١٦ی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، ساڵی ٧٤١ك - ١٣٤١ز لە (قاهیرە) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. تأريخ أربيل ١/٢٧١.
٢. الدرر الكامنة ٢/١٧٨.
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٣٣.
٤. الإكليل في محاسن أربيل ١٧٧.

**عبدالله مەحمود دشی (٨٠٧)**

ناوی عبدالله یە، کوڕی مەحمودە، خەڵکی گوندی (دشە)یە، لە دەوری ساڵی ١٢٨٠ك – ١٨٦٣ز هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغی سوختەیی تەواوکرد، هاتە (هەولێر) مزگەوتی قەڵات، لای مەلا عومەر ئەفەندی، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، گەڕاوە (ئێران) لە مزگەوتی (دارالإحسان) کرا (مدرس)، هەروەها لە لایەن حکومەت کرا (موفتی)، خەریکی فەتواداان و دەرسدانەوە و ئامۆژگاری خەڵکان بوو، ساڵی ١٣٤١ك – ١٩٢٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٥٦.

**عبدالله مەروان فارقی (٨٠٨)**

ناوی عبدالله یە، نازناوی (زەینەددینە) کوڕی مەروانی کوڕی عبدالله ی کوڕی فەیرۆزی کوڕی حەسەنە، خەڵکی (میافارقین)ە، بۆیە ناوبراوە بە (فارقی)، لە مانگی (محرم)ی ساڵی ٦٣٣ك – ١٢٣٥ز هاتووتەدنیا.

زانایەکی شارەزای مەزهەبی شافیعی بوو، لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) ئاگادار بوو، خەریکی خواپەرستی بوو، ڕوو لە دنیا نەبوو، لە خۆ نەدەخەفتی، بڕوای چاك بوو، لەسەر فەقێیەکانی زاڵ بوو، لە (دیمشق) موفتی و ووتارخوێن بوو، لە (دارالحدیث) مامۆستا بوو، لە قوتابخانەی (شامییە) دەرسی دەدا، پاش ئیمامی ئەوەوی ئەویان کردە مامۆستا، لە ڕۆژی هەینی پاش نوێژی عەسر، ساڵی ٧٠٣ك – ١٣٠٣ز کۆچی دوایی

کرد، جگە لە زانایەکانی شافیعی، قازی حەنەفییەکان و قازی حەنبەلییەکان، تەن بە تەن نوێژیان لەسەر کرد.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٣/١٤.

٢. شذرات الذهب ٦/٩٠٨.

## عبدالله مصطەفا زێیاری (٨٠٩)

ناوی عبدالله یە، کوڕی مصطەفای کوڕی حەسەنە، عەشیرەتی زێیاری یە، زانایەکی زیرەك و ڕۆشنبیر و شاعیر بووە، ساڵی ١١٠٢ك – ١٦٩٠ز هۆنراوەکی لاواندنەوەی بۆ شێخ محەممەد قەیسەری داناوە، هەروەها ئەحمەد ئەفەندی کەواکیبی ساڵی ١١٠٥ك هۆنراوەکی جێژنانەی بۆ مامۆستای زێیاری ناردووە.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٢/٤٠.

٢. معجم أعلام الكورد ٣٩٤.

## عبدالله مصطەفا عەبدالانی (٨١٠)

ناوی عبدالله یە، کوڕی مصطەفایە، خەڵکی گوندی (عەبدالان)ی نزیك (کۆیە)، زانایەکی حەق گۆ بووە، ڕوو لە چاکە بووە، لای خوای بەرنەداوە، گوێی بە خەڵکان نەداوە، لە لای مامۆستایانی بەرزی خوێندووە، چوویتە (دیمشق) لای شێخ حەسەنی کوڕی ئیبراهیمی بەیتاری خوێندووە، هەر لە خزمەت ئەو ئیجازەی زانستەکانی گشتی وەرگرتووە، مامۆستا ناسرابوو بە ڕەوشت چاك و دیمەن پاك، بەردەوام بوو لەسەر خواپەرستی، کاتی خۆی دەبری بۆ سوودی گەل و کۆمەڵ، بۆیە خەڵکان خۆشیان دەویست و ڕێزیان دەگرت، لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆزی، ساڵی ١٢٧٨ك – ١٨٦٢ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (باب الصغیر) نزیك گۆڕی بیلالی کوڕی ڕەباحی حەبەشی (خوا لێی رازی بی) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: علماء ومدارس في أربيل ٨٧.

## عبدالله مصطەفا کاتب (٨١١)

ناوی عبدالله یە، کوڕی مصطەفای کوڕی صالّحی کوڕی فەقێ عەلی یە، لە نەتەوەی عبدالرحمان پاشای بابانە، ساڵی ١٩٣٢ز لە گوندی گەلوانی دەشتی لاجان هاتووتەدنیا، لە خزمەت باپیری قورئانی پیرۆز و گولستانی شێخی سەعدی و چەند کتێبی سەرەتایی خوێند، پاشان چووە (گردەسۆر)ی لاجان لای مەلا حەسەنی کوڕی واژی، پاشان هاتە (زینوە)ی باڵەکایەتی، لای مەلا نەصروالله، ساڵی ١٩٥٤ز چووە (پێنجوین) لای مەلا عارف، (مطول) و (گەلەنبەوی بورهان)ی تەواوکرد، پاشان چووە (بالك) لای مەلا باقر (جمع الجوامع) و (توحفە) و (فەرائیزی) قزلجی تەواوکردن، هەر لەوێ ساڵی ١٩٥٧ز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

ساڵی ١٩٥٦ز تەریقەتی نەقشبەندی لە سیراجەدین شێخ عوسمانی دووەم وەرگرت، لە لایەن شێخەوە کرا بە پێش نوێژ و وتارخوێن و وانەبێژ و سەر خەتمی خانەقای (بیارە)، هەروەها نووسەری تایبەتی جەنابی شێخ بوو بۆیە ناوبراوە بە (کاتب).

سەفەرەکانی: لە ١٩٥٩ز لە خزمەت شێخ چووە (دورود)، ساڵی ١٩٧٩ز گەڕاوە بۆ کوردستانی عێراق، لە ١٩٨١ز کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی باباعەلی لە (سلێمانی)، ساڵی ١٩٩٥ز لە خزمەت شێخ چووە (ئەستەمبوڵ)، بە کورتی: ماوەی چل ساڵان لە شێخ جودانەبۆوە، لە ماڵەوە و لەسەفەر و لە کوردستان و لە هەندەران، ساڵی ٢٠٠٣ز هاتە (هەولێر) لەسەر جۆت جادەی (بەحرکە) مزگەوتێکی دروست کرد، بەناوی (بوخارا)، ساڵی ٢٠٠٤ز چووە (لوبنان) بۆ چارەسەری نەخۆشی، لە بەرواری ١٩/١٠/٢٠٠٤ز کۆچی دوایی کرد.

مامۆستا جگە لە مەلایەتی و سۆفیاتی، شاعیرەکی چاك بوو، نازناوی (فەنائی) بوو، ساڵی ٢٠٠٦ز لە چاپخانەی کشتوکاڵ لە (هەولێر) دیوانەکەی چاپ کرا.

نمونەك لـە شیعرەکانی:

| | |
|---|---|
| هەتا مردن مەگەر قورِکەم بە سەرما | کە تیفلی دڵ بەبێ شیر و شەکەرما |
| لە گوڵزاری بە هەشتی وەصلی جانان | نەما سوودم ئەوەی ما هەر زەرەر ما |
| بەڵی ڕوح بۆ سەبای تۆ بوو بە هود هود | سەرم سورِما کە بێ باس و خەبەر ما |
| بە هۆی خضراوی لێوت وەك سکەندەر | لەنێو زوڵماتی زولفت بێ ئەسەر ما |
| کە دل تۆ تۆی لە مەیلت کەیلە لەیلم | ئەڵێی مەجنونە وێڵی دەشت و دەرما |
| لە مەکتەبخانەکەی ئوستادی عەشقت | هەموو دەرس موتالام بێ سەمەر ما |
| ئەبێ وادەی وەفا کەی بێ ئەگەر بێ | (فەنائی) وادڵی بێ شوێن و سەر ما |

شێخ عابید و شێخ عەزیز دوو کورِی ئەو زاتەن، جێگرینە لە مزگەوتەکە.

سەرچاوەکان:

١. دیوانی فەنائی / پێشەکی، ١٣ ، ٢٠ ، ٤٨.

٢. نامەی د. حەسەن موفتی

## عبدالله مصطەفا هەرشەمی (٨١٢)

ناوی عبدالله یە، کورِی شێخ مصطەفای نەقشبەندی کورِی شێخ ئەبوبەکری هەرشەمییە، ساڵی ١٩٢٥ز لە گوندی (هەرشەم) هاتووتەدنیا، لە خانەقا و مزگەوتی باوکی لە (هەولێر) پەروەدە بووە، هەر لەوێ دەستی بە خوێندن کردووە، ماوەك لە لای مەلا ئیسماعیل سوسەیی دەخوێند، هۆنراوەی تەجویدی قزلجی لە لای مەلا سەید مەردان خوێند، ماوەکیش لەسەر فەرموودەی باوکی چووە مزگەوتی شێخ نورەدین، لە لای مامۆستا صالحی کۆزەپانکەیی (کافییەی نەحوی) خوێند، گەراوە (خانەقا) ماوەکی تر لە خزمەت باوکی ماوە، لەبەر زیرەکی و زەین تیژی، لە دەرسی موستەعیدەکانی بابی ئامادە دەبوو، بە چاکی لە هەموویان دەگەیشت و فێردەبوو، بە ماوەکی کەم، کۆتایی بە خوێندن هینا.

پاشان (عبدالإلە)ی وەصی عێراق، سەردانی هەولێری کرد، لە گەڕانەوەی بۆ (بەغدا)، شێخ عبداللەی لەگەڵ خۆی برد، لەوێ کردییە سەرۆکی مەکتەبی مەلیك، دوایی وازی هینا، بۆ خوێندن چووە (میصر)، زانستی ئیسلامی و یاسای لە (جامع الأزهر) تەواوکرد، چووە (ئاوروپا)، لەوێ یاسا و ئابوری تەواوکرد، لە یاسای مەدەنی بە پلەی یەکەم دەرچوو، لە زانکۆی (لەندەن) دکتۆرای لە یاسا وەرگرت، لەگەڵ دبلۆمی ئابوری.

دانیشتنی لە (بەغدا): گەڕاوە (بەغدا)، لە زانکۆی (بەغدا) و (مستنصریە) دەرسی دەدا، یەکەم کەس بوو دیوانی چاودێری دارایی لە عێراق دانا، خۆشی سەرۆکی ئەنجومەنی دارایی بوو، ماوەك کرا وەزیری ئابوری، یەك بوو لەو لیژنەی کۆڕی زانیاری کوردیان دامەزراند، لەوێش یەك بوو لە ئەندامەکانی کۆڕەکە، دوایی لەسەر داوای خۆی خانەنشین کرا، لە ماڵی خۆی لە گەڕەکی (الجامعة) خەریکی خواپەرستی و نووسین بوو جارجاریش دەچووە مزگەوتی (الجامعة)، شەوان دەرسی تەجویدی قورئانی پیرۆزی بە مامۆستایەکانی زانکۆ دەدا، هەروەها لە چەند ڕۆژان کاتی دیارکراو دەچووە مزگەوتی شێخ مەعروفی کەرخی و مزگەوتی (وەزیر) ئامۆژگاری خەڵکانی دەکرد، جار وابوو لە هەولێرەوە دەچوون بۆ گوێ ڕاگرتن.

دانراوەکانی: (الرقابة المالیة) و (علم أصول القانون) و (الحق والقانون) و (الحریة الجامعیة) و (المقتطف) و (المقتضب) و (نفحات الحیاة) و (وانشق القمر) و (الرفیق الأعلی) و (معالم الطریق) و (البرد النضیر لسمفونیات شکسبیر) و (أمجاد الاکراد) و (دەستەگوڵ) وە هەروەها دانراوی تری باس دەکرێن، بەڵام زانیاریم دەربارەیان نیە.

خووڕەوشتی: زاتەکی نەرم و لەسەرەخۆ بوو، ڕووخۆش و قسەخۆش بوو، دنیاداری مەبەست نەبوو، بۆ خەڵکی دنیا مل کەچ نەبوو، دۆستانی باوکی زۆر خۆش دەویستن، لە زانستەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) شارەزابوو، زمان زان و زمان ڕەوان بوو، چەند جۆرە زمانی (بیانی) دەزانی، شاعیر و نووسەر و بوێژ و

مێژووناس بوو، لە زانستی کۆن و نوێ ئاگادار بوو، لە ئاخافتن بە عەرەبی قورئانی پیرۆزی قسەدەکرد، وتەکانی بە تام و شیرین و پڕ مانا و بەهێز بوون، مەلایان وتارخوێنان، مامۆستایەکانی زانکۆیەکان، ڕۆشنبیرانی کورد زمان و عەرەب زمان، زۆر مەراق بوون گوێ ڕاگرن لە ئامۆژگارییەکانی بە زمانە عەرەبییە خۆشەکەی.

شێخ عبداللە زاتەکی ڕێزدار بوو، ڕێزی خەڵکی دەگرت، قسەی زەرەری کەسی نەدەکرد، باسی کەسی بە خراپە نەدەکرد، وە لە مەجلیسی ئەو هەر باسی زانست و فەرموودە بوو، ڕێی نەدەدا باسی شتی تر بکرێ، یان باسی دونیا و خەڵك بکرێ، وە بە بێ ئەوەی خەڵك بە سەرخۆ دابشکێنەوە، مەجلیسی ئاوەدان بوو، پڕ سوود و پڕ زانیاری بوو، بە ماقوڵی باسی زانایانی پێشووی دەکرد، بە تایبەت ئیمامی شافیعی و ئیبن حەجەری عەسقەلانی.

وتارە بەنرخەکەی: بە بۆنەی کۆتا هاتنی تازییە و سەرەخۆشی شێخ مصطەفای باوکی، لە بەرواری ١٨/٢/١٩٨٦ز دوای نوێژی عەسر، وتارێکی بە نرخی خوێندەوە، بە کوردی و عەرەبی و هۆنراوە و پەخشان، لەو وتارەدا هانی موسوڵمانانی دا، بۆ ئارامی و خۆڕاگرتن، هەروەها باسی زیارەتی گۆڕی پیاوچاکەکانی کرد، لەسەر دەستووری شەریعەتی ئیسلام، بە تایبەت لە هۆنراوەکاندا، زەبوونی و دڵسۆزی خۆی بۆ باوکی نواند، ماڵئاوایی یەکجاری لێ کرد، بە ڕاستی نموونەی هونەرمەندی و ڕەوانبێژی بوون.

لەو ڕۆژەدا، لە شوێنی باوکی دانیشت، خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆز و سەرپەرشتی خانەقا و مزگەوتەکەی دەکرد، تا شەوی ٨/١١/٢٠٠٠ز شادمان بوو، بە بارەگای خوای گەورە، لەسەر وەصیەتی خۆی تازییەی بۆ دانەندرا.

چواری کوڕی هەیە:

١. دکتۆر حەسەن: ئێستا لە دەرەوەی وولاتە.

٢. دکتۆر فائیق: دوای کۆچی دوایی باوکی بووە جێگری، وەلە پێشدا شێخ مصطفەفای بایپری، دەستووری پێدا بوو، بۆ سەرپەرشتی مزگەوت و خانەقایەکە، ئێستا لە ئوردنە.

٣. دکتۆر محەممەد: ئێستا ئەوە سەرپەرشتی خانەقا و مزگەوت دەکات.

٤. عومەر.

سەرچاوەکان:


١. إسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٣١٢.

٢. علماء ومدارس في أربيل ٧٨.

٣. النجم الزاهر ٦٨ – ١٥٨.

٤. دەنگی زانا، ژمارە/ ٥٥ و ٥٦/ ٢٠٠١ز.

٥. چەند زانیاری لە کتێبە چاپکراوەکانی (شێخ عبداللە).


## عبداللە مەعروف مەریوانی (٨١٣)

ناوی عبداللە یە، کوڕی مەعروف کوڕی صۆفی قادرە، دەوری ساڵی ١٨٧١ز لە گوندی (وەلەژیر) ناوچەی مەریوان هاتووتە دونیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (سنە)، پاشان چووە (سلێمانی)، لەوێ هاتە (هەولێر) مزگەوتی قەڵات لای مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی، ماوە تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، هەر لەگەڵ مەلا ئەفەندی سەفەری (تورکیا)ی کرد، ئەمجا کۆتایی بە خوێندن هینا، بووە مەلای مزگەوتی گەورە لە (سلێمانی)، یەك لە فەقێیەکانی ئەو سەردەمی (شێخ مەحمودی حەفید) بوو، پاشان باری کرد بۆ (سنە)ی ئێران، ماوەك لەوێ مەلا بوو، دوایی شێخ حیسامەدینی (تەوێڵە) بە دووی دا نارد، هێنایە لای خۆی، لەوێ شوێنی تایبەتی بۆ دابین کرد، ماوە لەوێ تا ساڵی ١٩٣٠ز چووە (سلێمانی)، لەوێ ساڵی ١٩٤٢ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (گردی سەیوان) بە خاك سپێردرا، (ناری) شاعیر لە مەتحی ئەو دەڵێ:

غەیری (عبداللە عیباد اللە) یـە مـن یـارم نـەبوو

قەلبی کەس لایق بە شێوەی شۆخی ئەشعارم نەبوو

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٧/٢١٧ – ٢١٨.

## عبداللە مەمیخەلی (٨١٤)

مامۆستا عبداللە یەکە لـە مەلایە چـاکەکانی دەشـتی (هـەولێر)، خـەڵکی گونـدی (مەمیخەلانی) سەر بە ناوچەی بالەکاتییە، یەکەم جار بووە مەلا دەرسـی دەدا لـە گونـدی (ماستاوە) لای شێخ صەدیق، دوایی باری کرد بۆ (سـۆربەش)ی خضـرئاغـا، لـەوێ مـەلا محەممەد شێخ شەوارنی یەك بوو لـە فەقێیانی ئەو، پاشان کۆچـی دوایـی کـرد، دوو کـوڕی هەبوون:

١. مەلا عبدالعزیز: لە مزگەوتی حاجی قادر لە (هەولێر) تەواوی کرد، ماوەکی کەم لـە شوێنی باوکی مەلایەتی کرد، ئەویش کۆچی دوایی کرد.
٢. مەلا عبدالرحمان: دوای باوکی و کـاکی لـە جێگایـان بـووە مـەلا، دەسـتی شـیعری هەبوو، ئەویش کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الإکلیل في محاسن أربیل ٣٥٣.

## عبداللە موسا جزیری (٨١٥)

ناوی عبداللە یە، کوڕی موسای کـوڕی ئەحمـەدی (جزیری)یـە، یەکـە لـە زانایـە مەزنەکانی شاری (دیمشق)، لەوێ لە مزگـەوتی گـەورە لەگـەڵ مامۆسـتایەکان بـەردەوام خەریکی کۆکردنەوەی زانیاری بوو، ناسرابوو بە زاتـەکی هـێمن و بـەڕێز و لەسـەرەخۆ، ڕۆژی دووشەمە ١٦ی مانگی صەفەری ساڵی ٧٢٥ك – ١٣٢٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الکامنة ٢/١٨٦ – ١٨٥٧.
٢. البدایة والنهایة ١٤/١٢٦.
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٣٣٣.

## عبداللە مەولود پەرپیتانی (٨١٦)

ناوی عبداللە یە، کوڕی حاجی مەولودی کوڕی مەحمودە، خەڵکی گوندی (پەرپیتانە) لە دەو (بەستۆرە)، عەشیرەتی (گەردی)یە، ساڵی ١٣٦٢ك – ١٩٤٣ز لە گوندی (پەرپیتان) هاتووتەدنیا، ساڵی ١٩٥٠ز دەستی کرد بە خوێندنی قورئانی پیرۆز، لە لای مەلا محەممەدئەمینی صۆفی جەوهەر مەلای گوندەکە.

دوایی خەتمی قورئانی پیرۆز هاتە (بەحرکە)، ماوەك لای موستەعیدەکانی خوێند، دوایی چووە (شاویس)، دووبارە هاتەوە (بەحرکە)، لە لای کاکم مەلا طەیب، تا کۆتایی کتێبی (عبداللە یەزدی) ماوە، پاشان چووە (مۆریلان) لای مەلا ڕەشید، هاتە (هەولێر) مزگەوتی شێخ مەلا ڕەشید لای مەلا خضری شەمامەری، چووە مزگەوتی حاجی محەممەد لە ئیسکان لای مەلا طاهیری سوسەیی، لەوێ کەمالی شەرحی شافییەی خوێند، چووە (کۆڕێ) لای مەلا طەها فەرائیزی خوێند، چووە مزگەوتی حاجی عبداللەی حەمامچی لای مەلا کاك عبدالعزیزی هیرانی، ناوەناوەش دەچووە لای مەلا عبدالکریمی سێبیرانی مەنتیقی دەخوێند، پاشان چووە مزگەوتی شێخ نورەدین لای مامۆستا مەلا صالّحی کۆزەپانکەی، بۆ دەرسی ریازیاتیش دەچووە مزگەوتی عبدالوەهاب ئاغا، لە قەڵات لای مامۆستا طەیب دووشیوانی، ماوە لە خزمەت مامۆستا صالّح، تا ساڵی ١٩٦٧ز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە پێش نوێژ و وتارخوێن لە مزگەوتی (حەمامچی) لە هەولێر، دوایی چووە مزگەوتی (صەدیق) لە کوران، پاشان چووە (ئاکرێ) دەرسی دەدا لە پەیمانگای ئیسلامی، دوایی چووە (گەلالە) ساڵی ١٩٧٥ز کە شۆڕشی کورد تووشی نسکۆ هات، دوورخراوە بۆ (هیت) لە پارێزگای (ئەنبار)، پاشان گەڕاوە (شەقلاوە) دوایی گەڕاوە مزگەوتی حاجی عبدالقادر شنۆیی (مزگەوتی سپی) لە هەولێر، دەرسی فەقێیانی دەدا، ئەندامی ئەنجومەنی زانستی ئەوقاف بوو، بەڕێوەبەری پەیمانگای پێش نوێژ و وتارخوێنانی ئەوقاف بوو، جگە لە ووتار و پێش نوێژی لە مزگەوتەکە.

دانراوەکانی: (تحفه الخطيب): ساڵی ١٩٩١ز لە چاپخانەی (العانی) لە بەغدا چاپ کرا، و (شرح الآجرومية)، (شرح الأنموذج)، (توضيح الفرائض)، (ژیاننامەی پێغەمبەران).

کۆچی دوایی: لە بەرواری ١/٢/٢٠٠٤ز کە رۆژی یەکەمی گێژنەی قوربان بوو بۆ گێژنانە و سەردان چوو بوو بۆ بارەگای لقی دووی پارتی دیموکراتی کوردستان، لە ئەنجامی تەقینەوەیەك گیانی لە دەست دا، لەگەڵ چەند لێپرسراو و کاربەدەستانی هەولێر، مەلا سەعدەدینی کوڕی کرا جێگری، کوڕی تری هەنە خەریکی خوێندنن، خوا تەمەنیان درێژبکات.

سەرچاوەکان:

١. إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الاسلامية ٣٩ — ٤٠.
٢. خۆری ئیسلام، ژمارە ٢٣/٢٠٠٤ز، ٢٧ — ٣٤.

## عبدالله نەجیب عەینتابی (٨١٧)

ناوی عبدالله یە، کوڕی نەجیبە، خەڵکی (عەینتابە)، مەزهەبی حەنەفی بووە، کرایتە قازی، چوویتە مەدینەی پیرۆز، لە گەڕانەوە ساڵی ١٢١٩ك – ١٨٠٤ز کۆچی کرد.

دانراوەکانی: (رسالة الوضع): لەگەڵ شەرحی و (شرح الشمائل) و (شرح الشفا) و (شرح العرائس) و (شرح المجامع).

سەرچاوەکان:

١. هدية العارفين ١/٤٨٨.
٢. معجم المؤلفين ٦/١٥٩.

## عبدالله نەصر حەڕانی (٨١٨)

ناوی عبدالله یە، کوڕی نەصری کوڕی محەممەدی کوڕی ئەبوبەکرە، خەڵکی (حەڕان)ە مەزهەبی حەنەفی بووە، ساڵی ٥٤٩ك – ١١٥٤ز هاتووتەدنیا.

بۆ مەبەستی خوێندن کۆچ و کۆچباری تێکنا بۆ شاری (بەغدا) لەوێ فێری فەرموودە و شەریعەت بوو، زانیارییەکانی قورئانی پیرۆزی لە (واسط) خوێند، پاشان کرا قازی لە (حەڕان) کتێبی (التذكرة في القراءات السبعة) لەگەڵ (مفردات في قراءة الأئمة)ی داناوە، مامۆستا لە بەدینی و زانیاری قورئانی پیرۆز ناوبانگی دەرکردبوو، ساڵی ٦٢٤ك – ١٢٢٧ز لە (حەڕان) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٦/١٥٩.

٢. شذرات الذهب ٥/١١٣.

٣. سير أعلام النبلاء ١٣/٩٦.

٤. إيضاح المكنون ١/١٤٧.

٥. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/١٧١ – ١٧٢.

## عبدالله یوسف ئەسعەردی (٨١٩)

ناوی عبدالله یە، کوڕی یوسفی کوڕی ئەبوبەکرە، خەڵکی شاری (سعێرت)ە، زانایەکی مەزن بووە، لە فەلەکیات و ئەستێرەناسی و ئوسطورلاب شارەزابووە، بەڵام لەبەر توندی و توڕەیی کەم سودی لێ وەردەگیرا، دوا عەمری چاوەکانی تاری بوون شەوی ١٠ی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی ٧٣٤ك – ١٣٣٣ز لە سەربان کەوتە خوارەوە و کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٢/١٨٧.

٢. البداية والنهاية ١٤/١٧٥.

## عبدالله یونس ئورمەوی (٨٢٠)

ناوی عبدالله یە، کوڕی یونسە، خەڵکی شاری (ورمێ)یە، زانایەکی بە دین بووە، لە مەزهەبی حەنەفی شارەزا بووە، کتێبی (قەددوری) لەبەر بووە، ماوەك لە چیای قاسیون

خەریکی خواپەرستی و ئامۆژگاری خەڵکان بوو، زۆرجاران لە چۆڵەوانی دەگەڕا، چەند کەراماتی لێ دەگێڕنەوە، ساڵی ٦٣١ك – ١٢٣٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٥/١٤٥ ١٤٦.

## عبدالأحد سعداللە حەڕانی (٨٢١)

ناوی عبدالأحدە، کوڕی سعداللەی کوڕی عبدالأحدە خەڵکی (حەڕان)ە، مەزهەبی شافیعی بووە، باپیرانی خەریکی بازرگانی بوونە، ساڵی ٦٦٨ك – ١٢٦٩ز هاتووتەدنیا، لە (بەغدا) و (دیمشق) دەرسی لە لای زیاتر لە صەد زانایان خوێندووە، لە شەریعەت شارەزابووە، زانایەکی دیمەن جوان و ڕەوشت چاك بووە، نەخۆش کەوت، چەند ساڵان لەماڵەوە کەت، ساڵی ٧٣٥ك – ١٣٣٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٢/١٩٠ ١٩١.

## عبدالأحد عبداللە حەڕانی (٨٢٢)

ناوی عبدالأحدە، کوڕی عبداللەی، کوڕی عبدالأحدی کوڕی شوقەیرە، خەڵکی شاری (حەڕان)ە، بۆ خوێندن چووە (دیمشق)، هەر لەوێ دەرسی دەدا، دوایی چووە (ئەسکەندەرییە)، لە ٢٠ی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، ساڵی ٧٠٩ك – ١٣١٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٢/٣١٤.

## عبدالأحد محەممەد حەڕانی (٨٢٣)

ناوی عبدالأحدە، کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالأحدی کوڕی عبدالرحمانی کوڕی عبدالخالق، خەڵکی (حەڕان)ە، ساڵی ٧١٠ك – ١٣١٠ز هاتووتەدنیا، لە شاری (حەلەب) کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (كافية القاري في فنون المقاري) داناوە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، دەڵێن: لە خەو بە خزمەت پێغەمبەر (د.خ) گەیشت، پرسی (یارسول اللە) لەسەر کام مەزهەب بڕۆم؟ خۆشەویست (د.خ) وەڵامی داوە، فەرمووی: لەسەر مەزهەبی ئیمامی ئەحمەد.

مامۆستا محەممەدی کوڕی لە هۆنراوەیەکی عەرەبی دەڵێ: {دیارە ئەو مەزهەبە بەرژەوەندی ئێمەی تێدا هەیە، ئەرگەنا مەزهەبەکان هەموویان ڕاستن و ڕێگای پێغەمبەری خودانە}.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ٤/٢١ – ٢٢.
٢. ایضاح المكنون ٢/٢٥٨.
٣. معجم أعلام الكورد ٣٥٢.
٤. معجم المؤلفين ٥/٦٦.
٥. هدية العارفين ٥/٤٩٣.

## عبدالباسط عبدالصمد (قورئان خوێن) (٨٢٤)

مامۆستا عبدالباسط، کوڕی عبدالصمد، یەکە لە کوردەکانی پسپۆڕی قورئان خوێندن و یەکە لە دەنگخۆشەکانی سەردەمی خۆی.

دکتۆر یوسف مەرعەشلی خاوەنی کتێبی (عقد الجوهر) دەڵێ: {خۆم گوێم لە عبدالباسط بوو، گۆتی: من باوکم لە کوردەکانی عێراقە، بەڵام دایکم لە عەرەبەکانی میصرە}، ساڵی ١٣٤٦ك – ١٩٢٧ز لە شاری (ئەرمەنت) سەر بە پارێزگای (قەنا) هاتووتەدنیا، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، هێشتا تەمەنی دە ساڵان تێنەپەڕی بوو، هەر هەمووی لەبەر کرد، هەر حەفت جۆرە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزی ڕەوان کرد، لە بۆنە ئاینیەکانی دەخوێندنەوە بە دەنگە خۆشەکەی هێشتا تەمەنی لە چواردە ساڵان تێنەپەڕی بوو، ساڵی ١٩٤٥ز چووە شاری (صەعید) بۆ قورئان خوێندنی شەوانی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز.

ساڵی ١٩٥٠ز چووە (قاهیرە)، ساڵی ١٩٥١ز قورئانی پیرۆزی لە (ڕادیۆ) خوێند، دەنگوباسی دەنگ خۆشی بەلاوبۆوە، بە تایبەت کاتی کردنەوەی مزگەوتی (پۆرسەعید)، ساڵی ١٩٥٢ز کرا قورئان خوێنی مزگەوتی ئیمامی شافیعی، پاشان ناردرا

مزگەوتی ئیمامی حوسێن، ساڵی ١٩٨١ز کرا جێگری سەرۆکی گشتی قورئـان خوێنـان، ساڵی ١٩٨٤ز کرا سەرۆکی قورئان خوێنان و قورئان لەبەران.

(شێخ عبدالباسط) دە جار قورئانی پیرۆزی، بە هەر حەفت جۆرە خوێندنـەوەکان، تۆمارکردووە و بۆ جیهانی ئیسلامی بەلاوکردوتەوە، بۆ ئەو مەبەستە پتر لـە صـەد جـار سەفەری وڵاتانی ئیسلامی کردووە، لە ڕۆژی چوار شەمەی ٢١ی مانگی ڕەبیعـی دووەم، ساڵی ١٤٠٩ك، ٣٠/١٢/١٩٨٨ز لە (میصر) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: عقد الجوهر ١٩٠٥ – ١٩٠٦.

## عبدالجبار حەسەن گلەزەردەیی (٨٢٥)

ناوی عبدالجبارە، کوڕی شێخ حەسەنی گلەزەردەیە، ساڵی ١١٣١ك – ١٧١٨ز لە گوندی (ولیان) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، بۆ زێدە شارەزایی ماوەك چـووە خزمەت مامۆستا محەممەد حەسەن (ابن الحاج)، پاشان تەریقەتی لە شێخ حەسـەنی (بـاوکی) وەرگرت، باوکی نازناوی (مصلح الدین)ی بۆ دانا، دەستی کرد بە خزمەتی ئاینی پـیرۆز، تا ساڵی ١١٨٦ك – ١٧٧٢ز لە گوندی (گلەزەردە) کۆچی دوایی کرد، سێ کوڕی لە دوا بەجێما: شێخ ئەحمەد و سەید محەممەد و سەید مصطەفا.

سەرچاوە: بنەماڵەی زانیاران ٣٣٣ – ٣٣٤.

## عبدالحفیظ عبدالمحسن گۆرانی (٨٢٦)

ناوی عبدالحفیظـە، کـوڕی عبدالمحسـینی گـۆرانی کوردیـە، سـاڵی ١٣١١ك – ١٨٩٣ز لە شاری مەدینەی پیرۆز هاتووتەدنیا، دەرسی لە لای شێخ ئەحمـەدی بـەرزنجی و چەندان زانایان خوێندووە، کرا (قازی) داد لە مەدینەی پـیرۆز، پاشـان کـرا یاریـدەدەری سەرۆکی داد، لە بەرواری ٣/٣/١٣٤٧ك کرا قازی داد، لە شاری (جەددە)، سێ ساڵان لەوێ ماوە، گەڕاوە (مەدینە)ی پـیرۆز، سـاڵی ١٣٥٥ك کـرا یاریـدەدەری شـێخ زەکـی کوردی بەرزنجی سەرۆکی دادی (مەدینە)، دوایی کـرا یاریـدەدەری شێخ محەمـەد نـوری

(کتێبی)، بەردوام بوو لەسەر قازیاتی، تا ساڵی ١٣٧٠ك – ١٩٥٠ز کۆچی دوایی کرد. تەنیا کوڕێکی هەبوو، ناسرابوو، بە (عبدالمحسن کوردی)، دوای ئەو کرا سکرتێری داد.

سەرچاوە: قضاة المدينة المنوره ١/٧٩.

## عبدالحکیم محەممەد ڕایەتی (٨٢٧)

ناوی عبدالحکیمە، کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی مەلا عبدالقادرە، ساڵی ١٩٠٥ز لە گوندی (ڕایەت) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە لای باوك و باپیری کۆتایی پێ هێنا، ئیجازەی مەلایەتی لە مەلا عبدالقادری باپیری وەرگرت.

مەلایەتی لەو گوندانە کرد: (قەرەداغ)، (ئەڵلایی)، (بابلاغ)، (پارەزان)، (خوامراد)، (خالدان)، (کانی کەوە)، (ئەحمەدلەوەن)، (قەرەتامور)، (قولە).

مامۆستا هەروەکو زمانە شیرینەکەی لە کاربوو، بۆ دەرسدانەوە، قەڵەمەکەشی دریغی نەکرد بۆ نووسین و فەتوا و کتێب دانان، لەوانە: (الطب في الاسلام) و (جمع المسائل على المذاهب الأربعة) و (رسالة الجمعة): باسی قەدەغەی کردنەوەی نوێژی نیوەڕۆ دەکا دوای نوێژی جومعە، ساڵی ١٩٥٦ز تەواوی کردووە، لە پەیامی زانایان ژمارە ٨ / ٢٠٠٥ز بەلاوکرایەتەوە.

مامۆستا دۆستایەتی بتوونی لەگەڵ شێخ مەحمودی حەفید و مامۆستا عبدالمجیدی قوطب باش مەلای کەرکوك هەبووە، مامۆستا جگە لە مەلایەتی شاعیریش بووە، شیعری کوردی و عەرەبی هەیە، نمونەی عەرەبی:

أنا العبد المسمى باسمه الحكيم — غداً به أعوذ من نيران الجحيم

أنا العاصي الغريق في بحار العيوب — أستغفر غفرانا من غافر الذنوب

الى قابل التوب إني تبت متابا — بالأبد أتوب، لكونه توابا

وأبداً أصلي على البدر المنير — محمد المصطفى البشير النذير

وآله الأبرار وصحبه الأخيار — مادامت الصلاة كأمواج البحار

بفضلهم علينا كذا، والمسلمين — أي مكان كانوا، أمين أجمعين

نمونەی شیعری کوردی:

مەلا ئەقسامی زۆرە موختەصەری سێ قیسمە

ئەووەڵ: ئەهلی بەهەشتە، ئەوەی عامیل بە عیلمە

دووەم: ئەهلی جەهەننەم عالیمی بیلا عەمەل

گەر بێتو تەوبەی نەکا، بۆ بەهەشت نەبیی ئەمەل

عامیلی غەیرە عالم: لە قیسمی سێهەمینە

عیلاجی خۆی گەر نەکا، لەگەڵ شەیتان قەرینە

ئەم قیسمی سێهەمینیان (واللە ) عەجەب بەلایە

عەوام پێی ئەڵێن مەلا، ئەمما بەناو مەلایە

بەڵی بە دەم زۆر مەلا، عەجەب چوست و چالاکە

بەڵام کتێب بێتە پێش، بیکوژی ڕووی تێناکا

چونکە ئەو چاوی عیلمی نابینایە حەقیقەت

لە ناو صەدەف نابینی، نەظمی دوری شەریعەت

دەلیلی بە قووەتی: نەبی، بەڵێ، لام وایە

ئەو سێ لەفزە لە لای ئەو، حوججەتی مونتەهایە

عەوام و جاهیل فەورەن، تەصدیق دەکەن کەوایە

ئەڵێن ئەگەر واش نەبیت، ئۆباڵ بە ملی مەلایە

نازانن ماڵ وێرانن، هەردوولا موقەصصیرن

ضالل و موضیل هەردوولا، بۆچی عیبرت ناگرن

پرسی مەلای چاك بکەن، عالم بێ بە حەقیقەت

بکا حەللی موشکیلە، مووافیق بە شەریعەت

مەربوط بە ئەمری شەرعی، یەعنی عەینی مەسئەلە

راجیح بێ، مەرجوح نەبێ، مەقولی ئەوقائیلە

ئەوەی کەوا مەلایە، با ئەوە هەر مەلا بێ

ئەوەی بەناو مەلایە، با (معزول الفتوی) بێ

سەرچاوە: پەیامی زانایان، ژمارە ٨/٢٠٠٥ز.

## عبدالحکیم محەممەد هۆبەیی (٨٢٨)

ناوی عبدالحکیمە، کوڕی سەید محەممەدە، ساڵی ١٨٩٢ز لە گوندی (هۆبە)ی هەورامان هاتووتەدنیا، لە سەیدەکانی (هۆبە)یە، دەچێتەوە سەر سەید شەریفی عەللامە (خوا لێی خۆش بێ)، دەستی کرد بە خوێندن، لە چەند شوێنان گەڕا، دوا هەواری خانەقای مەلاونا خالید بوو لە (سلێمانی)، لە خزمەت شێخ عومەری قەرەداغی ماوە تا ئیجازەی وەرگرت.

لە مزگەوتی مەلا عبدالرحمان بووە مەلا، پاشان چووە گوندی (خاوی) لە قەرەداغ، دوایی چووە گوندی (فورقان)، دوایی باری کرد بۆ گوندی (قەبلاغ) لەوێ لە لایەن شێخ نەجیبی طالەبانی کرا (مدرس) پاشان کرا مەلای مزگەوتی مەحمود پاشا لە (قزلبات)، دوایی باری کرد بۆ (خانەقین) لە مزگەوتی شێخ فەتتاح کرا پێش نوێژ و (مدرس)، مامۆستا زاتەکی قسەخۆش و سەخی و بە ئارام و خۆڕاگربوو، ساڵی ١٣٧٩ك – ١٩٥٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:


١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٦٣ – ٢٦٤.

٢. أعلام کورد العراق ٤٥٧ – ٤٥٨.


## عبدالحلیم عبدالسلام بن تەیمییە (٨٢٩)

ناوی عبدالحلیمە، کوڕی عبدالسلامی کوڕی عبداللّٰهی کوڕی خضری کوڕی محەممەدی کوڕی خضرە، باوکی تەقیەدین بن تەیمییە، ساڵی ٦٢٧ك – ١٢٢٩ز لە (حەڕان) هاتووتەدنیا، لە منداڵییەوە چووە (حەلەب)، دەرسی لە لای باوکی خوێند، مەزهەبی حەنبەلی بوو، ساڵی ٦٦٧ك لە مزگەوتی گەورەی (دیمشق) لەسەر کورسی

دەرس و وەعزی دەدا، لە فەرائیز و حیساب و فەلەك شارەزا بوو، ماوەك كرا مامۆستای تایبەت بە فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ)، لە مانگی ذی الحجەی ساڵی ٦٨٢ ك – ١٢٨٤ز كۆچی دوایی كرد، تەقیەدینی كوڕی جێگری بوو.

سەرچاوەكان:

١. شذرات الذهب ٥/٣٧٦.

٢. معجم المؤلفین ٥/٩٦ – ٩٧.

٣. معجم أعلام الكورد ٤٠٣.

٤. البدایة والنهایة ١٣/٣٠٧.

٥. الذیل علی طبقات الحنابلة ٤/٣١٠ – ٣١١.

## عبدالحلیم محەممەد بن تەیمییە (٨٣٠)

ناوی عبدالحلیمە، كوڕی محەممەدی كوڕی خضری كوڕی محەممەد بن تەیمییەیە، ساڵی ٥٧٣ك – ١١٧٧ز هاتووتەدنیا، لە (بەغدا) دەرسی فەرموودەی لە لای كوڕی جەوزی و چەندانی تر خوێند، شەریعەتی مەزهەبی ئیمامی ئەحمەدی خوێند تا شارەزابوو، ئوصول و فەلسەفە و ئەندازە و ژمێریاری تەواوكردن، دەرسی بە چەند زانایان داوە، لە ٦ی مانگی شەووالی ساڵی ٦٠٣ك – ١٢٠٧ز لە شاری (حەڕان) كۆچی دوایی كرد.

سەرچاوەكان:

١. شذرات الذهب ٥/١٠.

٢. الذیل علی طبقات الحنابلة ٤/٣٩.

٣. معجم أعلام الكورد ٤٠٣.

## عبدالحمید ڕەسول عەبقەری (٨٣١)

ناوی عبدالحمیدە، كوڕی مەلا ڕەسولی كوڕی مەلا ئیلیاسە، نازناوی (عەبقەری)یە، ساڵی ١٩١٠ز لە گوندی (میك) سەر بە (سەقز) هاتووتەدنیا.

سەرەتای خوێندنی لای باوکی بووە، دوایی چووە لای مەلا سەید عبداللّٰەی خوردەلووك، دوایی چووە (حەمامیان) لای مەلا صەدیقی سەلامی، دوایی چووە (باغلوجە) لای مەلا سەید حوسێن، دوایی چووە (بانە) لای شێخ مەلا عەلی، پاشان هاتە خزمەت شێخ عومەری قەرەداغی، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، بووە مەلا لە گوندی (بوین) سەر بە (بانە)ە، پێنج ساڵان لەوێ دەرسی داوە، پاشان ساڵی ١٩٤٠ز لە سەر داوای شێخ مالیك چووە (تورجان).

مامۆستا شیعری کوردی و عەرەبی و فارسی هەیە، نامیلکەی (فەلەکیات) و (هەندەسە) و (حیساب) و (باغچەی گوڵ) و (مەولودنامە)ی، داناون، ساڵی ١٩٤٣ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (تورجان) لە تەك جەنابی مامۆستا مەلا عەلی قزلجی بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: تأریخ فرهنگ وأدب مکریان ٣١١ – ٣٢٠.

## عبدالحمید سارتەکەیی ترێخۆر (٨٣٢)

مامۆستا عبدالحمید، خەڵکی گوندی (سارتکە)ی دەوزێی پردێیە، لە بەرەبابی (ترێخۆر)ە، منیش چەند حاشیەی ترێخۆرزادەم دیتووە لەسەر فیعلی سعدالله ی گەورە، لەوانەیە ئەو زانایە بێ، یان یەکێ تر بێ لەو بنەماڵە، مامۆستا مەلا و (مدرس) بوو لە گوندی (مێرغوزار) لە فەقێیەکانی: مەلا صەدیقی گرمکی و مەلا ئەحمەد بوون، دوایی چووە (باشتەپە)، پاشان کرا پێش نوێژ و وتارخوێن لە (پردێ).

مامۆستا شیعری کوردی و عەرەبی و فارسی هەیە، لە دیوانی حافزی شیرازی شارەزابوو، زۆرجاران لەگەڵ مامۆستا صالحی کۆزەپانکەیی پرسیاریان لێکدی دەکرد، کۆچی دوایی کرد، سێ کوڕی زیرەکی هەبوون:

أ- دکتۆر نیظامەدین عبد الحمید: ساڵی ١٩٢٣ز لە کەرکوك لە دایك بووە، ساڵی ١٩٩٣ز لە زانکۆی (بەغدا) ماستەری لە شەریعەت وەرگرت، پاشان چووە (سۆران)، لە زانکۆی قورئانی پیرۆز دەرسی دەدا، دوایی خەریکی نووسین بوو.

چەند کتێبــی داناون، لەوانە:

١. قل هذه سبيلي لە ١٩٥٥ز چاپ کرا.

٢. جناية قتل العمد: لە ١٩٧٥ز چاپ کرا.

٣. مفهوم فقه الإسلامي: لە ١٩٨٣ز چاپ کرا.

٤. العبادات وآثارها: لە ١٩٨٥ز چاپ کرا.

٥. أحكام النكاح: لە ١٩٩٦ز چاپ کرا.

٦. فقه المواريث: لە ١٩٨٦ز چاپ کرا.

٧. أحكام انحلال عقد الزواج: لە ١٩٨٩ز چاپ کرا.

٨. تەفسیری قورئانی پیرۆز بە کوردی.

ب- دکتۆر محسن عبد الحميد.

ج- ناصح.

سەرچاوەکان:

١. الإكليل في محاسن أربيل ٣٨٢ – ٣٨٣.

٢. أعلام كورد العراق ٨٥٠ – ٨٥١.

## عبدالحمید صاڵح عەسکەری (٨٣٣)

ناوی عبدالحمیدە، کوڕی صاڵحی کوڕی مەعروف کوڕی عوسمانی بالول ئاغایــە، خەڵکی گوندی (عەسکەر)ی سەر بە (ئاغجەلەر)ە، ســاڵی ١٣١٨ك لــە مزگــەوتی مــەلا جامی، لە (کۆیە) لای مەلا صادیقی خوێندووە، لەو کاتە کتێبــی (تەصریفی مەلا عەلی) و چەند قەسیدەی نووسینەوە، ساڵی ١٣١٩ك چوویتە (سلێمانی) بەشێکی تری نووســیتەوە، ساڵی ١٣٢٦ك – ١٩٠٨ز تاکە حاشیەیەکی مەلا ئەبوبەکری میرڕۆســتەمەی لــە باســی (اسم الجنس) نووسیەوە.

ساڵی ١٣٢٩ك گەڕاوە (کۆیە) لای جەنابی مەلا محەممەدی جەلی زادە، لەو کاتــە دیوانی (نالی) نووسییەوە، هەروەها (فتح الرحمن) شەرحی (لقطــة العجــلان)ی زەرکەشــی

نووسیەوە، وە نامەی خۆی ناسراوە بە: نامەی بەفری گەورەی نووسی، ماوەکیش چووە مزگەوتی (پەلك) لای مەلا تەوفیق، ئەمجا ڕووی کردە شاری (بەغدا) لەوێ لە (جامع الفضل) چەند پەراوێزی لەسەر (شەمسیە)ی مەنتیق نووسیەوە، پاشان چووە مزگەوتی ئیمامی ئەعزەم، (علاقە المجاز)ی ئەنطاکی نووسیەوە ساڵی ١٣٣٠ك لەژێر سێبەری منارەکەی مزگەوت تەواوی کرد، ساڵی ١٣٣٨ك – ١٩١٩ز ئەم کۆمەڵە کتێبەی نووسیەوە:

أ. دیوانی مەولانا خالیدی شارەزوری.

ب. پینج خشتەکی (شەهید) لەسەر شیعری مەولانا خالید.

ج. شەرحی (المصطلحات الصوفیة).

کوڕەکانی و ساڵی لە دایکبوونیان: محەممەد فاتح: ١٣٤٢ك – ١٩٢٣ز و محەممەد فائق: ١٣٤٩ك – ١٩٣٠ز و فاروق: ٢٨/٢/١٩٤٩ز و محەممەد فاضل ٢٨/١/١٩٥١ز.

مامۆستا عەسکەری جگە لە مەلایەتی شاعیریش بووە، نازناوی (حامید)ی بۆ خۆی داناوە، لە ناو کۆمەڵە دەستنووسەکەی لای ئێمە چەند پارچە شیعرم دۆزیەوە، دوانیان لێرە دەنووسم، یەکەم دڵداریە بە یاری خۆی هەردەرێ:

| | |
|---|---|
| هەتا کەی پێکەنین و ناز و لابە | بە دەرخە صادیقی و کازیب وەلابە |
| وەها مەستم بە دائیم خوێن دەنووشم | لە لای من وایە هەر بادەی شەڕابە |
| بە گێسووی چۆن کەمەندت واکراوم | دەترسێم بمکوژی ئەم ئیضطیرابە |
| لە کن توو باوجود من بەندەی تووم | دەسا ڕەحمت هەبێ بەس ئەم عەزابە |
| لە وەصلی توو بەسە مەئیوسی تاکەی | بکێشم جەور و ئازاری و عیتابە |
| لە بۆ لەعلی لەبت دڵ ئینتیظارە | بە قوربان بێ توو دڵ خانەی خەرابە |
| گەلێ ئینسان لە بۆ ناهوو صەیادن | کەچی (حامید) صەیادی چاو عوقابە |

پارچە شیعری دووەم پێنج خشتەکییە لە مەتحی (چایە):

یاخوا لال بی هەر کەسێ بێ دەم لە زمی (چا) بدا

ڕشتەیی بەدبەختی خۆی دائیم لە دنیا با بدا

بەس نیە مەدحی ئەوەندە گەر عەدو خۆی لانەدا

(چا) کە ڕووی سرورە لە دیوانی شەهەنشاە و گەدا

طەبعی شیرینە لەتیفە باعیسی زەوق و صەفا

بۆ سروری کول عەجائیب دەست گاهێکی هەیە

دەرحەقی ئەربابی خۆی ئەو حوکمی شاهێکی هەیە

نیسبەتی لێو و ڕوخ و عیشوو نیگاهێکی هەیە

بێنە سەر بەحسی لەطافەت ڕۆژ و ماهێکی هەیە

کافیە بۆ فەضلی (چا)، بۆ چاکە بویتە موبتەدا

واتە: ڕەنگی چایە وێنەی مانگە، شەکرەکەی وێنەی ڕۆژە، (چا) لە پیتی یەکەمی چاکە دەرهاتووە، کەوابێ سەرەتای چاکەیە، چاکە لەوێوە دەست پێدەکا، هەروەها بۆ مێوانداریش سەرەتایە.

لەوانە بەهێزتر نامەی (بەفری گەورە)یە، بە عەرەبی نووسیوە، هەرچەند هۆنراوە نیە، بەڵام پەخشانێکی پڕ لە ڕەوانبێژی و جوانکارییە، لە هۆنراوە بە نرخترە، چالاکی نووسەرەکەی بە زەقی لێ دیارە، ئەوە دەقەکەیتی: {ومن عجیب مارأت العینان في الآن، ولم یر في سالف من الزمان، في تسعة عشر من محرم الحرام، سنة ١٣٢٩هـ في قصبة (کویسنجق)، نزل برد جسیم، وثلج عظیم، حتی سدت السکك وأبواب الدور، وارتفع إلی سقف العوالي والقصور، وعطلت الجماعات والدروس، في ذلك الأیام[1] العبوس، وعطلت الأسواق وغلقت الدکاکن، ووقع الضجیج في العالم والحزون، وانجمت الذآب

---

[1] راست وایە: الیوم ، بی.

على الانسان، والوحوش على البلدان، وليس لأحد طاقة العبور، وحضّروا انفسهم للقبـور، واستولى جنوده على بغداد والحرباء، مـابقي الغـبراء علـى الغـبراء وغلـب علـى الاكنـاف والحواشي، وماتت الأنعام والمواشي، وسقط الجنين، واختلف الأصوات بالحنين، وقتل بعـض الأنام وحرق الأجسام، ووقع الغلاء في الحطـب حتـى بيـع بـالميزان، وصـار الحمـل عشـرة قرانات ولم يعطه صديق للصديق، وانفر الرفيق من الرفيق، وهو المحبوب بين الانام، ومذكور بالألسن و الكلام، وقُطع اشجار القبـور، والمسـاجد ومحـل المـرور، وشـق السـلم والمرقـي بالحنين، والوتد في الجدران بالأنين، وازدحموا على النار والـدخان، ويقولـون لكثـرة الـبرد: الأمان، الأمان.

وحقيق ان يلغز فيه: أى شيء هـو جـراد في الهـواء وفي الارض حديـد، وهبـاء في السماء وفي الارض سديد، رأسه في الثريا ورجله في الجحيم، ووسطه في العلا و في الأسـفل مقـيم، خماسـي المئـات وثلاثـي العشـرات وثلاثـي الوحـدات، واحـد المئـات والعشـرات والوحدات، وهو ثلاثي، إذا أسقط منه الخماسي بقي اثنان، وإذا أسقط منه الثلاثـي كـذلك بلا مين، وأوله أول العشرات، خمس من المأت، وثانيه واحد وسبعون، وثالثه ثلاثة وخمسون، ومجموعه خمسمائة وثلاثة وثلاثون، لـه کۆتاییدا نووسیێق:

هذا ما خطر ببال الحقير عبدالحميد العسكري في كويسنجق في الجامع الكبير، لدى الفاضل النحرير: الملا محمد بالجليزاده الشهير في سنة ١٩/محرم/١٣٢٩هـ.}

منیش تەرجومەی ئەو نامەیەم کردووە بە کـوردی، دەقەکـەی ئەوەیـە: {شـتێکی سەرسوڕمێنەر، لە پێشدا نەمان دیبوو، هاتە پێش چاوانمان، ڕۆژی ١٩ی مـانگی (محـرم)ی ساڵی ١٣٢٩ك، لە شارۆچکەی (کۆیە)، بەفرێکی سـەخت کـەوت، کۆڵانـە و دەرگـای ماڵانی گرت، بەرزبۆوە، تا خانووە بلندەکان، کەس نەیتوانی بخوێنیـت لـە مزگەوتـەکان، نوێژی بە کۆمەڵ ئەنجام نەدەدرا، بازاڕ و دووکانەکان داخران، هـاوار هـاوار کەوتـە نێـو خـەڵکان، گـورگ هێرشـیان دەهینـا سـەر ئـادەمیزاد لـە برسـان، گیانـدارە دڕنـدەکان نەحەوانەوە لە چیایەکان، دابەزینە ناو گوند و شارەکان، کەس نەیـدەتوانی خـۆی دەربـاز

بکا، خۆیان ئامادەکرد بۆ گۆڕستان، ئەو بەفرە باکور و باشووری داگرت تا شاری (بەغدا)، لە ئەنجامدا چەندان ئاژەڵ ومارات مردن، وەك ڕۆژی قیامەت ژنان منداڵیان لەبەرچوو، چەند کەس کوژران، چەند شوێن سووتاندران، (دار) زۆر گران بوو، دەفرۆشرا بە تەرازو و کێشان، بارەك هاتە دە (قران) هەر دەنگووباسی دار دەهاتە سەر زار، بۆ بڕینی داروبار ڕوویان کردە گۆڕستان و مزگەوتەکان، قادرمەی خانووانیان هەردەوەشاندەوە، سنگی ناو دیواریان هەردەقەراند، لەسەرمان دەیان سووتاند، کۆمەڵ کۆمەڵ کۆدەبوونەوە لە دەورەی ئاگردان، لێوە لەرزیان لێ بوو، هاواریان دەکرد لەسەرمان: (ئەلئەمان، ئەلئەمان)!

حەقە بکرێتە مەتەڵ : ئەو شتە چییە؟ لە ئاسمانەوە (کلێ)یە لەسەر زەوی (ئاسنە)، لەسەرەوە (تۆزە) لە خوارەوە (ڕێگرە)، سەری لە لای (پێلو)وە پێی لە (دۆزەخە)، ناوەڕاستی بەرزە، دابەزیوە لە ئەرز ؟ وەڵام: بێ گومان ئەوە (بەفرە): وەك (کلێ) دێتە خوارەوە کە کەتە سەر زەوی توند دەبی وەکو(ئاسن) ناتاوێتەوە، -بەفری گەورەش وابوو-،لە سەرەوە بارستایەکی وای نیە، کاتێك کەوت ڕێی لە خەڵکان دەگری لە ئاسمانەوە دەست بە هاتنەخوارەوە دەکا، سەرەوەکەی لەوێیە، لە ئەرز دادەبەزی، پێیەکەی لەوێ گیر دەبی، نیشتەجێ دەبی.

لە خانەی صەدان پێنجە، لە دەیان سێیە، لە یەکان سێیە، لە صەدان و دەیان و یەکان تاکە، خۆی سێیە، پێنجەکەی بڕوات دوو دەمێنێ، سێیەکەشی بڕوات هەردوو دەمێنێ، یەکەمی سەرەتای دەیان و پێنج صەدە، دووەمی حەفتاو یەکە، سێیەمی پەنجاو سێیە، کۆی هەمووی پێنج صەد و سی و سێیە ؟

وەڵامی ئەم پرسیارەش: (بەفرە)، بەڵام لێکدانەوەی بە زمانی عەرەبی واتە: (ثلج) دەردەچێت، بەم شێوەیە: (ث) لە ژمارە ئەبجەدی دەکاتە: (٥٠٠)، (ل) =٣٠، (ج) =٣ ، کەوابی لە خانەی صەدان پێنجە، ئەوە پیتی یەکەمیتی، لە خانەی دەیان سێیە ئەوە پیتی دووەمیتی، لە یەکان سێیە ئەوە پیتی سێیەمیەتی، صەدەکە پێنج جاران صەدە، دەیەکە سێ

جاران دەیە، سێیەکە سێ جار یەکە، هەر هەموویان تـاکن، ٥٠٠ پێنج جـارە و ٣٠ سـێ جارە و ٣ سێش سێ جارە پێنجەکەی کە پیتی یەکەمیەتی (ث) بڕوات، دوو دەمیـنی (ڂ)۔ سێیەکەی بڕوات کە پیتی کۆتاییەتی (ج) هـەردوو دەمـینی (ثـل). یەکـەمی واتـە: (ثێ). ث=٥٠٠، ي =١٠، کۆی ٥١٠، دووەمـی (لام): ل=٣٠، ا=١، م=٤٠، کـۆی ٧١. سـێیەمی (جـیم): ج=٣، ی=١٠، م=٤٠، کـۆی ٥٣، کـۆی گشـتی: ث، ل، ج: ٥٠٠=ث، ٣٠=ل، ٣=ج = ٥٣٣.

لە کۆتایی دەڵێ: هاتە بیری مەلا عبدالحمید عەسـکەری لـە مزگـەوتی گـەورەی (کۆیە) لای زانای بەرز مەلا محەممەد جەلیزادە، ئەو لێکدانەوەش هاتە بـیری طـاهـیر مـەلا عبدالله لە حوجرەی فەقێیانی مزگەوتی گەورەی بەحرکە، لای زانای بـەرز مـەلا طـەیـب بەحرکەیی برا گەورەم ٥/٦/٢٠٠٥ز .

سەرچاوەکان:

١. کۆمەڵە دەستنووسەکانی مامۆستا عبدالحمید عەسکەری.
٢. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٣/١٥٦.

## عبدالحمید عبدالرحمان ئەتروشی (٨٢٤)

ناوی عبدالحمیدە، کوڕی عبـدالرحمانی کـوڕی محەمـەدی کـوڕی عـەلی کـوڕی عبدالحمیدە، ساڵی ١٩٠٤ز لە (ئەتروش)ی سەر بە (دهۆك) هاتووتەدنیا.

یەکە لە شێخەکانی تەریقەتی (قادری)، دەستی کـرد بـە خوێنـدن، دوای خـەتمی قورئانی پیرۆز و تەواوکردنی کتێبە سەرەتاییەکان چووە (ئاکرێ) لای مەلا ئەحمەد مـەنتیقی خوێند، دوایی چووە (موصل) لای مـەلا عوسمـانی دیـوەجی بەلاغـەی خوێنـد، مـاوەکیش چووە لای شێخ نیعمەتوالله، پاشان چووە لای مەلا ئەحمەدی نـەوەی مـەلا یـەحیای مـزری (أصول الفقه) و (کەلام) و زانستەکانی تری تەواوکرد ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، ساڵی ١٩٢٧ز چووە زانکۆی (آل البیت) لـە بەغـدا، سـاڵی ١٩٣٠ز تـەواوی کـرد، چـووە کۆلێژی مافپەروەری، لە ١٩٣٣ز تەواوی کرد، کرا بەڕێوەبەری ناحیەی (ڕێکان)، جل و

بەرگی مەلایەتی دانەنا، لە ١٩٣٦ز چووە (بەرواری بالا)، لە ١٩٤٠ز کرا زابت سوپا لە (ڕواندز)، دوایی کرا بەڕێوەبەری ناحیەی (هەریر) دوایی چووە (کەندیناوە)، لە ١٩٤٣ز کرا قائیمقامی (ڕواندز)، دوایی چووە سنجار، لە ١٩٤٤ز کرا حاکمی (ڕواندز) لە ١٩٤٥ز چووە (هەڵەبجە)، لە ١٩٤٨ز چووە (سلێمانی)، لە ١٩٥٠ز کرا قازی (موصل)، لە ١٩٥١ز کرا قازی یەکەم لە (بەغدا)، لە ١٩٦٣ز خانەنشین کرا، دەستی کرد بە پارێزەری.

دانراوەکانی: (رسالة في الحروب الصليبية) و (رسالة في حروب السلاجقة ودورهم في خدمة الإسلام) و (الفتوحات الإسلامية) و (نصوص فقهية في اختلاف الفقهاء: ملخص من تفسير القرطبي).

سەرچاوە: إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢٠٨.

## عبدالحميد عبدالكريم عيرفان (٨٣٥)

ناوی عبدالحمیدە، کوڕی عبدالکریمی کوڕی ئەحمەدە، خەڵکی گوندی (کانی مشکان)ە، ساڵی ١٢٧٣ک – ١٨٥٦ز لە شاری (سنە) هاتووتەدنیا.

لە لای باوکی قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، دوایی چووە لای مەلا عبدالرحمانی پێنجونی، پاشان چووە (بەغدا) قوتابخانەی ئیمامی ئەعزەم، لای مەلا حوسێنی پشدەری ماوە تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، گەڕاوە (سنە) لە مزگەوتی ڕەشید قەلعەبێکی بووە مەلا و (مدرس)، پاشان لە جەنگی جیهانی یەکەم، لەبەر هێرشە دڕندانەکەی ڕوسەکان، سنەی بەجێ هێشت، چووە گوندی (ڕەزاو) لە ناحیەی (هەورامان)، هەر لەوێ ساڵی ١٣٣٤ک – ١٩١٥ز کۆچی دوایی کرد.

مامۆستا مریدی شێخ حیسامەدینی بیارە بوو، چەند شیعری پڕ مانای کوردی و عەرەبی و فارسی پێداهەڵگوتووە، نازناوی شیعری (عیرفان)ە.

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/١٤٠ – ١٤٦ – ١٩٤.

## عبدالحمید قەرەمەلا عەینتابی ( ٨٣٦ )

ناوی عبدالحمیدە، کوڕی قەرەمەلایە –واتە: مەلای ڕەش خەڵکی (عەینتابە)، مەزهەب حەنەفی و تەریقەت نەقشبەندی بووە، ساڵی ١٢٧٧ك ـ ١٨٦٠ز کۆچی دوایی کردووە، تەرجومەی حاشیە طەحطاوی کردووە هەشت بەرگە، لەگەڵ (آداب الذاکرین ونجاة السالکین).

سەرچاوەکان:

١ معجم المؤلفین ٥/١٠٤.

٢ هدیة العارفین ١/٥٠٧

## عبدالحی یوسف کوردی ( ٨٣٧ )

ناوی عبدالحی یە، کوڕی یوسفە، لە زانایە مەزنەکانی (دیمشق)ە، لە زانستەکانی نەقلی دەستی بالا بووە، لە لایەن ئوەیس پاشای (میصر) کرا قازی، دوایی گەڕاوە دیمشق، لەماڵەوە دانیشت هاتووچۆی کەسی نەدەکرد، تەنیا سەردانی قازییەکان و سەرکردەکانی دەکرد، لە پێشدا لەسەر مەزهەبی شافیعی بوو (خوا لێی ڕازی بی)، دوایی چووە سەر مەزهەبی حەنەفی (خوا لێی ڕازی بی)، دوایی کرا (مدرس) لە قوتابخانەی (مەعینیە) پاشان قوتابخانەی (شامییە)ی وەرگرت، ساڵی ١٠٢٥ك - ١٦١٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١ خلاصة الاثر ٢/٣٤٤

٢ علماؤنا في خدمة العلم والدین ٢٦٣

٣. مشاهیر الکورد ٢٥٨

٤. معجم أعلام الکورد ٤٠٨.

## عبدالعزیز ئەحمەد جزیری ( ٨٣٨ )

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی حوسێنی جزیری یە، کرایە قازی، لەسەر مەزهەبی داودی زاهیری ڕۆیشتووە، پیاوەکی قسەخۆش بووە، جارەك دووکەس بە

نوێنەرایەتی یەکێك هاتنە لای مامۆستا لە دادگا، یەکیان لە شەرمان دەستی کرد بە گریان، قازی خۆی تێك نەدا، پێی گوت: نامەی نوێنەرایەتیم پێ بدە، نامەکەی داوە قازی خوێندیەوە، بە کابرای گوت: {کا لەو نامەیە نەنووسراوە ئەتۆ لە باتی ئەو بگریی؟!}، ئامادەبووەکان دەستیان کرد بە پێکەنین، پیاوەکەش بە سەرخۆدا شکاوە، هەستا ڕۆیشت، مامۆستا ساڵی ٣٩١ك – ١٠٠٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١١/٣٤٧.

٢. الكامل ٧/ پەراوێز ٢١١.

٣. شذرات الذهب ٣/١٣٧.

## عبدالعزیز ئەحمەد حەیدەری (٨٣٩)

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا حەیدەری (ماوەرانی)یە، زاتیەکی بەرز بووە، لە ڕەوانبێژی دەستی باڵابووە، لە هەموو زانستەکان بە توانا بووە، لە مەدرەسەی خۆیانی خوێندووە، لە خزمەت باوکی ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە چەند حاشیەی هەنە لەسەر کتێبانی خوێندنی سەرەوە.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٢٩ – ١٤٧.

٢. علماء ومدارس في أربيل ٤٤.

## عبدالعزیز ئەحمەد هەکاری (٨٤٠)

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی عوسمانی کوڕی عیسای کوڕی عومەری کوڕی خضری کوردیە، نازناوی عیزەددینە، مەزهەبی شافیعییە، ساڵی ٦٦٦ك - ١٢٦٧ز هاتووتەدنیا، خەڵکی ناوچەی (هەکار)ە لە کوردستانی تورکیا، دوایی چوویتە (میصر) لەوێ ناوبراوە بە (ابن الخطیب) یەك بووە لە قازییەکانی سەردەمی خۆی،

کتێبەکی دەربارەی (ڕەمەزان) داناوە، هەزار پەند و ئامۆژگاری تیدا هەیە، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٧٢٧ك - ١٣٢٦ز لە (قاهیرە) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:


١. طبقات الشافعية الكبرى ٥/٢٧٤ - ٢٧٥.

٢. شذرات الذهب ٦/٧٧.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٩٧ - ٢٩٨.

٤. معجم المؤلفين ٥/٢٤٢.

٥. الدرر الكامنة ٢/٣٦٨ - ٣٦٩.

٦. معجم أعلام الكورد ٤٣٥ - ٤٣٦.

٧. مشاهير الكورد ٢٧٧.

٨. البداية والنهاية ١٤/١٣٨.

٩. هدية العارفين ١/٥٨١.


## عبدالعزیز سولەیمان ئاشۆکانی (٨٤١)

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی مەلا سولەیمانی کوڕی فەقێ محەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەزیزی کوڕی ڕەسولە، عەشیرەتی (گەردی)یە، مامی نووسەری ئەو مێژووەیە، ساڵی ١٩١٢ز هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە لای مەلا مصطەفای برای دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە لای مەلا عبداللەی برای، لەو شوێنانە لە خزمەتی دا بوو: (مام خاران)، (بنەسراوەی گەورە)، (قەراسنج)، (شەوزار)، (بەحرکە)، (هەولێر)، ماوەکیش لەگەڵ مەلا محەممەدئەمینی برای چووە (شەقلاوە) لای مەلا طاها، ئەمجا بووە مەلا لە گوندی (زێڕاو)ی سورچیان، پاشان نیازی تەواو کردنی خوێندنی هاتە دڵ گەڕاوە (بەحرکە) لای (باوکم) مەلا عبداللەی برای دووبارە دەستی کردەوە بە خوێندن، پاشان چووە مزگەوتی شێخ مصطەفا لە (هەولێر)، ماوە لەوێ تا ساڵی ١٩٤٣ز جەنابی شێخ ئیجازەی مەلایەتی پێدا،

لەگەڵ ئەو مامۆستایانە پێکەوە: مەلا سەید عبداللەی گردەسۆری، مەلا خدری شەمامەری، مەلا عەلی گۆمەگراوی.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (گاوەرە)، دوایی چووە (کەندار)، لەوێ باری کرد، بۆ (مام خاران)، لەوێ چووە (زێلکە)ی سورچیان، لەو هەموو شوێنانە، فەقێی هەبوون.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبدالقادری برای، مەلا ئەحمەدی هەرشەمی، مەلا ڕەسولی کەرەکی، مەلا محەممەد کەریم بەحرکەیی، مەلا محەممەد یوسف جێژنیکانی، مەلا عبدالرحیمی دەربێسانی، مەلا ئەحمەد عبدالرحمان خێڵ، مەلا مصطفەفای ئێرانی.

دوایی باری کرد بۆ (دیبەگە) لەوێ پێش نوێژ و ووتارخوێن بوو، تا ساڵی ١٩٧٩ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی ڕۆژهەڵاتی دیبەگە سەر ڕێگای (کاریتان) بە خاك سپێردرا، دوو کوڕی هەبوون:

١. مەلا سولەیمان: لە جێی بابی دانیشت.
٢. ئیبراهیم: مامۆستایە لە وەزارەتی پەروەردە.

مامۆستا مەلا طاهیری قوشاغلوی، بەبۆنەی سەرەخۆشی پارچە شیعرێکی کوردی و عەرەبی نووسیوە، نمونەی کوردییەکە:

وەرن یارانی دین پەروەر بکەین باشیوەن و زاری
لە چاو خوێناو بارێنین، بە وێنەی هەوری ئازاری
کەوا بولبول لە گولزارا، لە شەققەی باڵیدا ڕۆیی
لە گوڵشەن گوڵ ووشك بوو، لە داخی بولبولی زاری
جیهان بێ بولبول و گوڵ دۆزەخە بۆ دڵ دەسا یاران
ئەجەل هات بولبولی بردو وشك بوو گوڵ لە گولزاری
تەماشا زاتی نوریی، شەهەنشای (یەسرب و بەطحا)
لەژێر خاکی سیا خەوتوو، بە ئەمری ئێزەدی باری

وەکو کۆچی دوایی کرد، ڕەسولی فەخری ئینس و جان
ئەمەش دەمرین هەموو لامان، لە مردن نابی رزگاری
ئەگەر بێ عومری نوحت بێ، بە ئاخیر نەوحە بۆت ئەکرێ
ئەگەر بەم ژینە کەیفت بێ، لە زومرەی فیسق و فوججاری
وەلێ شوکرانە بۆ یەزدان، بە دینی کامیل و ئیمان
لە بۆ جەننەت (عەزیز)ی جان، بە ڕەحمی حەزرەتی باری
هەموو عومری عەزیزی خۆی، سەرف کرد ئەو (عەزیز)ی دڵ
بە زوهد و تاعەت و تەقوا، بەبێ سومع و ریاکاری
سەبەب تاعاتی بێ سومعەت، بە ئیخلاصی بەبێ میریەت
لە فەرز و واجب و سوننەت، بە ڕەحمی ئێزەدی باری
دەسا شوکرانە بۆ یەزدان، وەلی عەهدی سولەیمانە
سولەیمانە سا بباتە سەر، جیهانی پڕ خەم و تاری
ئەوا (پاکی) بە غەمناکی، لە تاریخ بولبولی حاکی
{لە بالغفران}ی هێنادەر، بە دڵ پڕ ئێش و ئازاری
١٣٩٩ك

نمونەی عەرەبییەکە:

| | |
|---|---|
| یاعین غطي بالدموع محاجري | واروي نبات منازلي ومجاوري |
| وابكي الدماء على وفاة أستاذنا | زين العلماء ونور ذاك الناظر |
| ولهاذم اللذات جاء بسرعة | وأتي له مثل الرسول الزائر |
| قد مات بين العلماء العالم | هو مفخرة زمرة الاسلاف المعاصر |
| يسكن اللحد بعظيم مغفرة | بأمر من رب رؤوف قادر |
| قد فارق الخلان مع اوطانه | والكل يبكيه بدمع ماطر |
| فعليه من رب البرية رحمة | وعظيم مغفرة الاله الغافر |

الدهر لايزال دوما غادر وحكمه في الناس حكم الجائر

منا السلام عليه في طول المدى عد النجوم وكل غصن زاهر

ان تسألوني تأريخ وفاته أقول (له بالغفران) ياذا الناظر

١٣٩٩هـ

سەرچاوە: گۆڤاری هەولێر ١٥٤ - ١٥٥، ٢٠.

## عبدالعزیز سولەیمان دەرەتفی (٨٤٢)

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی سولەیمانە، لە دەوری ساڵی ١٢٨٠ك – ١٨٦٣ز لە گوندی (هەرگینە)ی نزیك پێنجوێن هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە قۆناغی موستەعیدی چووە (پێنجوێن) لای مەلا عبدالرحمان، ماوە لەوێ تا ئیجازەی وەرگرت.

بووە مەلا لە گوندی (دەرەتفی) نزیك (مەریوان)، لەوێ دەرسی فەقێیانی دەداوە، مامۆستا بێ نەفس و قسەخۆش بووە، دەگێڕنەوە: دەرسی ئەلفییەی دەدا گەیشتە ئەو جێیە (بتا فعلت....) فەقێیەك گۆتی: مامۆستا (بۆچ دەخوێنیەوە: (فەعەلتو) خەڵك دەڵێن: (فەعەلتە)؟ مامۆستا فەرمووی: {کوڕم پیاو تا هێزی لەبەر بێ، دەبێ کار بکات، منیش دەڵێم: (فەعەلتو)، واتە: کارم کرد، ئەگەر بڵێم: (فەعەلتە)، واتە: تو کارت کرد، منیش ئێستا ساغم، خۆ بە توو نادەم}، ساڵی ١٣٣٧ك – ١٩١٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٩٨ – ٢٩٩.

## عبدالعزیز عبداللطیف بن تەیمییە (٨٤٣)

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی عبداللطیفی کوڕی عبدالعزیزی کوڕی عبدالسلامی بن تەیمییەیە، خەڵکی (حەڕان)ە، لە مانگی شەعبانی ساڵی ٦٦٤ك – ١٢٦٦ز هاتووتەدنیا، لە (میصر) و (ئەسکەدەرییە)ی خوێندووە، ناسراوە بە زاتەکی چاك و چاکەخواز و ڕوو لەخێر، ساڵی ٧٣٦ك – ١٣٣٥ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٢/٢٢٩.

## عبدالعزیز عبدالمنعم حەڕانی (٨٤٤)

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی عبدالمنعمی کوڕی صەقرە، خەڵکی (حەڕان)ە، ساڵی ٥٩٤ك – ١١٩٧ز هاتووتەدنیا، پاش تەواوکردنی خوێندنی چووە (بەغدا) لەوێ دەرسی دەداوە، دەڵێ: جارەك لە (بەغدا) مردیەکمان بردە گۆڕستان کفن دزەکمان بەگەر کەت، مردیەکەمان شاردەوە دزەکە خۆی گیرکرد، کە شەو داهات گۆڕەکەی هەڵکەنی تا کفنەکەی ببا، تومەز پیاوەکە نەمردبوو، تەنیا لەخۆ چووبوو، وایان زانی مردیە و شاردبوویانەوە، کە دزەکە گۆڕەکەی هەڵکەنی یەکسەر پیاوەکە هەستاوە، دزەکە لە ترسان زراوی ڕژا و مرد، بەیانی خەڵکەکە هاتن لەناو ئەو گۆڕەیان شاردەوە، لە ١٤ی مانگی ڕەجەبی ساڵی ٦٨٦ك – ١٢٨٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٣/٣١٥.
٢. شذرات الذهب ٥/٣٩٦.
٣. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/٤٦٣.
٤. معجم أعلام الكورد ٤٣٦.

## عبدالعزیز عوسمان ماردینی (٨٤٥)

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی عوسمانی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی مصطەفایە، خەڵکی ماردینە، زانایەکی مەزن و هێمن و لەسەرەخۆ بووە، زانیاری تایبەتی لە شەریعەت هەبووە، دەرسی داوە، ساڵی ٧٤٩ك – ١٣٤٨ز بە تاعوون کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٢/٢٢٩.
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٩٥.

## عبدالعزیز عوسمان هەولێری ( ٨٤٦ )

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی عوسمانی کوڕی ئەبوطاهیرە، لە هەولێر هاتووتەدنیا، دوایی چووە (دیمشق) لەوێ دەرسی فەرموودەی لای ئەبوبەرەکاتی کوڕی ئیبراهیم خوێند، پاشان چووە (میصر) لەوێ لای محەممەدی کوڕی حامید و فاطیمە خاتوونی کچی سەعدولخەیری خوێند، لە ٦٤٤ك - ١٢٤٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. تأریخ أربیل ١/٢٩٦.

٢. أربیل في مختلف العصور ٩٣.

## عبدالعزیز عەلی دینەوەری ( ٨٤٧ )

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی عەلی کوڕی حامیدە، خەڵکی (دینەوەر)ە، زاتەکی خاوەن سامان بووە، خێر و خێراتی زۆر کردووە، فەرموودەی پێغەمبەری (د.خ) بیستووە و بۆ خەڵکانی گێرایتەوەو ئامۆژگاری کردوون، زانایەکی قسە خۆش و زمان پاراو و ڕەوان بووە، لە ٥١٤ك - ١١٢٠ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الأنساب ١٢/٢٠٣.

## عبدالعزیز عەلی شارەزوری ( ٨٤٨ )

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی عەلییە، ناسراوە بە (ئەبو عبدالله)، ساڵی ٤٢٦ك - ١٠٣٤ز چووە شاری (ئەندەلس)، زانایەکی بە توانا بوو، لە هەموو زانستەکان بەشی زۆری وەرگرتووە، بەتایبەت لە زانیاری قورئانی پیرۆز و مانا لێدانەوەی خەونان شارەزا بووە، دەرسی فەرموودەی لە لای ئەبو ئیسحاقی قورطوبی و ئەبوبەکری باقلانی و دارەقوطنی خوێندووە، چووە شاری (دانیە) لە ئەندەلس، لە گەڕانەوە ڕۆمییە بەدفەڕەکان لەناو پاپۆڕ شەهیدیان کرد، لە بەروارای ٤٢٧ك - ١٠٣٥ز لە تەمەنی صەد ساڵیدا.

سەرچاوە: طبقات المفسرین ١/٣٢٣ - ٣٢٤.

## عبدالعزیز عەلی شنۆیی (٨٤٩)

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی عەلی کوڕی عبدالعزیزی کوڕی حوسێنە، نازناوی (ابوالفضل)ە، خەڵکی شاری (شنۆ)یە، لە دەوروبەری ساڵی ١٠٥٨ز هاتووتەدنیا، لە سەرەتاوە لە کوردستان خەریکی خوێندن بوو، دەوری ساڵی ١٠٧٠ز چووە (بەغدا)، لەوێ زانستە ئیسلامیەکانی تەواوکرد، گەڕاوە (شنۆ)، لەوێ ساڵی ١٠٨٠ز دەستی کرد بە دەرسدانەوەی فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ).

بەشێك لە مامۆستایەکانی: ئەبوجەعفەر محەممەدی کوڕی ئەحمەدی مەسلەمە، لە بەغدا فەرموودەی لەلا خوێندووە وە هەروەها ئەبو ئیسحاقی شیرازی ئیبراهیم کوڕی عەلی لە (بەغدا) شەریعەتی لە لا خوێندووە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: فەضلی کوڕی محەممەدی نوقانی و محەممەدی کوڕی ئیبراهیم ئەبوبەکر شنۆیی.

کۆچی دوایی: مامۆستا ساڵی ٥٥٠ك - ١١٥٥ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی:

١. التذکرة: شەریعەتە لەسەر مەزهەبی شافیعی لە ٥٢٣ك تەواوی کردووە.
٢. الکفایة: باسی دابەشکردنی میراتە، مەلا فائیز ئەبوبەکر قادر بیرێژی ساڵی ٢٠٠٢ز لێکۆڵینەوەی لە سەر کرد، وە پلەی (ماستەر)ی لەسەر وەرگرت.

سەرچاوەکان:

١. طبقات الشافیعة الکبری ٤/١١٠.
٢. طبقات الشافعیة / ئەسنەوی ١/٩٨ - ٩٩.
٣. الأعلام ٤/١٤٧.
٤. معجم المؤلفین ٥/٢٥٣.
٥. تأریخ أربیل ١/٧٠.
٦. هدیة العارفین ٥/٥٧٩.

٧. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٩٤ -- ٢٩٥.

٨. كشف الظنون ٢/١٢٤٥.

٩. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/٢٢٥ - ٢٢٨.

## عبدالعزيز محەممەدئەمین موفتی (٨٥٠)

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی محەممەدئەمینی کوڕی مەلا ئەحمەدە، ساڵی ١٢٨٨ك -- ١٨٧١ز هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، ساڵی ١٣١٥ك -- ١٨٩٧ز باوکی کۆچی دوایی کرد، هەرچەندە لەوکاتە خوێندنی تەواو نەکردبوو، بەڵام لە جێگای باوکیان دانا، پاشان ئارەزووی خوێندنی کردەوە، دووبارە لەگەڵ مەلا مەحمودی برای بۆ خوێندن چووە (بیارە)، دوایی چووە (پێنجوێن) لای مەلا عبدالرحمان، ماوە تا ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (سلێمانی) دەستی کرد بە دەرسدانەوە، پاشان کرا (موفتی) سلێمانی، دوایی کرا ئەندامی کۆڕی زانستی عوسمانی، پاشان کرا سەرۆکی کۆڕی زانیاری (سلێمانی)، هەروەها ساڵی ١٣١٨ك -- ١٩٠٠ز حکومەتی عوسمانی فەرمانی موفتی بڕووسە و ئەدرنەی بۆ دەرکرد، بەڵام مامۆستا نەی کرد وازی هینا، مامۆستا شاعیر بوو نازناوی فەوزییە.

مامۆستا خەریکی پێش نوێژ و فەتوا و دەرسدانەوە و ئامۆژگاری بوو تا لە ٢٠/٨/١٩٤٧ کۆچی کرد، مەلا مەحمودی برای (بێخودی شاعیر)، لە جێگای دانیشت.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٢٩٥ -- ٢٩٧.

٢. بنەماڵەی زانیاران ٤٦٤.

٣. معجم أعلام الكورد ٤٣٥.

٤. أعلام كورد العراق ٤٧٢ -- ٤٧٣.

## عبدالعزيز محەممەد پرێسی (٨٥١)

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی محەممەدە، عەشیرەتی (هورحەسەنە) نزیك (سەیدصادق)، لە دەوروبەری ساڵی ١٣٠٣ك -- ١٨٨٥ز هاتووتەدنیا، لە سەرەتاوە لە هەڵەبجە و

ئەبوعوبەیدەی خوێند، دوایی چووە (بیارە) لای مەلا قادر ماوە تا ئیجازەی وەرگرت، هەروەها تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ نەجمەدین وەرگرت، لە گوندی (پرێس) لای حامید بەگی جاف بووە مەلا و (مدرس)، خەریكی ئامۆژگاری و پێكهێنانەوەی خەڵكان وجێبەجێ كردنی كاروباری ئاینی بوو، تا ساڵی ١٣٦٠ك – ١٩٤١ز كۆچی دوایی كرد، چوار كوڕی مەلای هەبوون: مەلا عومەر و مەلا عوسمان و مەلا عەلی و مەلا صەدیق.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدین ٢٩٩ – ٣٠١.

## عبدالعزیز محەممەد حەڕانی (٨٥٢)

ناوی عبدالعزیزە، نازناوی بەدرەدینە كوڕی محەممەدی كوڕی محەممەدی كوڕی عەلی كوڕی ئەحمەدی كوڕی عبداللهی كوڕی عومەری كوڕی حەیاتی كوڕی قەیسە، خەڵكی (حەڕان)ە، لە (دیمشق) دابەزیوە، نووسەر و شاعیر بووە دانراوی خۆی زۆرن، ساڵی ٨٣٩ك – ١٤٣٥ز كۆچی دوایی كردووە.

سەرچاوەكان:

١. الضوء اللامع ٤/٢٠٤.
٢. معجم المؤلفین ٥/٢٦١.
٣. هدیة العارفین ١/٥٨٢.
٤. معجم أعلام الكورد ٤٣٧.

## عبدالعزیز محەممەد دۆلپەمۆیی (٨٥٣)

ناوی عبدالعزیزە، كوڕی محەممەدی كوڕی ڕەسولی كوڕی حەسەنی كوڕی عبداللهی كوڕی عەلی كۆسەی كوڕی شێخ محەممەدی نۆدەییە، لە دەوری ساڵی ١٣٠٥ك – ١٨٨٧ز هاتووتەدنیا، لە گوندی (دۆلپەمۆ)ی سەر بە (بەرزنجە)، دەستی كرد بە خوێندن، پاشان چووە (سلێمانی) دوایی چووە (شێخەلمارین)، پاشان چووە (پێنجوێن)، دوایی چووە (بالك) لای مەلا محەممەد، دوایی گەڕاوە (شێخەلمارین)، لەوێ كۆتایی بە خوێندن هێنا، گەڕاوە گوندەكەی خۆی بووە مەلا، دەستی كرد بە دەرسدانەوە، خزمەتی ئاینی پیرۆز،

دەوری ساڵی ١٣٨٥ك – ١٩٦٥ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی گوندەکە بە خاك سپێردرا. کتێبی: (التحفة الكردية فاكهة القصيدة البردية)ی داناوە لە ١٣٥٨ك تەواوی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٠١ – ٣٠٢.

٢. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٧/٣٣٥ – ٣٣٦.

## عبدالعزیز محەممەد شاخەپیسکەیی (٨٥٤)

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی محەممەدی کوڕی عبداللەیە، ساڵی ١٨٩٥ز لە گوندی (کانی دەربەند) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغی سوختەیی تەواوکرد، چووە (هیران) لای مەلا ئەحمەد، ماوەك چووە (بالیسان) لای مەلا شێخ طاها، ماوەك لە لای مەلا ئەحمەد بەهائەددین بوو لە (کۆیە)، دوایی هاتە (هەولێر) لای شێخ مصطەفای نەقشبەندی لەوێ کۆتایی بە خوێندن هینا، لە گوندانی (کانی دەربەند) و (شاخەپیسکە) خەریکی دەرسدانەوە و کاروباری مەلایەتی بوو، تا دەوری ساڵی ١٩٦٥ز کۆچی کرد.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عبدالعزیز محەممەد کۆیی (٨٥٥)

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی محەممەدی کوڕی ئوەیسی کوڕی قەرەنی کوڕی محەممەدی کوڕی شێخەیە، ساڵی ١٨٩٥ز لە (کۆیە) گەڕەکی قەڵات هاتووتەدنیا.

خوێندنی: دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، چەند کتێبی فارسی و سەرەتایی تەواوکردن، لە قوتابخانانی (کۆیە) و (کەرکوك) لە لای چەند زانایانی خوێند، بەشێك لەوانە: مەلا شێخ حوسێن، شێخ محەممەدئەمینی بێژەو، حاجی بابە شێخ، مەلا خەلیلی میراوەیی، مەلا عبداللەی جەلی زادە، شێخ عەلی حیسامەدین، ساڵی ١٩١٤ز چووە (سەردەشت) ساڵی ١٩٥١ز کرا پێش نوێژ و سەرخەتمی خانەقای (بیارە)، ساڵی ١٩٥٣ز چووە سەفەری حەج.

ئاوارەبوونی مامۆستا: ساڵی ١٩٢٦ز ڕەزا شا حوکمی وەرگرت، چەند فەرمانی دژ بە ئاینی ئیسلامی دەرکرد، خۆداپۆشینی ژنانی قەدەغە کرد، دەبەرکردنی جل و بەرگی ڕۆژئاوایی فەرزکرد، مامۆستا و چەند مەلایانی تر، لە دژ ئەو فەرمانانە هەستان، ڕژێمی شا خەریك بوو دەستگیری بکات، ناچار خۆی قوتارکرد، هاتەوە کوردستانی عێراق، پاشان ماڵ و منداڵەکانی داوای گەڕانەوەیان لێ کرد، لەسەر داوای ئەوان گەڕاوە (سەردەشت)، هەر شەوی یەکەم ساڵی ١٩٣٩ز گیرا، ڕەوانی بەندیخانەی تارانیان کرد، سێ ساڵان لەوێ ماوە، پاشان دوورخراوە بۆ (یەزن)، دوایی ئازادکرا.

مامۆستا شیعری کوردی و عەرەبی و فارسی هەیە، ساڵی ١٩٨٣ز لە مزگەوتی دارالسلامی (سەردەشت) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٣٠٩ — ٣١٠.

## عبدالعزیز مصطەفا هیرانی ( ٨٥٦ )

ناوی عبدالعزیزە، کوڕی کاك مصطەفای (صاف) کوڕی کاك عبدالله (ثانی) کوڕی کاك عەلی کوڕی کاك مصطەفای کوڕی کاك عبداللەی کوڕی شێخ سولەیمانە، ساڵی ١٩١٨ز لە (هیران) هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە لای مەلا طەیب، پاشان چووە (سکتان) لای مەلا عبدالله، دوایی چووە (بالیسان) لای مەلا شێخ طاها، ماوەك چووە (سەران) لای مەلا عبدالله، دوایی چوو (کۆیە) لای جەنابی مەلا محەممەدی جەلی، ماوە لەوێ تا ئیجازەی وەرگرت گەڕاوە (هیران) چەند ساڵان لەوێ دەرسی دەدا، دوایی هاتە (هەولێر) مزگەوتی حاجی عبدالله حەمامچی لە گەڕەکی (تەیراوە)، لەوێش فەقێی هەبوون، بەردەوام بوو لەسەر خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، تا ساڵی ١٩٨٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. محمد بن عبدالله الجلي ١٢٧.

٢. دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عبدالعظیم سەروابادی (٨٥٧)

مامۆستا عبدالعظیم زانایەکی مەزن و بە دین و بەناوبانگ بوو، باب و باپیرانی لە ناوچەی خۆشناوەتی دادەنیشتن بەلام خۆی مەلای (سەرواباد) بوو، خەلکەکە بۆ پرسیارانی شەریعەت دەهاتنە لای، کتێبەکی کۆکردبۆوە ناوی نابوو (المنقول) تەماشای دەکرد و وەلامی دەدانەوە، دەوری سالی ١٣٢٥ك – ١٩٠٧ز کۆچی دوایی کرد.

چوار کوڕی زانای هەبوون: مەلا عبدالمجید: جێگری بوو، وە مەلا عبدالرحیم: زاتەکی چاك بوو، وە مەلا عبدالکریم: زوو جوانەمەرگ بوو وە مەلا عبدالحکیم: پیاوێکی چاك بوو.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدین ٢٩٤.

## عبدالعظیم عبدالمجید موجتەهیدی (٨٥٨)

ناوی عبدالعظیمە، کوڕی عبدالمجیدی کوڕی مەلا حەمزەی کوڕی مەلا عەبباسە، یەکە لە پیاو ماقولانی شاری (سنە)، سالی ١٢٨٥ك – ١٨٦٨ز هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە سەرەتاوە لە خزمەت باوکی بوو، دوایی چووە لای مەلا سەید عبداللّٰهی چۆڕی، پاشان چووە (بیارە) لای مەلای (گەورە)، تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عومەر وەرگرت (خوا لێی خۆش بی)، گەڕاوە (سنە) بووە مەلا لە مزگەوتی (قەرچیان)، قوتابخانەی فەقێیانی کردەوە، دەستی کرد بە دەرسدانەوە.

مامۆستا ناوبانگی ڕۆیشت بوو بە (توحفە)زان، حاشیەی لەسەر (توحفە) و (جمع الجوامع) و (تهذیب) و (تشریح) هەیە، چەند نامیلکەی دەربارەی باوەڕی و تەصەووف و شەریعەت داناوە، سالی ١٣٦٧ك – ١٩٤٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٢٩٣.

٢. تأریخ مشاهیر کورد ٢/٣١٣ – ٣١٤.

## عبدالغفار شەمسەدین مەردۆخی (٨٥٩)

ناوی عبدالغفارە، کوڕی شەمسەدینی کوڕی عبدالغفاری، مەردۆخی یە، ساڵی ٩٦٩ك – ١٥٦١ز لە گوندی (دەگاشێخان) هاتووتەدنیا، زانایەکی زۆرزان بووە لە دکتۆری و ئەستێرەناسی و ژمێریاری و ئەندازە، سەفەری گوندی (شوش)ی نزیك (ئاکرە)ی کرد، لەوێ تەریقەتی لە شێخ شەمسەدین وەرگرت، گەڕاوە.(دەگاشێخان)، ساڵی ١٠٢٦ك – ١٦١٧ز لە گوندی (حەسەن ئاباد) نزیك (سنە) کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی زانای هەبوو ناو شەمسەدین.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٠٣.

٢. بنەماڵەی زانیاران ١٢٣.

## عبدالغفار عبدالرحمان دینەوەری (٨٦٠)

ناوی عبدالغفارە، کوڕی عبدالرحمانە، نازناوی (ئەبوبەکرە)، زانایەکی شەرع زان بووە، لە (بەغدا) لەسەر مەزهەبی سەفیانی ثەوری فەتوای دەدا، سەرپەرشتی کاروباری مزگەوتی (مەنصور)ی دەکرد، ساڵی ٤٠٥ك – ١٠١٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: البداية والنهاية ١١/٣٧٣.

## عبدالغفار عبداللە بەندەنیجی (٨٦١)

ناوی عبدالغفارە، کوڕی عبداللەی کوڕی محەممەدی کوڕی ئەبولغەنائیمی کوڕی فەضلە، خەڵکی (بەندەنیج = مەندەلی)یە، بۆ خوێندن چوویتە (بەغدا) لەوێ تەواوی کردووە، دەرسی داوە، لە ٧٠٨ ك – ١٣٠٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٢/٣٨٦.

## عبدالغفار گۆشایش مەردۆخی (٨٦٢)

ناوی عبدالغفارە، کوڕی مەلا گۆشایشی کوڕی محەممەدە، ساڵی ٨٤٧ك – ١٤٤٣ز لە هەورامان هاتووتەدنیا، لە لای باوکی پەروەردە بووە، کە کۆتایی بە خوێندن

هینا چووە گوندی (دەگاشێخان) دەستی کرد بە دەرسدانەوە و جێبەجێ کردنی کاروباری ئاینی، تا ساڵی ٩٣٤ك – ١٥٢٧ز کۆچی دوایی کرد، شەمسەدینی کوڕی جێگری بوو.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٠٢.

٢. بنەماڵەی زانیاران ١٢٠ – ١٢٢.

٣. تأريخ مشاهير الكورد ١/١٤٥ – ١٤٦.

## عبدالغفور ئەحمەد حەیدەری (٨٦٣)

ناوی عبدالغفورە، کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا حەیدەری ماوەرانی یە، قەڵای زانست بووە، دەنگوباسی مەلا چاکی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا بەلاوبوویتەوە، فەقێیان لە هەموو لاوە ڕوویان تێکردووە، ئایین و شەریعەتیان لێ وەرگرتووە، حاشیەی سوودبەخشی لەسەر (قول أحمد)ی مەنتیق هەیە، بە داخەوە بە گەنجی ساڵی ١١٥٣ك – ١٧٤٠ز جوانەمەرگ بوو.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٢١٦.

٢. عنوان المجد ٨٧.

٣. علماء ومدارس في أربيل ٤٣.

## عبدالغفور ئەسعەد حەیدەری (٨٦٤)

ناوی عبدالغفورە، کوڕی مەلا ئەسعەدی کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی صبغةالله ئەفەندی گچکەیە، زانایەکی بەرزی حەیدەرییەکانی ماوەرانێ یە، لە شەریعەت دەستی باڵا بووە موفتی شافیعییەکان بووە، مریدی مەولانا خالیدی نەقشبەندی بووە، کوڕێکی زانا و ڕۆشنبیری هەبووە، ناو محەممەدئەمین، ئەویش موفتی شافیعی یان بووە حاشیەی لەسەر (میصری) و (قەرەباغی) هەیە، پارچە شیعرەکی لە مەتحی صبغةالله ی ئیبراهیم حەیدەر داناوە، بە گەنجی جوانەمەرگ بوو.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٣٠ – ١٤٧.

٢. بنەماڵەی زانیاران ٢٤٠.

٣. علماء ومدارس في أربيل ٥٧.

## عبدالغفور لەبیب ئەفەندی (٨٦٥)

ناوی عبدالغفورە، ناسراوە بە لەبیب ئەفەندی، فەقێی مەلا (حامی) بووە، ماوەی بیست ساڵان لە (دیاربەکر) موفتی بووە، نووسەر و شاعیر بووە، ساڵی ١١٨٥ك – ١٧٧١ز کۆچی دوایی کردووە، چەند دانراوی هەیە، لەوانە: (حاشیة علی تفسیر البیضاوي) و (رسالة في الأصول) و (رسالة في السیاسة) و (دیوانی شیعر).

سەرچاوەکان:

١. هدیة العارفین ١/٥٨٨.

٢. معجم المؤلفین ٥/٢٦٩.

٣. مشاهیر الکورد ٢٧٧ – ٣٤٨.

٤. معجم أعلام الکورد ٤٣٩ – ٥٦٥.

## عبدالغنی حوسێن جزیری (٨٦٦)

ناوی عبدالغنی یە، کوڕی حوسێنی کوڕی یەحیایە، خەڵکی جزیرەیە، لە زۆر شوێنان گەڕاوە، سەفەری (هیند)ی کردووە، ساڵی ٧٨١ ك چووە (دیمشق)، زانایەکی نووسەر و خەت خۆش و شاعیر بووە، جارەك سەفەر دەکات بۆ جێگایەکی دوور، شەو دادێ دەچێتە مزگەوت لەگەڵ چەند کەسان لەوێ بخەون، مەلایەکە دەڵێ: ئاگاداربن شێر لەو ناوچەیە زۆرن نەتانخۆن، مەلا دەچێتەوە ماڵ ئەوان دەمێننەوە، لەبەر ئاگردان دادەنیشن، شەو ڕادەشکێت شێرەك لێیان دێتە ژوورەوە، ئەوان زۆر دەترسن، بەڵام شێرەکە دەست لە کەس نادا، لەگەڵ ئەوان دادەنیشی، کە بەیانی دەدا یەکەم کەس مەلا

دێتەژورێ، شێرەکە پڕی دەداتـیێ و دەیخـوا و دەڕوا، نـاوبراو سـاڵی ٨٠٢ك – ١٣٩٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٢/٣٨٨.

## عبدالغنی محەممەد بن تەیمییە (٨٦٧)

ناوی عبدالغنی یە، کوڕی محەممەد خضری بن تەیمییەی حەڕانی یە، سـاڵی ٥٨١ك – ١١٨٥ز هاتووتەدنیا، دەرسی لە (حەڕان) خوێندووە، پاشان چـوویتە (بەغـدا)، دوایـی گەڕایتەوە وڵاتی خۆی لە جێگای باوکی دانیشـتووە، سـاڵی ٦٣٩ك – ١٢٤١ز کۆچـی دوایی کـردووە، کتێبـانی (إهـداء القـرب إلى سـاكنی الـترب) و (الزوائـد علـى تفسـير الوالد)ی داناوە، کوڕێکی هەبووە ناو (عەلی): لە ٦١٩ك – ١٢٢٢ز لە دایك بووە، لە ٧٠١ك – ١٣٠١ز کۆچی دوایی کردووە، ئەویش کوڕێکی هەبووە ناو (عبدالرحمان).

سەرچاوەکان:

١. طبقات المفسرين ١/٣٢٥.
٢. معجم المؤلفين ٥/٢٧٦.
٣. الدرر الكامنة ٣/ ٦٣.
٤. هدية العارفين ١/٥٨٩.
٥. إيضاح المكنون ١/١٥١.
٦. شذرات الذهب ٥/٢٠٤ – ٢٠٥.
٧. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/٢٢٢.

## عبدالغنی مەنصور حەڕانی (٨٦٨)

ناوی عبدالغنی یە، کوڕی مەنصوری کوڕی مەنصوری کوڕی ئیبراهیمـی کـوڕی عەبادەیە، ساڵی ٦٣٥ك – ١٢٣٧ز لە (حەڕان) هاتووتەدنیا، دەرسی لە لای مەجـدەدین بن تەیمیە خوێندووە، لە شەریعەت شارەزا بووە، دەنگی زۆر خۆش بـووە، لـە ٧٠٥ك – ١٣٠٥ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١ الدرر الكامنة ٢/٢٣٦

٢ الذيل على طبقات الحنابلة ٤/٤٣٣.

## عبدالغنی موسا جزیری (٨٦٩)

ناوی عبدالغنی، کوڕی موسای کوڕی ئەحمەدە، نازناوی (عیمادەددین)ە، ساڵی ٨٢٥ك – ١٤٢٢ز هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (حەلەب) لای مەلا یوسفی کوردی، ساڵی ٨٩٤ك چووە (قاهیرە) لای مەلا عبداللە ی گۆران، ساڵی ٨٩٥ك چووە سەفەری حەج، مامۆستا ناسرابوو بە زانایەکی شارەزا، لە شەریعەت و عەرەبی و مەنتیق.

سەرچاوەکان:

١ الضوء اللامع ٤/٢١٥

٢ مشاهير الكورد ٢/٢٨

٣ معجم أعلام الكورد ٤٤٠.

## عبدالغنی یەحیا حەڕانی (٨٧٠)

ناوی عبدالغنی یە، کوڕی یەحیای کوڕی محەممەدی کوڕی عبداللەی کوڕی نەصری کوڕی ئەبوبەکرە، ساڵی ٦٤٥ك – ١٢٤٧ز لە (حەڕان) لە دایك بووە، ساڵی ٦٥٦ك لە حەڕان دەرچوو، چەند ساڵ لە (دیمشق) ماوە، لەوێ ئیجازەی لە عبدالسلامی بن تەیمیە وەرگرت، گەڕاوە (قاهیرە) لەوێ کرا قازی حەنبەلییەکان، دەرسی دەدا دوایی گەڕاوە (دیمشق)، لە ٧٠٩ك – ١٣٠٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١ البداية والنهاية ١٤/٦١

٢ الدرر الكامنة ٢/٢٣٦

٣ الذيل على طبقات الحنابلة ٤/٣٥٨.

٤. معجم أعلام الكرد ٤٣٩.

## عبدالفتاح مەحمود خەتی (٨٧١)

ناوی عبدالفتاحە، کوڕی مەلا مەحمودی کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی عبدالرحمانی کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی شێخ سولەیمانە، دەوری ساڵی ١٨٦٨ز لە گوندی (خەتە) چاوی خۆی هەڵێناوە لە دنیا.

خوێندنی: دەستی کرد بە خوێندن لە پلەی موستەعیدی چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادر، چوار ساڵان ماوە، لەو ماوەیە شەرحی مەواقیفی خوێند کە هەشت بەرگە، مەواقیفی هەموو لەبەرکرد کە چوار بەرگە، دوایی چووە (پێنجوین) لای مەلا عبدالرحمان، دوایی چووە (کۆیە) لای مەلا عبداللەی جەلی، پاشان مامۆستا جەلی نامەکی بۆ نووسی ناردیە لای مەلا عومەر ئەفەندی (هەولێر)، هاتە مزگەوتی قەڵات، ماوە لە خزمەت عومەر ئەفەندی تا ساڵی ١٨٩١ز عومەر ئەفەندی کۆچی دوایی، مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی کوڕی بووە جێگری، ئیجازەی مەلایەتی بە مامۆستا (عبدالفتاح)دا، گەڕاوە (خەتێ) ماوەك لەوێ مەلا بوو، چووە (دیبەگە)، حەوت ساڵان لەوێ بوو، گەڕاوە (خەتێ).

بەشێك لە فەقێیەکانی: شێخ مصطفای نەقشبەندی، مەلا صالحی کۆزەپانکەیی، شێخ عبدالکریمی ئۆمەراوە، مەلا ئیبراهیمی خەتێ، مەلا یەحیای ماجیدی، مەلا فتح اللەی هەرتەلی.

کۆچی دوایی: مامۆستا دەوری ساڵی ١٩٢٣ز کۆچی دوایی کرد.

دوو کوڕی مەلای هەبوون:

١. مەلا عبداللە: دەوری ساڵی ١٩٧٧ز کۆچی دوایی کرد، مەلا عبدالباسط کوڕی ئەو زاتەیە ئێستا ماوە.

٢. مەلا محەممەد: دەوری ساڵی ١٩٩٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماء ومدارس في أربيل ١١٦.

## عبدالقادر ئیبراهیم سوریژەیی (٨٧٢)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی ئیبراهیمە، ساڵی ١٩٠٦ز لە گوندی (سوریژە) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە قۆناغی موستەعیدی چووە گوندی (دێمەکار) لای مەلا ئەحمەدی ڕەش، دوایی چووە (ترپەسپیان) لای مەلا شێخ جەلال ماوەکیش لە (گردمەلا) و (گردەسۆر) لای مەلا شەریفی دووشیوانی بوو، ئەمجا ئاودیوی (ئێران) بوو، چووە لای مەلا عبداللەی بورهانی، گەڕاوە عێراق هاتە (هەولێر) مزگەوتی حاجی قادر دەباغ، لای مەلا عبداللەی بێتواتی، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، بووە مەلا لە (سوریژە) لای حاجی ئەمین ئاغا، دوایی چووە (سۆربەش) بەردەوام بوو لەسەر دەرسدانەوە و مەلایەتی، تا ساڵی ١٩٦٦ز لە (هەولێر) کۆچی دوایی کرد، چەند کورتە حاشیەی هەنە لەسەر کتێبانی خوێندن.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عبدالقادر ئەحمەد پۆریجەیی (٨٧٣)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی عبدالله یە، ساڵی ١٨٩٠ز لە گوندی (قەراتە سۆران) هاتووتەدنیا.

دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغی سوختەیی تەواوکرد، ماوەی دوازدە ساڵان وازی هێنا، دوایی چووە (بێتواتە) لە لای مەلا (نەبی) دووبارە دەستی کردەوە بە خویندن، پاشان چووە (عەوێنە) لای مەلا عوسمان، دوایی هاتە (هەولێر) لای مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی لە مزگەوتی قەڵات، دوایی چووە مزگەوتی شێخ نورەدین لای مەلا صاڵحی کۆزەپانکەیی ئیجازەی وەرگرت، مەلایەتی لەو گوندانە کرد: (گعێتل)، (دەربەندی سەیدان)، (چۆمەزەردەرە)، (پۆریجە).

بەشێك لە فەقێیەکانی ئەوانەن: مەلا عبداللەی فەرهادی، مەلا خضری عارەبکەندی، مەلا خضری جانەی، مەلا محەممەدئەمینی لهێبانی.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٥٤ز کۆچی دوایی کرد، مەلا محەممەدی کوڕی ماوەك وەزیری ئەوقاف و کاروباری ئاینی بوو لە (هەولێر).

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عبدالقادر ئەسعەد حەیدەری (٨٧٤)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی ئەسعەدی کوڕی عبداللهی کوڕی صبغةاللهی گچکەیە، ناسراوە بە (صیدقی)، لە خزمەت باوکی خوێندووە، زۆر زانا و زیرەك بووە، شاعیرەکی چاك بووە ئەدەبیاتی زۆر لەبەر بووە، قسەخۆش و مەجلیس خۆش و ئاوەدان بووە.

لە دەوری سەعید پاشای سولەیمان پاشا کرا قازی (بەصرە)، لە دەوری داود پاشا دووبارە کراوە قازی، تا ساڵی ١٢٣٤ك – ١٨١٨ز ئەو پلەی هەرمابوو، نووسینی بەهێزی لە عەرەبی و فارسی و تورکی هەیە، کتێبی (المکفرات)ی داناوە لە باسی ئەو شتانەی خەڵك لە دین وەر دەگێڕی، ئاو قەرانە لەگەڵ کتێبی (القواطع)ی ئیبن حەجەر، مامۆستا لە شاری (بەصرە) کۆچی دوایی کرد، نزیك گۆڕی پیرۆزی حەزرەتی (زوبەیر) (خوا لێی رازی بی) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٣١ – ١٤٥ – ١٤٦.
٢. علماء ومدارس في أربيل ٥٧.
٣. بنەماڵەی زانیاران ٢٣٩.
٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/١٩٢ – ١٩٣.

## عبدالقادر ئیسماعیل ماجیداوەیی (٨٧٥)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی ئیسماعیلی کوڕی جەرجیسی کوڕی حەسەنی کوڕی قادری کوڕی رەسولی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی نەبی یە، ساڵی ١٩١١ز لە گوندی (ماجیداوە) هاتوەتەدنیا.

خوێندنی: لە منداڵییەوە دەستی کرد بە خوێندن، لە قۆناغی سوختەیی ماوەك لای مەلا ئەبوبەکری بانی مارانی بوو، ماوەك لە لای مەلا غەفوری بانی مارانی، دوایی لە هەولێر مزگەوتی حاجی قادر لای مەلا ڕەشیدی سێگردکانی بوو، لە قۆناغی موستەعیدی چووە لای مەلا عوسمانی (خورمەڵە)، ماوەکیش چووە (دیبەگە) لای مەلا ئیسماعیلی جدیدەیی، پاشان گەڕاوە (هەولێر) مزگەوتی شێخ نورەدین، لای مەلا صالحی کۆزەپانکەیی، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە (ماجیداوە)، چەند ساڵان لەوێ دەرسی دەداوە، پاشان ساڵی ١٩٥٨ز هاتە (هەولێر)، وازی لە مەلایەتی هێنا، لە ٣٠/٤/١٩٨١ز کۆچی دوایی کرد، دوای ئەو لەسەر وەسیەتی خۆی، کوڕەکانی مزگەوتەکی چاکیان دروست کرد لە گەڕەکی (مهندسین)، بەناوی مزگەوتی ماجیدی، مامۆستا چەند کورتە حاشیەی لەسەر (ئەبو طالیبی سیوطی) و (قزلجی) تەصریفی مەلا عەلی هەیە، کوڕی گەورەی ئیسماعیلە، چەند کوڕی تری هەنە.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عبدالقادر ئەمیری شنۆیی ( ٨٧٦ )

ناوی عبدالقادرە، کوڕی ئەمیری کوڕی بەختیاری کوڕی خلەی کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالله یە، باپیرەگەورەی لە (مەرگەوەڕ) هاتۆتە (شنۆ)، (ئەمیری) لە شنۆ هاتووتە (هەولێر)، عبدالقادر ساڵی ٥٨٤ك – ١١٨٨ز لە (هەولێر) هاتووتەدنیا، زانایەکی بە دین و شەرع زان و فەرموودەناس بووە، ساڵی ٦٢١ك – ١٢٢٤ز کۆچی دوایی کردووە، لە گۆڕستانی (مشهدالکف) – لەوانەیە پەنجەعەلی بی نزیك مزگەوتی شێخ مصطەفا – بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: أربيل في العهد الأتابكي ٢٢٤.

## عبدالقادر باپیر کانی دەربەندی (٨٧٧)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی باپیری کوڕی عبدالله یە، سالّی ١٩٠٧ز لە گوندی (کانی دەربەند)ی ناوچەی (کۆیە) هاتووتەدنیا، قورئانی پیرۆزی لە لای مەلا عبدالله ی ماویلی خوێند، دوایی لەگەڵ مامۆستای چووە (سکتان) لەوێ خەریکی خوێندنی نەحو و صەرف بوو، گەڕاوە (کانی دەبەرند) ماوەك لای مەلا عەزیز بوو، دوایی چووە (بێتواتە) لای مەلا محەممەد مەلا نەبی حەیدەری، دوایی چووە (هەرتەل) لای مەلا فتح الله، دوایی چووە (بالیسان) لای مەلا شێخ طاها، دوایی چووە (شەقلاوە) فەلەکیاتی لای مەلا طاها خوێند، هەر لەوێ سالّی ١٣٤٩ك – ١٩٣٠ز (بەدیعە)ی مەلا ئەفەندی هەولێری نووسیەوە، گەڕاوە (کۆیە) ماوەك لای مەلا صادیق و ماوەك لای مەلا عەلی باداوە و ماوەك لای مەلا بەهائەدین ماوە، چووە (هەولێر) لای مەلا محەممەدئەمینی کونەفلوسە، لە مزگەوتی حاجی قادر، گەڕاوە (کۆیە) لای جەنابی مەلا محەممەدی جەلی، ماوە تا ئیجازەی مەلایەتی پێ بەخشی لەگەڵ مەلا ئەبوبەکری کۆیی و مەلا سەعیدی ئاوماری.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (گۆپتەپە) ناوچەی (کۆیە)، بیست سالآن پتر لەوێ مەلا بوو، پاشان باری کرد بۆ (کۆیە)، کرا مەلا لە مزگەوتی مەلا عومەر، دوایی کرا (واعیز) پاشان خانەنشین کرا، لە مالّی خۆی دەچوونە لای بۆ فەتوا و کاروباری ئاینی، لە ٢٠٠٦ز کۆچی دوایی کرد، مامۆستا ناسرابوو بە زانایەکی زیرەك و ئاگادار لە زانستەکان.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا صەدیقی ئێلنجاغی، مەلا محەممەدئەمینی چۆمحەیدەری.

سەرچاوەکان:

١. محمد بن عبدالله الجلي ٢٥.
٢. دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عبدالقادر جەلالەدین نۆدشەیی ( ٨٧٨ )

ناوی عبدالقادرە، کوڕی جەلالەدینی کوڕی مەلا عبدالرحمانی نۆدشەیی یە، لەو گوندە ساڵی ١٣٠٠ك – ١٨٨٢ز هاتووتەدنیا، هەر لەوێ دەستی کرد بە خوێندن، دوایی لە شاری (سنە) و گوندی (بیارە) خوێندنەکەی بردەسەر، بووە مەلا لە گوندی (دەگاگا)ی هەورامان لە (ئێران).

مامۆستا زاتەکی زیرەك و بەڕێز بوو، بۆ پرسیارانی شەریعەت خەڵکان ڕوویان تێ دەکرد، حەزی لە دەرسدانەوەی (شافییە)ی صەرف بوو، لە دەوری ساڵی ١٣٦٥ك – ١٩٤٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣١٥.

## عبدالقادر سولەیمان ئاشۆکانی ( ٨٧٩ )

ناوی عبدالقادرە، کوڕی مەلا سولەیمانی کوڕی فەقێ محەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەزیزی کوڕی ڕەسولە، عەشیرەتی (گەردی)یە، مامی دانەری ئەو مێژوووەیە، ساڵی ١٩٢٨ز لە گوندی (کۆڕێ) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن لە گوندی (مام خاران)، دوایی چووە لای مەلا عبدالعزیزی برای لە (بەحرکە)، گەڕاوە (مام خاران)، گەڕاوە (بەحرکە)، چووە (کەسنەزان) لای مەلا محەممەدئەمینی سوێری، گەڕاوە (بەحرکە)، چووە (کەندار) لای مەلا عبدالعزیزی برای، چووە (میرەدێ)، گەڕاوە (بەحرکە)، چووە (سێبیرانی گەورە) لای مەلا عبدالکریم، چووە (گەزنە) لای مەلا ئەحمەد، گەڕاوە (بەحرکە)، دوایی چووە (گڕاو) لای مەلا ئەبوبەکر، گەڕاوە (بەحرکە)، چووە (باقرت)ی قەراج، لای مەلا ئەحمەدی مامی، گەڕاوە (بەحرکە) لای مەلا عبداللّٰەی برای (باوکم)، ئەو کتێبانەی خوێندن: شرح الشمسية، برهان المنطق، مختصر المعاني، جمع الجوامع، تشريح الافلاك، فەرائیزی شرح المنهج، تحفة المحتاج، تفسير المدارك. هەر لەوێ ساڵی ١٣٧٦ك – ١٩٥٦ز مەولودنامەی نووسییەوە.

مەلایەتی: ساڵی ١٩٥٩ز لە گوندی (سماقۆك) نزیك (ئاكرێ) بووە مەلا، لەوێ چەند ساڵان مەلا بوو دەرسی دەداوە، دوایی باری کرد هاتە (خەزنە)ی شەمامك، لەوێش باری کرد چووە (پەلاسان)ی ناوسورچیان، لەوێ تا ساڵی ١٩٦٧ز شەرحی عبدالرحمانی جەلی لەسەر (رسالە الحساب) و نامەی (معرفة الزوال)ی نووسیەوە، هەروەها ساڵی ١٩٦٨ز هۆنراوەی جەنگی بەهنەسای نووسیەوە، لەوێ باری کرد چووە (قەرەموکیان)، ماوەك لەوێ کاروباری مەلایەتی ئەنجام دەدا، دەرسی فەقێیانی دەدا، هەر لەوێ شەرحی ئیستیعارە و وەضعی شێخ مەموندی و شەرحی مەلا خەلیلی (موخلیص) لەسەر تەصریفی مەلا عەلی نووسیەوە، پاشان باری کرد بۆ (هەولێر) کرا پێش نوێژ، لە مزگەوتی شێخ مەلا ڕەشید، لە گەڕەکی (مستەوفی)، پاشان چووە مزگەوتی شەهید نەجمەدین لە گەڕەکی مەلایان، ئێستا لەوێ خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆزە، دەرسی فەقێیانی هەیە، ئەندامە لە لیژنەی باڵای فەتوا، خوای گەورە تەمەن درێژی بکا بۆ سوودی ئیسلام، مەلا یاسینی کوڕی، لە هەمان مزگەوت پێش نوێژە، یوسف و خەلیل و عبدالرزاق و زیادیشی هەنە.

سەرچاوەکان:

١. الإكليل في محاسن أربيل ٣٠٩.

٢. گۆڤاری هەولێر ١٥٥ – ١٥٦.

## عبدالقادر شێخەلماڕینی (٨٨٠)

مامۆستا عبدالقادر، لە مەلایە چاکەکانی گوندی (شێخەلماڕین)ە، سەر بە قەزای (چوارتا) لە شاری (سلێمانی)، دەرسی دەداوە، پاشان چووە (بەغدا) لەوێ بووە مەلای مزگەوتی (سولەیمانیە)، کچی خۆی دا محەمەد سەعید ئەفەندی زەهاوی، لەو کچە کوڕێکی بوو ناوی نا (ئەمجەد)، ئەوە ئەمجەد ئەفەندی زەهاویە موفتی (بەغدا)، مامۆستا عبدالقادر ساڵی ١٣٠٧ ك – ١٨٨٩ز کۆچی دوایی کرد، لە تەك گۆڕی محەمەد فەیزی زەهاوی بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٠٥ –٣٠٦.

## عبدالقادر عبدالرحمان کانیکەوەیی (٨٨١)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی شێخ عبدالرحمانی کوڕی سەید یوسفی کوڕی موسای کوڕی ئەحمەدی کوڕی مەلا مرادی کوڕی سەیفەدینی کوڕی حوسێنی کوڕی عەلی کوڕی ڕۆستەمی کوڕی شەهابەدینی کوڕی زوبەیری کوڕی جامی کوڕی مەحمودی کوڕی حەسەنە، ناسراوە بە ئەبوبەکری (مصنف) لە سەیدەکانی پیرخدری چۆڕییە دەورووبەری ساڵی ١٢٨٠ك – ١٨٦٣ز لە گوندی کانی کەوە، ناحیەی (بازیان)، چاوی خۆی هەڵێناوە لە دنیا.

خوێندنی: دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە (سلێمانی) لەوێ تەریقەتی (قادری) لە کاك ئەحمەدی شێخ وەرگرت، چووە (پێنجوێن) لای مەلا عبدالرحمان، سەفەری (تەوێڵە)ی کرد، لەوێ تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ محەممەد بهائەدین وەرگرت، چووە لای مەلا ئەحمەدی نۆدشەیی دەستی کرد بە بورهانی گەلەنبەوی، ماوە لەوێ تا ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: لە لای ئەمینی سادات کرا (مدرس) لە (کوچك چەرمۆ)ی سەر بە (سنە)، ساڵی ١٣٠٣ك – ١٨٨٥ز شێخ عومەری (بیارە)، مەلا عبداللە ی پەسوێ و مەلا عومەری سەردەشتی بە دوادا ناردن بێتە بیارە، ئەویش پاش پرسی مەلا ئەحمەدی نۆدشەی مامۆستای وە دوای ئیستیخارەی هەردووکیان هاتە بیارە، شێخ فاطیمە خانی کچی خۆی پیدا، مامۆستا دووبارە لە سەر دەستی شێخ تەریقەتی نوێ کردەوە، خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆز بوو، بە ویرد و زیکر و تەسبیحات و دەست نوێژ و شەونوێژ و دەرسدانەوەی فەقێیان، تا لە بەرواری ١٨ی مانگی شەووالی ساڵی ١٣٣٨ك – ١٩٢٠ز کۆچی دوایی کرد، لە پێش مەرقەدی شێخ عومەر بە خاك سپێردرا.

کوڕەکانی: مەلا حەسەن (قازی شاهۆی شاعیر) و حوسێن و عبدالخالق.

بەشێك لە فەقێیەکانی: شێخ قاسم قەیسی موفتی بەغدا، مەلا عبدالفتاحی خەتێ، مەلا ناصیح کەرکوکی، مەلا عبداللە عوبێدی، مەلا محەممەد سەعید عوبێدی، مەلا

عبدالرحیم چورستانی، مەلا عبدالقادر مەلا موئمین، شێخ مصطەفا موفتی هەلەبجەیی، مەلا عبدالقادر صۆفی، شێخ بابارەسول مەلا عبدالرحیمی هۆشاری، مەلا محەممەد جەوانرۆیی، مەلا عبدالعزیز پرێسی، مەلا عبداللە عەبابەیلیێ، مەلا زەین العابدین نۆدشەیی، مەلا ئیسحاقی هەجیجی، مەلا عبداللە پەسوێ، مەلا عومەری سەردەشتی، مەلا عبدالعزیزی ڕوخزایی، مەلا مصطەفای خورماڵی، مەلا صەلاحەدینی پاوەیی، مەلا عبداللە کانی سانانی، مەلا حەمەسەعیدی عەبابەیلیێ، مەلا عەلی مەریوانی، مەلا سەعیدی سەقزی، لەگەڵ زۆرانی تر ناویان نەزاندراون، دەنا مامۆستایەکی ئەوها بەدرێژایی تەمەنی دەرس بدا، ژمارەی فەقێیانی بە ئاسان نانووسرێ.

سەرچاوەکان:

١. یادی مەردان ٢/٥١٧ – ٥٢١.

٢. بنەماڵەی زانیاران ٥٠٧ – ٥١٠.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٠٨ – ٣١١.

## عبدالقادر عبدالرحمان هەولێری (٨٨٢)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی عبدالرحمانە، خەڵکی هەولێرە، یەکە لە زانایە مەزنەکانی سەردەمی خۆی، ساڵی ١٢٠٤ك – ١٨٧٩ز لە مزگەوتی حاجی زەکەریا لە (موصل) دەرسی دەداوە، بە تایبەت دەرسی شەریعەت، پاشان لە قوتابخانەی سولەیمان پاشا و محەممەد پاشا کرا (مدرس) لە جێگای مەلا جەرجیس ئەفەندی هەولێری.

مامۆستا شاعیرەکی چاك بووە، بۆ نمونە بە عەرەبی، دەڵێ:

| | |
|---|---|
| مالي معين عليه غير مدخري | بحر الهداية مأمولي ومندوب |
| محمد المصطفى فخر الوجود ومن | يهدي الضليل وينجي كل محسوب |
| مقيل كل ضعيف عند زلته | نعم المغيث لمرتاع ومرعوب |

سەرچاوە: غاية المرام ٨٠ ، ٣٥٤ ، ٣٥٥ ، ٣٧٥.

## عبدالقادر عبدالله ڕوهاوی (٨٨٣)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی عبدالله یە، لە مانگی جیمادی دووەمی ساڵی ٥٣٦ك – ١١٤٢ز لە شاری (ڕوها) هاتووتەدنیا، ساڵی ٥٣٩ك سولتان زەنگی (ڕوهای) داگیر کرد، عبدالقادر کرا (بەندە)، دەستی کرد بە خوێندنی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ)، ئەمجا ئازادیان کرد، کتێبی (الجامع الصغیر)[1]ی لە مەزهەبی ئیمامی ئەحمەد خوێند.

سەرەتای سەفەرەکانی: مامۆستا گەڕیدە بوو، لە زۆر جێگایانی خوێندووە و لە زۆر شوێنان گەڕاوە، لەوانە: (بەغدا) لای شوهدەی نووسەری خوێند، (هەمەدان)، (ئەصفەهان)، (نیسابور)، (مەروو)، (سەجستان)، (هەرات)، (دیمشق)، (میصر)، (ئەسکەندەریە)، (واسیط)، (موصل)، (حەڕان)، (بوشەنج)، (زەنجان)، (توستەر)، (بەصرە)، لەو هەموو شوێنانە بەپێیان بوو، ئازوقە و خواردنیشی لەسەر هاوڕێیەکانی بوو.

بەرهەمەکانی: مامۆستا زاتەکی بە دین و ڕاستگۆ و بڕوا پێکراو بوو، دوور لە دنیا و ڕوو لە خوا بوو، لە (موصل) سەرۆکی (دارالحدیث) بوو لەوێ دەرسی دەداوە، هەروەها ماوەك لە (بەغدا) و ماوەك لە (هەولێر) دەرسی دەدا، کتێبانی:(المادح و الممدوح) و (الأربعون البلدانیة)ی داناون.

کۆچی دوایی: لە ڕۆژی شەمەی ٢ دووی مانگی جیمادی یەکەمی ساڵی ٦١٢ك – ١٢١٥ز لە شاری (حەڕان) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الذیل علی طبقات الحنابلة ٤/٨٢ – ٨٦.
٢. معجم المؤلفین ٥/٢٩٢.

[1] (الجامع الصغیر في فروع الحنابلة)، دانراوی: قازی محەممەد کوڕی حوسێن ناسراو بە: (أبو یعلی)، لە ساڵی (٤٥٨) کۆچی دوایی کردووە. (کشف الظنون): (١/٥٦٤).

٣. شذرات الذهب ٥/٥٠.
٤. البداية والنهاية ١٣/٧١.
٥. هدية العارفين ١/٥٩٦.
٦. معجم أعلام الكورد ٤٢٢.

## عبدالقادر عبدالله عەبدالانی (٨٨٤)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی عبداللەی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی مصطەفای شارەزوری یە، ساڵی ١١٤٣ك – ١٧٣٠ز لە (عەبدالان) هاتووتەدنیا، مەزهەبی شافیعی بووە، تەریقەتی قادری بووە، ئیسماعیلی باپیری زانایەکی مەزن بووە: لە ٩٠٥ك – ١٤٩٩ز هاتووتەدنیا، لە ١٠٢٠ك – ١٦١١ز کۆچی دوایی کردووە.

خوێندنی: ساڵی ١١٦٤ك – ١٧٥٠ز چووە (حەلەب)، دوایی چووە (دیمشق)، لەوێ چووە (میصر)، چووە (مەککە) و (مەدینە)ی پیرۆز، چەند ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، گەڕاوە (دیمشق)، ساڵی ١١٧٨ك – ١٧٦٤ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: نزیکەی سی دانراوی هەیە، لەوانە: شەرحی (الجامع الصحیح)ی ئیمامی ترمذي، مامۆستا جگە لە مەلایەتی شاعیرەکی چاك بوو، زیارەتی گۆڕی ئیمامی شافیعی (خوا لێی رازی بی) کرد، لە (میصر) چەند بەیتە شیعری عەرەبی پێدا هەڵگۆت، ئەوە دەقەکەیتی:

یا إمام الناس طرا ذا اجتهاد قاطع    شافعا أو شافعيا شاع بابن الشافعي
عمدة أو قدوة أو زهدة أو زبدة    نافع أو رافع أو جامع عن شارع
يالَحبرِ قعرِ بحرِ جبرِ كسرِ للانام    هل ترى فيما طرى مما جرى من ضائع؟

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/١٣٣ – ١٣٤.
٢. هدية العارفين ٥/٦٠٣.
٣. علماء ومدارس في أربيل ٨٦

٤. مشاهير الكورد ٢/٣٠ – ٣١.
٥. سلك الدرر ٣/٥٩ – ٦٠.
٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٠٣ – ٣٠٤.
٧. الأعلام ٤/١٦٥ – ١٦٦ – ١٨١.

## عبدالقادر عبدالله ناوبەرگەیی (٨٨٥)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی کاك عبدالله یە، لەگەڵ مەلایەکانی شێخ وەتمانی لە مەلا مەحمودی باپیرە گەورەیان دەگەنەوە یەك، مامۆستا عبدالقادر ساڵی ١٩٠٦ز لە گوندی (ناوبەرگە)ی باڵەکایەتی هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە لای ئەو بەڕێزانە خوێندنەکەی بردەسەر: مەلا عبدالرحمانی ناوبەرگەی، مەلا محەممەدی کۆیی، مەلا طاهیری کەرکوکی، مەلا ئەحمەدی ڕۆستێ، مەلا طاهای شەقڵاوەی، مەلا عبدالفتاحی خەتێ، لە قۆناغی کۆتایی دا چووە لای مەلا فتح اللهی هەرتەلی ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: مەلایەتی لە (شیوەلۆك) و (مەران) و (سەکران) کرد، دەرسی فەقێیانی دەداوە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبدالله عوسمان ناوەندی، مەلا طاها شێخ وەتمانی، مەلا عەلی شێخ وەتمانی، مەلا ئەحمەد ممی خەلی، مەلا مصطفا وەرتی، مەلا مەولود خۆشناو، مەلا کاك ئەحمەد وەسانی.

دوای تێکدانی گوندەکان بە دەست ڕژێمی (بەعس) و گواستنەوەی خەڵکان بە زۆری بۆ کۆمەڵگایەکان، مامۆستاش لەگەڵ خەڵکی ناوچەی باڵەکان، گواسڕاوە، بۆ کۆمەڵگای (پیرزین)ی نزیك (هەولێر)، ساڵی ١٩٨٦ز کۆچی دوایی کرد.

دوو کوڕی مەلای هەیە: مەلا طاها: مەلایە لە مزگەوتی مەنتکاوە وە مەلا عبدالفتاح: مەلایە لە مزگەوتی ڕاستی (شەربەت فرۆش).

سەرچاوە: بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندز ١١١ – ١١٥.

## عبدالقادر عبدالعزیز ئەییوبی (٨٨٦)

مەلیك عبدالقادر، کوڕی عبدالعزیزی کوڕی عیسایە، یەکە لە مەلیکە ئەییوبی یەکان، ساڵی ٦٤٢ك – ١٢٤٤ز لە (کەرك)ی ئۆردون هاتووتەدنیا، بۆ خوێندن چووە (دیمشق) لای زانایەکان فێرە شەریعەت بووە، لەسەر مەزهەبی حەنەفی، دوایی ئیجازەی وەرگرت و دەرسی داوە.

مەلیك عبدالقادر هاتوچۆی (میصر)ی دەکرد، زۆر ڕێزی لە زانایان دەنا، بەتایبەت فەرموودەناسەکان، زاتەکی دیمەن جوان و ڕووخۆش بوو، ساڵی ٧٣٧ك – ١٣٣٦ز لە (ڕەملە)ی فەلەستین کۆچی دوایی کرد، لە (قودس)ی پیرۆز بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٤/١٨٧.

٢. شذرات الذهب ٦/١١٥.

٣. معجم أعلام الكورد ٤٣٦.

## عبدالقادر عبدالقاهر حەڕانی (٨٨٧)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی عبدالقاهیری کوڕی عبدالمنعمی، کوڕی محەممەدی کوڕی حەمەدی کوڕی سەلامەی کوڕی ئەبو فەهمی حەڕانی یە، لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ٥٦٤ك – ١١٦٩ز هاتووتەدنیا، زانایەکی هێمن و بە دین و بێ قسە بووە، موفتی بووە لە مەزهەبی ئیمامی ئەحمەد، لە مانگی مەولودی ساڵی ٦٣٤ك – ١٢٣٦ز کۆچی دوایی کردووە، نامیلکەی حەجی هەیە، وە (المذهب المنضد في مذهب الإمام أحمد)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٥/٢٩٠.

٢. شذرات الذهب ٥/١٦٧.

٣. هدية العارفين ١/٥٩٦.

٤. معجم أعلام الكورد ٤٣٤.
٥. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/٢٠٢ – ٢٠٤.

## عبدالقادر محەممەد دایەخەجێ (٨٨٨)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی محەممەدی کوڕی عبداللەی کوڕی ئەحمەدی دایە خەجێ یە، خەڵکی شاری (کۆیە)، برای مەلا ئەبوبەکر و مەلا مصطەفایە، زانایەکی بە توانا بووە، تەفسیری قورئانی پیرۆزی کردووە لە دوو بەرگ، مامۆستا عبداللە فەرهادی دەڵێ: {ئەو تەفسیرەم لە ناو کتێبەکانی مەلا محەممەدی عەبدالانی دیت، حەزم کرد چاپی بکەم بۆم نەسوڕا}، مامۆستا عبدالقادر، ساڵی ١١٩٧ك – ١٧٨٣ز کۆمەڵە کتێبی نووسیتەوە.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/٢١٤.
٢. الإكليل في محاسن أربيل ٢٩٣ – ٢٩٤.

## عبدالقادر محەممەد سەعید موهاجیر (٨٨٩)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی شێخ محەممەد سەعیدی کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ مەحمودی کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی شێخ مصطەفای تەختی کوڕی شێخ شەمسەدینی کوڕی شێخ عبدالغفاری کوڕی گۆشایشی کوڕی شێخ محەممەدی مەردۆخی یە، ساڵی ١٢١١ك – ١٧٩٦ز لە شاری (سنە) هاتووتەدنیا.

دەستی کرد بە خوێندن، لە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا کۆتایی پێ هێنا، لەو کاتە باوکی کۆچی دوایی کرد، کە دەکاتە ساڵی ١٢٣٦ك – ١٨٢٠ز، ئەویش لە جێی باوکی دانیشت، ساڵی ١٢٧٢ك – ١٨٥٥ز ئاژاوە لە ناوچەکە پەیدابوو، مامۆستا ئێرانی بەجێ هێشت بەرەو کوردستانی عێراق، هاتە شاری (سلێمانی) دابەزی، خەڵکەکە زۆر رێزیان گرت، کرا مەلا لە مزگەوتی عەلی نیزامی خۆی و شێخ نەسیمی برای، لەگەڵ هەر چوار کوڕەکانی خۆی: شێخ محەممەد سەعید و شێخ عبدالکریم و شێخ مەحمود و شێخ ئەحمەد، وە هەروەها مامۆستا کوڕی تری هەبوو ناو محەممەدئەمین ساڵی ١٢٨٥ك (تقریب

المرام)ی باوکی نووسیەوە، دەستیان کرد بە دەرسدانەوە و ئامۆژگاری خەڵکان، تا ساڵی ١٣٠٤ك – ١٨٨٦ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی گردی سەیوان بەرانبەر مزگەوتەکەی خۆی بە خاك سپێردرا، شێخ عبدالکریمی کوڕی لە شوێنی دانیشت، کوڕەکانی دی گەڕانەوە (ئێران).

دانراوەکانی:

١. تقریب المرام، شرح تهذیب الکلام: ئەو کتێبە مەلایان و فەقێیان زۆر بایەخیان پێداوە، یەکە لە کتێبانی خوێندنی قۆناغی کۆتایی، مەلا چاکەکان خۆیان پێوە ماندوو کردووە حاشیەیان لەسەر نووسیوە، وەك: شێخ عومەری قەرەداغی، مەلا عبدالرحمانی پێنجوێنی، مەلا مەحمودی مەزناوی، نوسخەکی دەستخەتی باوکمان لە لایە، لەگەڵ چەند پەراوێز ساڵی ١٣٤٩ك – ١٩٣٠ز نووسیتیەوە، هەروەها نوسخەکی کۆپی مامۆستا عبدالکریمی بیارەمان لە لایە، چەند حاشیەی قەرەداغی لەسەرە، ساڵی ١٣٤٠ك – ١٩٢١ز لە (ئێران) نووسیتیەوە، ئەو کتێبە بوو کە مامۆستا هاتە شاری سلێمانی (میر) دانەیەکی بە دیاری بۆ (شا عبدالمجید) ناردە ئەستەمبۆڵ، ئەویش وەری گرت داوای دوعای کرد، مووچەی بۆ مامۆستا بڕیەوە.

٢. الشرح الجدید: ئەوەش شەرحی (تهذیب الکلام)ە، ساڵی ١٢٩٣ك – ١٨٧٦ز تەواوی کردووە.

٣. أجد (ئەجەد)، نوێتر و تازە: ئەوەش شەرحی (تهذیب الکلام)ە، بەڵام ئەو دووانە وەکو یەکەمەکە زۆر نینە کەم چەنگ دەکەون.

٤. رسالة اثبات الواجب: سەرەتای بە: (الحمد لمن لا مؤثر في الوجود الا هو) دەست پێ دەکا.

٥. رفع الحاجب في شرح رسالة إثبات الواجب للدواني.

٦. رسالة في الإمامة.

٧. رسالة في العقل.

٨. رسالة في الزمان والمكان.

٩ الشرح العجيب على الدواني.

١٠ حاشية على عقائد الدواني.

١١ حاشية على اللاري في الحكمة، سەرەتایەکەی بە (الحمد لله الخالق) دەست پێ دەکات، ساڵی ١٢٨٦ك – ١٨٦٩ز دایناوە.

١٢ كشف الغطا.

١٣ شرح رسالة العلم للسيلكوتي: سەرەتایەکەی (الحمدلله الذى دل....)یە.

١٤ أنموذج العقائد: سەرەتایەکەی (نحمده على ماهدانا)یە.

١٥ رسالة في الكلام: سەرەتایەکەی (بسم الله خير الاسماء)ە.

١٦ مبحث الكلام: کۆتایی یەکەی (فاحفظ هذا فأنه مما لاتجده لغيرنا)یە.

١٧ ابطال اللاتناهي: سەرەتایەکەی (الحمدلله على حلمه)یە.

١٨ المبدأ والمعاد: سەرەتایەکەی (بعد حمده على ماهدانا)یە.

١٩ رسالة في الرؤية: سەرەتایەکەی (قال صاحب المواقف) دەست پێ دەکات.

٢٠ ثلاث حواش في (ان الله ليس بزماني ولا مكاني).

٢١ شرح الحوراء والزوراء: سەرەتایەکەی (كيف أحمده والحمد بذاته لذاته) یە.

٢٢ إجابة عن أسئلة: سەرەتایەکەی (الحمد لله والصلاة) دەست پێ دەکات.

٢٣ رسالة في الحدوث: سەرەتایەکەی (بعد الحمد لله) دەست پێ دەکا.

٢٤ رسالة في الوجود: کۆتایی یەکەی (وما ذكر تقرير بديع لا تسمعه عن غيري فيما أظنه، فاغتنمه).

سەرچاوەکان:

١ إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ١٨٩ – ١٩٠

٢ هدية العارفين ٦٠٥/٥.

٣ إيضاح المكنون ٣/ ٣١٤.

٤. معجم المؤلفين ٥/٢٩٩.
٥. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٥/٢٦٨ /٦/٣٣٢ – ٣٣٦.
٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٠٦ – ٣٠٨.
٧. بنەماڵەی زانیاران ١٤١ – ١٤٥.
٨. الأعلام ٤/١٦٩.
٩. تأريخ السليمانية ٢٧٢.
١٠. معجم أعلام الكورد ٤٣٣.
١١. چەند کتێبی دەستنووس، دانراوی مامۆستا.

## عبدالقادر محەممەد سکتانی (٨٩٠)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالقادرە، ساڵی ١٩٢٧ز لە گوندی (سکتان) هاتووتەدنیا، لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە لای مەلا ئەحمەدی پلکزای، دوایی چووە لای مەلا عبدالرحمانی شرێشمەیی، دوایی چووە لای مەلا صادیقی (شەقلاوەیی)، دوایی چووە (ڕواندز) ماوەکی زۆر لە لای مەلا عبدالکریم ئەفەندی ماوە، دوایی چووە (ڕۆستێ) لای مەلا ئەحمەد، دوایی چووە (بیارە) لای مامۆستا عبدالکریم (مدرس)، گەڕاوە (ڕواندز) وازی لە خوێندن هینا، بووە مەلای (دەرگەلە)، دووبارە گەڕاوەو (بیارە) دەستی بە خوێندن کردەوە ماوە لەوێ تا ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (دەرگەلە) ماوەك لەوێ مەلا بوو، فەقێی هەبوون، دوایی باری کرد بۆ (ناوەندە)، ساڵی ١٩٦١ز سەرۆك مەلا مصطەفا بارزانی کردییە مەلای (گەلالە) و بەڕێوەبەری پەیمانگای ئیسلامی و ئەندامی لیژنەی فەتوا، ساڵی ١٩٧٠ز کرا سەرۆکی لیژنەی قازییەکانی (شۆڕش)، ساڵی ١٩٧٥ز دوای تێکچوونی (شۆڕش) دوورخراوە بۆ (المسیب) پارێزگای (حلە)، چوار ساڵان لەوێ ماوە، ماوەك هاتە (بەغدا)، گەڕاوە قەزای (صەدیق) پاشان هاتە (هەولێر)، کرا پێش نوێژ و وتارخوێن لە مزگەوتی شێخ عبداللهی ناوبازاڕ و ئەندامی لیژنەی فەتوا لە یەکیەتی زانایانی کوردستان.

سەرچاوە: دەستووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

### عبدالقادر محەممەد سلێمانی (٨٩١)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی محەممەدە، خەڵکی شاری (سلێمانی)یە، دەستی کرد بە خوێندن، لە چەند شوێنان لە حوجرەکان گەڕا، تا خوێندنەکەی بردەسەر، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی کاروباری ئاینی، دەرس پێدانی فەقێیان، زۆربەی کاتی خۆی لە نووسین خەرج دەکرد.

دانراوەکانی:

١. حاشیة علی شرح العضدیة.

٢. حاشیة علی نهایة الوسع شرح الوضع: لابي بکر المیرڕۆستەمی.

٣. حاشیة علی خلاصة الوضع لابي بکر المیرڕۆستەمی.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٠٤ك - ١٨٨٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: إسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الاسلامیه ١١٤ - ١١٥.

### عبدالقادر محەممەد صوفی (٨٩٢)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی محەممەدی کوڕی سەفەری کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەدە، خەڵکی گوندی (ژاڵەوە)ی نزیك زێی (سیروان)ە، ساڵی ١٢٩٠ك - ١٨٧٣ز هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، دوای قۆناغی سوختەیی و موستەعیدی چووە (بیارە)، ماوە لەوێ تا ئیجازەی لە مەلا عبدالقادری گەورە وەرگرت، ساڵی ١٣٣٣ك - ١٩١٤ز لەسەر فەرمانی شێخ عەلائەدین کرا مەلای (کانی کەوە)، ماوەك لەوێ مەلا بوو دەرسی دەداوە، ساڵی ١٣٣٩ك - ١٩٢٠ز باری کرد بۆ گوندی (فەقێ جنە) لای حوسێن بەگی جافان، دەوری بیست ساڵان لەوێ ماوە، ساڵی ١٣٦٣ك چووە (بانی خێلان)، ساڵی ١٣٧٢ك - ١٩٥٢ز کۆچی دوایی کرد، مامۆستا ناودەبردرا بە (صۆفی) چونکە باوکی سۆفی و ئەهلی تەریقەتی نەقشبەندی بوو، هەروەها خۆی پەیوەندی لەگەڵ شێخ عومەر و شێخ نەجمەدین و شێخ عەلائەدینی (بیارە) بەهێز بوو.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣١٣ – ٣١٥.

٢. یادی مەردان ٢/٦٣٠ – ٦٣٢.

### عبدالقادر محەممەد عەلی ئاغا سێوەرکی (٨٩٣)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی محەممەد عەلی ئاغایە، لە دەوری ساڵی ١٢٦٥ك – ١٨٤٨ز لە قەزای (سێوەرك)ی نزیك دیاربەکر هاتووتەدنیا، زانایەکی شارەزا و زمان ڕەوان بووە، عەرەبی و تورکی و فارسی زانیوە، زانیاری لە زانستەکانی ئەقڵی و فەرموودە بەهێز بووە، خۆی لە فەرمانبەری و کاربەدەستان دوورخستیتەوە، موفتیایەتی درایێ وەری نەگرتووە، پەنجا ساڵ لە قوتابخانەی (فەیزییە)ی سیوەرك لە ڕاهی خودا دەرسی داوە، لە دووررِا فەقێیان دەهاتنە لای بۆ خوێندن، مەزهەبی حەنەفی بوو، تەریقەتی قادری بوو، پاشان بووە نەقشبەندی، ژیانی سۆفیاتی بۆ خۆی هەڵبژارد، دلپاك و چاکەخواز بوو، خەڵکان خۆشیان دەویست، دوایی لە قەزای (چرمووك) کرا (مدرس)، ساڵی ١٣٤١ك – ١٩٢٢ز کۆچی دوایی کرد، محەممەد عەلی عەونی کوڕی ئەو زاتەیە، تەرجومەی (خلاصة تأريخ الكرد وكردستان)ی محەممەدئەمین زەکی کردووە، لە عەرەبی وە لای کوردی.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٢٨٠ – ٢٨١.

٢. معجم أعلام الكورد ٤٣١.

### عبدالقادر موئمین جاف (٨٩٤)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی مەلا موئمینە، باوکی مامۆستای مەحمود پاشا و عوسمان پاشای جاف بووە، دەوری ساڵی ١٢٩٠ك – ١٨٧٣ز هاتووتەدنیا، ساڵی ١٨٨٠ز لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، لە قۆناغی موستەعیدی چووە لای مەلا عبدالرحمانی پێنجوێنی لەوێ ساڵی ١٣١٣ك – ١٨٩٥ز کتێبی (تهذيب الكلام)ی نووسییەوە و خوێندی، پاشان چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادری گەورە، ماوە تا

ئیجازەی وەرگرت، تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عومەری بیارە وەرگرت، دوای ئەو بووە مریدی شێخ نەجمەدینی کوڕی، ئەمجا بووە مەلا لە (چرچە قەلا) لای شێخ حوسێن، دوایی چووە (پریس)، ساڵی ١٣٢٠ك - ١٩٠٢ز لەسەر فەرمانی مەحود پاشا و لەسەر فەرموودەی شێخ نەجمەدین چووە (قزرابات - سەعدییە) ماوە لەوێ تا ساڵی ١٣٢٦ك - ١٩٠٨ز كۆچی دوایی كرد.

مامۆستا شاعیرەكی چاك بووە، شیعری كوردی و فارسی هەیە، دەڵێن: مەحمود پاشا گۆڕەكی بۆ خۆی لێدابوو، قورئان خوێنی گرتبوو، هەموو ڕۆژ لەسەریان دەخوێند، كە مامۆستا كۆچی دوایی كرد پاشا لە كوێستان بوو، مامۆستا لەبەر ئەوەی ڕێزی تایبەتی لە لای پاشا هەبوو، خەڵكەكە وایان زانی پاشا ڕازییە، مامۆستایان لە ناو گۆڕەكەی پاشا نا، كە هاتەوە پاشا ڕازی نەبوو، فەرمانی دا: مەلایان لە ناو گۆڕەكە دەرهینا، شێخ عارف (قزرابات) دەڵێ: {دوای شەش مانگ مامۆستامان لە گۆڕەكە دەرهینا، تەشامان كرد، هیچ نەگۆڕابوو، تێك نەچووبوو} بەو ڕووداوە بڕوایان بە مامۆستا پتر هات.

سەرچاوەكان:

١ علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣١١ - ٣١٣.

٢ یادی مەردان ٢/٥٢٦ - ٥٣١.

## عبدالقادر محیەدین هەولێری (٨٩٥)

ناوی عبدالقادرە، كوڕی شێخ محیەدینی هەولێری یە، تەریقەتی قادری بووە، لای شێخ عبدالرحمانی طالەبانی خوێندووە، لە شاری (ئۆرفە) دابەزیوە، دەوری پازدە دانراوی خۆی هەیە، ساڵی ١٣١٥ك - ١٨٩٧ز كۆچی دوایی كردووە.

سەرچاوەكان:

١ إیضاح المكنون ١/١٢٣

٢ معجم أعلام الكورد ٤٣٣ - ٤٣٤.

٣. نثر الجواهر والدرر ١/٧٩٤

٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٠٥.

٥. معجم المؤلفين ٥/٣٠٤.

٦. هدية العارفين ٥/٦٠٥.

٧. مشاهير الكورد ٢/٣٢.

## عبدالقادر مەولود سێگردکانی ( ٨٩٦ )

ناوی عبدالقادرە، کوڕی مەولودی کوڕی عبدالله یە، ساڵی ١٨٩٥ز لە گوندی (سێگردکان) هاتووتەدنیا، قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکانی خوێند، دوایی چووە (کۆیە) لای مەلا بەهائەدین، ماوەك چووە (سلێمانی) فەلەکیات و حیسابی خوێند، هاتە (هەولێر) لای مەلا نیعمەت زادە، چووە (ئۆمەرگومبەت) لای مەلا ئەحمەد، چووە (بەحرکە) لای مەلا عوسمانی شەوەکی، کۆتایی بە خوێندن هینا، بووە مەلا لە (پردێ)، ماوەك چووە (دووبز)، ماوەك مەلا بوو لە گوندی (عەلەغێر)، دوایی چووە (گۆپتەپە)، گەڕاوە (سێگردکان)، لەوێ ساڵی ١٩٧١ز کۆچی دوایی کرد، مەلا عبدالله ی کوڕی جێگری بوو، عبدالمجیدی کوڕی لە وەزارەتی پەروەردە مامۆستای زمانی عەرەبی بوو، پاشان بووە سەرپەرشتیای پەروەردەیی.

خووڕەوشتی: مامۆستا عبدالقادر ناسرابوو بە (مەلا قادری ڕەش)، زاتەکی بەڕێز بوو، قسەخۆش بوو، نوکتەزان بوو، دەورێکی سەرەکی هەبوو بۆ سوڵح و ڕێکخستنی خەڵکان، هێمن و لەسەرخۆ بوو، بە ئەمەك و وەفادار بوو.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عبدالقادر نوری بەرزنجی ( ٨٩٧ )

مامۆستا عبدالقادر نوری بەرزنجی، مەلای چاك و برنجی، یەك بووە لە پیاوە ماقوڵانی سەردەمی خۆی، چەند دانراوی هەیە: لەوانە (مقتطفات أدبية لطلبة الأعدادية) یان (حسن الترتيب والإنتخاب للطلاب الأنجاب)، ساڵی ١٣٢٣ك - ١٩٠٥ز چاپ کرا.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٥/٣٠٨.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٠٥.

### عبدالقادر یوسف کوردی (٨٩٨)

ناوی عبدالقادرە، کوڕی یوسفی کوڕی یەعقوبی کوڕی شەرەف کوڕی حوسانی کوڕی محەممەدی کوڕی حەجی کوڕی محەممەدی کوڕی عومەری کوردییە، مەزهەبی شافیعی بووە، لە شاری (حەلەب) دابەزیوە، لە منداڵی باوکی کۆچی دوایی کرد، ماوەك خەریکی ئیش و کاسبی بوو، بە گەورەیی دەستی بە خوێندن کرد، لە لای مەلا عوسمانی کوردی شەریعەتی خوێندن، لای شێخ عەلی حەسەن سیوفی کۆتایی پێ هینا، دەستی کرد بە دەرسدان و فەتوادان، سەفەری حەج و قاهیرەی کرد، چەند دەرسی لە لای کەمالی ئەبو شەریف خوێند، لە مانگی سەفەری ساڵی ٨٩٦ك – ١٤٩٠ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی پیاوچاکەکان بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ٤/٢٦٤.

٢. معجم أعلام الكورد ٤٣٤.

٣. مشاهير الكورد ٢٧٩.

### عبدالقاهر حەسەن شارمزوری (٨٩٩)

ناوی عبدالقاهیرە، کوڕی حەسەنی کوڕی عەلی کوڕی قاسمی شارەزورییە، مەزهەبی شافیعی بووە، لە شەریعەت و نەحو شارەزابووە، لە (موصل) دەرسی داوە و واعیز بووە، دانراوی خۆی زۆرن، ساڵی ٥٣٧ك – ١١٤٢ز لە (موصل) هاتووتەدنیا، ساڵی ٥٧١ك – ١١٧٥ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣١٦.

٢. معجم المؤلفين ٥/٣٠٩.

٣. هدية العارفين ٥/٦٠٧.

٤. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ٢/ ١٠٩.

## عبدالقاهر عبدالغني بن تەيمييە (٩٠٠)

ناوی عبدالقاهیرە، کوڕی عبدالغنی کوڕی ئەبو محەممەدی کوڕی ئەبو قاسمی کوڕی تەیمییەیە، ساڵی ٦١٢ك – ١٢١٥ز لە (حەڕان) هاتووتەدنیا، مەزهەبی حەنبەلی بووە دەرسی لە لای باپیری خوێندووە، لە مزگەوتی گەورەی (دیمشق) ووتارخوێن بووە و دەرسی فەرموودەی داوە، لە ١١ی مانگی شەووالی ساڵی ٦٧١ ك – ١٢٧٣ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/٣٣٤.

٢. البداية والنهاية ١٣/٢٦٩.

٣. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/٢٨٢.

٤. معجم أعلام الكورد ٤٣٥.

## عبد الكريم ئەبوبەكر (مصنف) (٩٠١)

ناوی عبدالکریمە، کوڕی مامۆستا ئەبوبەکری (مصنف)ی کوڕی سەید هیدایة الله ی گۆرانی شاهۆیە، یەکە لە زانایەکانی سەردەمی خۆی، لە شەریعەت شارەزا بووە، دەرسی لە خزمەت باوکی خوێندووە، پاشان چوویتە لای مەلا ئەحمەدی کوردی موجەلی، کتێبانی (إثبات الواجب) و شەرحی (حكمة العين)ی خوێند، لەگەڵ شەرحی (مختصر المنتهى)، گەڕاوە باوکی لە ژیاندا بوو، دوایی سەفەری مەدینەی پیرۆزی کرد، ساڵی ١٠٥٠ك – ١٦٤٠ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: (إنذار الإخوان) و (ئامۆژگاری) و (تەفسیری قورئانی پیرۆز): سێ بەرگە، تا سورەتی (النحل).

سەرچاوەکان:
١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/٢٥٧ – ٢٥٨ /٧/٢٤.
٢. هدية العارفين ٥/٦١٢.
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ١٣٣ – ٣١٨ – ٣١٩.
٤. مشاهير الكورد ٢/٣٣ – ٣٤.
٥. معجم المؤلفين ٥/٣١٤ – ٣١٥.
٦. إيضاح المكنون ١/٣٠٨.
٧. بنەماڵەی زانیاران ٥٠١.
٨. خلاصة الأثر ٢/٤٧٤.
٩. معجم أعلام الكورد ٤٤٠ – ٤٤١.

## عبدالكریم ئەحمەد ئۆمەراوە (٩٠٢)

ناوی عبدالكریمە، كوڕی سەید ئەحمەدی كوڕی سەید ئیسماعیلی كوڕی سەید مصطەفای كوڕی سەید عبدالله یە، ساڵی ١٨٩٦ز لە گوندی (گردەشینە) هاتووتەدنیا، لەو گوندە دەستی كرد بە خوێند، لە چەند شوێنان قۆناغی سوختەیی تەواو كرد، وە ماوەك لە لای مەلا شێخ طاهای بالیسانی و ماوەك لە لای مەلا عبدالفتاحی خەتێ و ماوەك لە لای جەنابی مەلا محەممەدی جەلی زادەی خوێند، خۆی دەڵێ: {مەلا مەحمودی مەزناوی لە (كەركوك) چووە (موصل)، لە هاتنەوە لە (گردەشینە)ی لادا، لە تەكیەی مامم شێخ لەتیف دابەزی، منیش بە فرسەتم زانی، – بۆ تەبەرروك – تاكە دەرسەكم لە خزمەت خوێند}، گەڕاوە (كەركوك)، هەروەها ماوەك چووە (هەرەجە) لای مەلا مەحمود، دوا سوڕانی هاتە هەولێر مزگەوتی قەڵات لای مەلا ئەبوبەكری ئەفەندی، ماوە تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

خووڕەوشتی: زاتەكی ڕووخۆش و مەجلیس ئاوەدان و قەسەخۆش بوو، سەخی بوو، لەناو خەڵكان بەڕێز و حورمەت بوو، بایەخی زیاد بە دەست نوێژ و نیەتی نوێژ دەكرد، جار وابوو خۆی لە پێش نوێژی لادەدا، نەوەك بێزاری لێ بكەن.

مەلایەتی: ماوەكی زۆر لە (ئۆمەراوە) مەلا بوو، فەقێی هەبوون، ساڵی ١٩٦٢ز باری كرد هاتە (هەولێر) لە مزگەوتی گەورەی ئازادی بووە وتارخوێن و پێش نوێژ، كتێبخانەكی دەوڵەمەندی هەبوو، خەڵكان دەچوونە لای بۆ فەتوا و دوعا، لە بەرواری ٦/٣/١٩٨٦ز كۆچی دوایی كرد.

كوڕەكانی: سێ كوڕی لە پاش بەجێمان:

١. مەلا شێخ محەممەد: لە ١٩٣٥ز هاتووتەدنیا، خوێندنی تەواوكرد، ماوەك مەلا بوو لە (ئۆمەراوە)، پاش كۆچی دوایی باوكی لە شوێنی ئەو (واتە: مزگەوتی ئازادی)، بووە وتارخوێن و و پێش نوێژ.

٢. شێخ عبدالرحمان: لە ١٩٤٥ز هاتووتەدنیا، دوای دەرچوونی لە كۆلێژی ئیمامی ئەعزەم لە بەغدا، كرا وتارخوێن و پێش نوێژ لە مزگەوتی (ئازادی)، پاشان لە بەر ئەوەی گەنجان زۆر هاتوچۆیان دەكرد وخەڵك لە ووتاری هەینی زۆر ئامادە دەبوون رژێمی لەناوچووی بەعس گەفی لێ كرد وترساندی، بۆیە رووی لە دەرەوەی وولات كرد، چەند ساڵان لە دەرەوە بوو، پاش لەناوچوونی بەعس دووبارە گەڕاوە بۆ كوردستان، ئێستا وتارخوێن و پێش نوێژە، لە مزگەوتی عوزێری لە (هەولێر).

٣. شێخ عبدالله: ١٩٤٧ز هاتووتەدنیا، پەیمانگای ئیسلامی لە هەولێر تەواوكرد، چەند ساڵان لە دەرەوە بوو، گەڕاوە (هەولێر) تووشی ئازار و نەخۆشی كوشندە هات، لە ٢٢/٢/٢٠٠٨ز، كاتی نووسینەوەی ژیاننامەی باوكی لەم مێژووە كۆچی دوایی كرد.

سەرچاوەکان:

١. محمد بن عبدالله الجلی ١٢٨.

٢. دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عبدالکریم ئەحمەد بڕندە (٩٠٣)

ناوی عبدالکریمە، کوڕی سەید ئەحمەدی کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالرحیمە، خەڵکی گوندی (ئەحمەد بڕندە)یە، ساڵی ١٣٠٣ك – ١٨٨٥ز هاتووتەدنیا.

لە گوندی (خانەشۆر) دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (ئەحمەد بڕندە) لای شێخ مارف نێرگسەجاڕ، دوایی چووە (هەڵەبجە)، دوایی چووە (ئەبوعوبەیدە)، دوایی چووە (پرێس) لای مەلا عبدالقادری مەلا مونمین، وە هەر لەگەڵ ئەو چووە قزلبات، دوایی چووە (سلێمانی) لای شێخ باباعەلی تەکیەیی، پاشان چووە (بیارە)، ساڵی ١٣٣١ك شێخ مارفی نێرگسەجاڕ کۆچی دوایی کرد شێخ نەجمەدینی بیارە مامۆستا عبدالکریمی لە جێی ئەو دانا بە مەلا، دەستی کرد بە دەرسدانەوە و جێبەجێ کردنی کاروباری مەلایەتی، ساڵی ١٣٦١ك – ١٩٤٢ز لە گوندی (ئەحمەدبڕندە) کۆچی دوایی کرد.

مامۆستا شاعیر بوو، شیعری کوردی و فارسی هەیە، بە بۆنەی کۆچی دوایی شێخ باباعەلی، دەڵێ:

لە یەك مزگەوت و تەکیە و مەدرەسە کەس نایێ دەنگی
(قد قامت) نە یاهویێ نە بسم الله، نە سوبحانە

لە هەر قەبرێکەوە گوێ بگری هەروەك نەغمەیی داود
سەدای تەکبیری عید و خوتبەیی ئاوازی قورئانە

وەهام زانی منیش ئەو حاڵەتە ڕوئیایە دەیبینم
لە بۆ تەحسیلی بێداری خۆمم هێنایە جۆلانە

کە هۆشم هاتە بەر نەختێك و پرسیم بۆم موحەققەق بوو
ئەمە ئاساری کۆچی شێخی عەسر و فەخری کوردانە

سەرچاوە: یادی مەردان ٢/٦١٨ – ٦٢٩.

## عبدالکریم ئەحمەد خانەشوری (٩٠٤)

ناوی عبدالکریمە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەدی کوڕی سەید عبدالرحیمی خانەشورییە، لە دەوری ساڵی ١٣٠٣ك – ١٨٨٥ز هاتووتە دنیا، دەستی کرد بە خوێندن، پاش خەتمی قورئانی پیرۆز و کتێبە سەرەتاییەکان، چووە قوتابخانەی (ئەحمەد برِندە) لە شارەزور، پاشان چووە (هەڵەبجە)، دوایی چووە (ئەبوعوبەیدە)، دوایی چووە (پریس) لای مەلا عبدالقادر مەلا موئمین، دوایی چووە (قزرابات) نزیك (شارەبان)، دوایی چووە مزگەوتی مەلا ئەمین مام ڕۆستەم لە (سلێمانی)، دوایی چووە مزگەوتی باباعەلی، دوایی چووە (بیارە)، لەوێ کۆتایی بە خوێندن هینا، گەڕاوە (ئەحمەد برِندە) دەستی کرد بە مەلایەتی و دەرسدانەوە، ساڵی ١٣٦١ك – ١٩٤٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٢٤.

## عبدالکریم ئەسعەد خەیلانی (٩٠٥)

ناوی عبدالکریمە، کوڕی مەلا ئەسعەدی کوڕی مەلا عومەر ئەفەندی خەیلانی یە، ساڵی ١٩٠٠ز هاتووتەدنیا، دەستی بە خوێندن کرد، لە خزمەت باوکی خوێندنەکەی بردە سەر، هەر لە لای ئەو ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

کە باوکی ساڵی ١٩٣٠ز کۆچی دوایی کرد، لە جێی دانیشت، لە مزگەوتی گەورەی ڕواندز لە جێگەی باب و باپیری کرا وتارخوێن و پێش نوێژ و دەرس بێژ، مامۆستا زانایەکی زیرەك بوو، زمان ڕەوان بوو لە کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی، قەسەخۆش و مەجلیس ئاوەدان بوو، کتێبخانەی باب و باپیری ومەلا محەممەدی خەتی هەمووی لە لابوو، بە داخەوە ساڵی ١٩٥٧ز هۆدەکە لە ئاگری فڕنیەکی نانی کە نزیکی بوو ئاگری تێبەربوو، کتێبەکان هەموویان سووتان، مامۆستا چەند ئیجازەی دابوون.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا سەید عبداللە ی توتمەیی، مەلا محەممەدی عەلیاوەیی، مەلا طاهای شێخ وەتمانی، مەلا مەمدوحی مزوری، مەلا محەممەدئەمینی ڕواندزی، مەلا عەلی

خەتێ، مەلا کەمالی هەروتی، مەلا عبدالواحیدی بالەکی، مەلا ئەحمەدی وەرتی، مەلا عبدالله ی خەتێ، مەلا ئەحمەدی کۆیی.

ساڵی ١٩٧٤ز سوپای ڕژێمی (بەعس) هێرشەکی دڕندانەی کردە سەر ناوچەی (ڕواندز) خەڵکان ئاوارەبوون، مامۆستاش چووە (مەهاباد)، ساڵی ١٩٧٥ز گەڕاوە ڕواندز، دوایی چاوەکانی ئاڵۆز بوون، بۆ چارەسەری چووە (بەغدا) لای کوڕەکەی، ساڵی ١٩٧٦ز گەڕاوە ڕواندز، لە ٢٣/٦/١٩٧٧ز کۆچی دوایی کرد، لە تەك باب و باپیری بە خاك سپێردرا، بەبۆنەی کۆچی دوایی مامۆستا مەمدوح مزووری، دەڵێ:

| | |
|---|---|
| زانا کۆچی کرد، خەڵکیش کۆچی کرد | ئاوابوو ڕۆژی ناوچەی ولآتمان |
| وەفاتی فەرموو مامۆستای وولآت | (عبدالکریم)ی باوکی هەموومان |
| کەوتە تاریکی دەشت و دۆڵ و چیا | گەشایی ولآت باری کرد لێمان |
| بەڵێ هەرچی هات بۆ سەرزەمینە | نەقشێکی دانا و چوو دەر لە ڕێزان |

سەرچاوەکان:

١. علماء ومدارس في أربيل ٩٨.
٢. دەنگی زانا (٥٧)، ٢٠٠٢ز.
٣. بنەماڵەی بەناوبانگی ڕواندز ١٣٢ – ١٤٢.

## عبدالکریم بەرزنجی سولەیمانی (٩٠٦)

مامۆستا سەید عبدالکریم، یەکە لە زانایە بەناوبانگەکانی شاری (سولەیمانی)، یەکەم کەسە لە مزگەوتی شێخ عبدالرحمان دەرسی داوە، وە دەرسی بە چەند زانای مەزن داوە، لەوانە: مەلا ئیبراهیمی بیارە، مەلا سەید عەلی بەرزنجی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، ساڵی ١٢١٣ك – ١٧٩٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تأريخ السليمانية ٢٧١ – ٢٧٢.

## عبدالكریم رەنگرێژانی (٩٠٧)

مامۆستا عبدالكریم، لە گوندی (رەنگرێژان)ی ئێران هاتووتەدنیا، دوایی لەگەڵ مەلا شەریفی برای بۆ خوێندن هاتە (ڕواندز)، ماوەك لەوێ خوێند، پاشان لەگەڵ كاكی هاتە (هەولێر)، ماوەی دوازدە ساڵان، لە مزگەوتی قەڵات، لە خزمەت مەلا عومەر ئەفەندی ماوە، تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت بووە مەلا لە (گردعازەبان)، ساڵی ١٢٩٦ك – ١٨٧٩ز چووە (یەدیقزلەر).

دانراوەكانی:

١. هۆنراوەی فارسی، دەربارەی ڕێزمان، سەرەتایەكەی:

قال الفقیر أبو عبدالله عبدالكریم الواثق بالله

بعد أداء حق حمد وكذا تصلیة علی النبی المصطفی

٢. شەرحی هۆنراوەكەی سەرەوە.

٣. چەند كورتە حاشیە لەسەر كتێبەكانی خوێندن.

مامۆستا كوڕێكی هەبوو ناو مەلا عوسمان، بە یارمەتی خوا لە مەودوا باسی دەكەین.

سەرچاوەكان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی كورد ٦/٩٠ – ٩٧.

٢. علماء ومدارس في أربیل ٩٤.

٣. غایة الإظهار: دەستنووس.

## عبدالكریم سولەیمان كوردی (٩٠٨)

ناوی عبدالكریمە، كوڕی سلێمانی كوڕی مصطفای كوڕی حەسەن قازی كوڕی عبدالوەهابی شافیعی یە، زانایەكی گەورە و بەناوبانگ بووە، شێخەكی خواناس بووە، چەند كەراماتی لێ دەگێڕنەوە، لە وڵاتی خۆی دەرسی فەرموودەی لە لای مامی مەلا محەممەد خوێند، شەریعەتی لە لای مەلا ئەحمەدی عومەر ئابادی خوێند، تەفسیری لە لای مەلا یوسفی ئەصەم خوێند، بەشێكی بەیزاوی لە لای مەلا حوسێنی ڕەشانی خوێند،

فەرائیزی لە لای قازی (شکراللە) ی سەقزی خوێند، نەحوی لە لای مەلا عبدالصمدی موجشی خوێند، پاشان چووە (شام)، لە دیمشق دابەزی، دەستی کرد، بە دەرسدانەوە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: سەید محەمەدی نەقیب، شێخ محەمەد عیشي، شێخ ئیبراهیم فەتتال، سەید شەمسەدین حیصنی.

دەڵێن: جارەك بۆ سەیران لەگەڵ فەقێیان لەسەر گردەك دابەزی، یەك لە فەقێیەکان غوسلی لەسەر بوو، لە بیری نەمابوو، لەگەڵ ئەوان هەستاوە بۆ نوێژکردن، مامۆستا شمەکی گرت و ڕای کێشا فەرمووی: کوڕم بڕۆ خۆت بسمیل بکە ئەوجا وەرە نوێژ بکە، ئەو فەقێیەش دەیگۆت: قەت قسەم بۆ کەس نەکردبوو، کەوا قەلبم پیسە، خۆشم لەبیرم کردبوو، شتی لەو بابەتە زۆر لە مامۆستا دەگێڕنەوە.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٢٨٢ – ٢٨٣.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣١٦ – ٣١٨.

٣. خلاصة الأثر ٢/٤٧٤ – ٤٧٥.

٤. معجم أعلام الكورد ٤٤٣ – ٤٤٤.

## عبدالكريم عبدالله سيواسي (٩٠٩)

ناوی عبدالکریمە، کوڕی عبداللەیە، خەڵکی شاری (سیواس)ە لە کوردستانی تورکیا، مەزهەبی حەنەفی بووە، ناسراوە بە (واعیز) کتێبی (إلجام النفوس)ی داناوە لە ئامۆژگاری، لە ١٠٤٩ك – ١٦٣٩ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٥/٣١٨.

٢. معجم أعلام الكورد ٤٤١.

٣. كشف الظنون ١/١٤٨.

٤. هدية العارفين ١/٦١٢.

## عبدالكریم عبدالعزیز سێبیرانی (٩١٠)

ناوی عبدالکریمە، کوڕی عبدالعزیزی کوڕی خالیدە، عەشیرەتی (سالەیی)یە، لە ١/٧/١٩٠٦ز هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، ماوەك لە مزگەوتی قەلأت بوو لە (هەولێر)، ماوەك چووە لای مەلا محەممەدی کوردە، دوایی چووە (مام خاران) لای مەلا عبداللە ی بەحرکەیی (باوکم)، هەر لە خزمەت ئەو هاتە (شەوزار)، ماوەك چووە (دیبەگە) لەگەل مەلا خەلیلی موخلیص، لای مەلا ئیسماعیلی جدیدەی بوو، پاشان چووە مزگەوتی حاجی قادر لای مامۆستا محەممەدئەمینی بێتواتە و مامۆستا عبداللەی کوڕی، ماوە لەوێ تا ئیجازەی لە مامۆستا عبداللە وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە گوندی (سێبیرانی گەورە)، دەستی کرد بە دەرسدانەوە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا محەممەد مەولود بەحرکەیی، مەلا شەفیعی سەرچەمەیی، مەلا عبدالقادر مەلا سولەیمان بەحرکەیی، مەلا ئەحمەد سێبیرانی گچکە، مەلا ئەحمەد کەپەنك ڕەشی، مەلا عبدالکریم بێرکۆتی، مەلا عوسمانی گەزنەیی، مەلا عبداللە محەممەدئەمین بەحرکەیی، مەلا سەید عبداللە قەراتگەیی، مەلا ئەبوبەکری دارەبەنی، مەلا عبدالرحمانی گردجۆتیاری، مەلا عبداللەی گردەشێری، فاروقی برازای.

سەربردەیێك: کاتێ مامۆستا لە قەراتی دەخوێند، ڕۆژی نۆبەتی ڕاتبە هێنانی دادێ، دەچێتە فڕنی مەلا ئەفەندی، نیو تەشتەك بڕوشی گەرمی ڕۆنی پێدەدەن، لەو دەمە مەلا ئەفەندی لە پشتی ڕاوەستایە و ئەویش ئاگای لێ نیە، دەکشێتەوە خۆی لە مەلا ئەفەندی دەدا، سەرتاپای شمەکی ئەفەندی دەشیو هەردێ، فەقێ زۆر شەرمەزار دەبی، لە دلێ خۆی دەلێ: {چم لە خۆم کرد،! دەبی مەلا فەندی لێم بدا، جوونم پێ بدا، دەرم بکا؟ دەشمرم لە برسان جێ نیە بچمێ، مەلا فەندی هیچ بە فەقێ نالێ، یەکسەر ڕوو لە پیاوەکە دەکات، خۆی لێ تورە دەکات، دەلێ: من چەند پارەی زۆرتان دەدەمێ، تا خواردنی چاك لۆ فەقێیان دروست بکەن، ئەو شیوە خراپە چیە بۆ ئەو فەقیرەت هیناوە؟}. ئەوەش ماقولێ و گەورەیی مەلا ئەفەندی دەگەینی.

خوورەوشتی: مەلایەکی زیرەك بوو، بێ نەفس و بێ تەماع بوو، مەرەقی دنیاداری نەبوو، عەرەبی و فارسی دەزانی، زمان پاراو و قسەزان بوو، مـەجلیس خـۆش و ئـاوەدان بوو، قسە و نوکتەی پیر و پێشینانی زۆر دەزانی، خـەتی خـۆش بـوو، سـاڵی ١٣٥٨ك – ١٩٣٩ز مەولودنامەی باتەیی نووسیتەوە، ئێسـتا لـە لامانـە نموونـەی چـالاکی مامۆسـتایە، دەستی شیعری هەبووە، چەند شیعری ئاینی هەیە، پێـنج خشـتەکی شـیعری (مـوخلیص)ی کردووە، لە مەدحی شێخ مصطفای نەقشبەندی، ئەوە دەقەکەیتی:

چ ئیکسیرێکە گەر دەستی کەسێ گیربێ لە دامانی
کەمالی دین و دنیا (ذوالجناحین) میسلی وی کانی
گوڵی گوڵزاری (هەرشەم) هەر بمینێ بەشقی یەزدانی
لەژێر چەرخی فەلەك قوربان ئەتو ئیمڕۆکە سوڵتانی
لە نەشری دین وەلی عەهدی لە جێگەی غەوسی گەیلانی

لە دەست خۆتی نەدەی ئەی دڵ ئەگەر هۆشیاری و عاقیل
ئەوە ئیمڕۆکە بۆ عیلمی زوهور و باطینا حامیل
لە عیلم و مەعریفەت فەردە لە ئەوسافی حەسەن کامیل
لە فەیز و نیسبەت و هیممەت وەکو بەحرێکی بێ ساحیل
لە بۆ حیکمەت بە من ناکرێ قیاسی کەم بە لوقمانی

فیدات بێ جان و ڕووحی من دەبا لوتفێ وەکو باران
ببـی بۆ قەلبـی دێمی من کە دێم پێویستە بۆ باران
خوناوی هیممەتت داگرێ سەرو ڕۆیی سیەه چاران
ئەگەر ساتێ لەسەر یەك بێ بوەستم ڕووبەڕووی یاران
دەبی شێت بم ئەگەر بیدەم، بە هەولێر و سولەیمانی

ئەگەر مەیلی هەبی دلدار دەبی تەرکی بکەم یەکجار
کەلام و گفتوگۆی هەرکەس چ لادێ بی چ ئەهلی شار

لەسەر ئەم یکرەیە عەزمم لە پێشی ئەو دەکەم ئیقرار

لەسەر ئەمر و ئیشارەی یار دەکەم تەرکی هەموو ئەغیار

لە لای من خۆشترە تەرکی هەموو عالەم لە هیجرانی

لە بۆ بێ چارە و وهێتیم لە عەسری ئێمە تو بابی

لە زومرەی (أولیاء اللە) نەبوو میسلی لە پاش بابی

لە دوو ئەو دەورە وابزانم شەبیهت قەت پەیا نابی

لە گولزاری ویلایەتدا، گولێکی زێدە نایابی

لە نێو تاریکی ئەو عەسرە، وەکو خورشیدی تابانی

زمانم وەرگەڕێ چم گۆت، لە خۆما هیچ نەبوو ئاگەم

بەلێ ڕاستە لە نیسیانە خەلق بووینە بەنی ئادەم

لەبەر ڕیسوا و پەرێشانی لە قەلبا دڵ نیە یەك دەم

پەرێشانم لە حالی خۆم بەخۆشم من لە خۆ ناگەم

نەزەرتان گەر لەسەرمان بی چ ناکاتن پەرێشانی

تعالوا، فاشربوا کأسا رحیقا في نوادیه

فهل عیباً تروا فیه أفي بطن وبادیه

ألا فأکشف عمی القلب ولاتنکر أیادیه

نوالي من یوالیه، نعادي من یعادیه

هو المعیار للحب، لدی راض وغضبان

لە غەمخواری دەمێکە من وەکو دانەی خورا و ناوم

لەسەر گاز مالوکەی میحنەت فەلەك دایناوم لەسەر داوم

بە تۆتیای ژێری نەعلینت جەلاکەم نوری دوو چاوم

سەرم دانایە ژێر کەوشی هەلّی ناگرم هەتا ماوم

ئەوەی لۆمەم دەکا عوزری قەبولە چونکە نایزانی

لە بەینی نەفس و شەیتانا (کەریم) والێی پەشۆکاوە
سەرابێ گەر ببینی وادەزانی، لوججەیی ئاوە
لە بەحری هیممەتت بەحری موحیت پڕ لوججەیی ئاوە
لە ڕێگادا خەریك ماوە، هەموو دەم مات و داماوە
بە زوو (موخلیص) عیلاج نەکرێ، گەلێ نێزیکە فەوتانی

منیش ئەو شیعرەم کردیتە حەفت خشتەکی، بڕوانە دیوانەکەم، لاپەڕە ٢٤ – ٢٧.

مامۆستا ساڵی ١٩٦١ز هاتە (هەولێر) لە ١٦/٢/١٩٧٥ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: چاوپێکەوتنێك لەگەڵ کاك فاروق برازای مامۆستا.

## عبدالكريم عبدالقادر موهاجیر (٩١١)

ناوی عبدالکریمە، کوڕی عبدالقادرە، ساڵی ١٢٧١ك – ١٨٥٤ز لە (سنە) هاتە دنیا خۆی و سێ برایەکانی شێخ محەممەد سەعید و شێخ مەحمود و شێخ ئەحمەد، لە خزمەت باوکی و شێخ نەسیمی (مامی) لە ئێران ئاوارە بوون بۆ (سلێمانی) بۆیە ناسراوە بە (موهاجیر)، کە باوکیان کۆچی دوایی کرد، بەشێکیان گەڕانەوە (ئێران)، مامۆستا عبدالکریم لە شوێنی باوکی دانیشت، لە مزگەوتی مەلا عەلی نیظامی دەستی کرد بە دەرسدانەوە، پاشان مزگەوت و قوتابخانەی نوێی دروست کرد، شوێنی بۆ مێوانان دابین کرد، جێگای خۆی گواستەوە بۆ ئەو شوێنە، لەوێ دەستی کرد بە خزمەتی ئاینی پیرۆز، میوانداری مێوانان، دەرسدانەوەی فەقێیان، بەردەوام بوو لەسەر ئەو کارە پیرۆزانە تا کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی هەبوو ناو عبداللطیف، ئەویش کۆچی دوایی کرد. سێ کوڕی هەبوو: عبدالله و باباعەلی و محەممەد سەعید.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣١٩ – ٣٢٠.

## عبدالكريم قاسم بەرزنجی (٩١٢)

ناوی عبدالکریمە، کوڕی شێخ قاسمی کوڕی حوسێنی کوڕی بایەزیدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی شێخ بابارەسولی بەرزنجی یە، دەستی کرد بە خوێندن، پاش کۆتایی پێ

هینان بووە مەلا لە مزگەوتی باباعەلی لە (سلێمانی)، لەوێ دەرسی دەدا، مەلا ئیبراهیمی بیارە و مەولانا خالیدی نەقشبەندی فەقێی ئەو زاتەنە، ساڵی ١٢١٣ك – ١٧٩٨ز بە نەخۆشی تاعون کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٢١.

## عبدالكريم ماليك جزيرى (٩١٣)

ناوی عبدالکریمە، کوڕی مالیکە، خەڵکی (حەڕان)ە لە جزیرەی بۆتان، زانایەکی فەرموودەناس و بڕواپێکراو بووە، ساڵی ١٢٧ك – ٧٤٤ز کۆچی دوایی کرد، تازە داوی سپی لە ڕیشی پەیدا ببوو.

سەرچاوە: شذرات الذهب ١/١٧٣.

## عبدالكريم محەممەد (ابو السعود) ئامێدی (٩١٤)

ناوی عبدالکریمە، کوڕی محەممەدی کوڕی ئەبو سعودی ئامێدی یە، ساڵی ٩٧١ك – ١٥٦٣ز باوکی کۆچی دوایی کرد، باپیری بە خێوی کرد و فێری زانیاری کرد، کرا (مدرس) لە قوتابخانەی مەحمود پاشا، پاشان چووە قوتابخانەی ئەبو ئەیوبی ئەنصاری، دوایی چووە قوتابخانەی سوڵتان سولەیمان، لەوێ ساڵی ٩٨١ك – ١٥٧٣ز کۆچی دوایی کرد، مامۆستا نووسەرەکی چاك بوو، خەتی خۆش بوو، قسە ڕەوان بوو، مەرەقی دەرسدانەوە بوو، ڕووخۆش و مەجلیس ئاوەدان بوو.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣١٦.
٢. معجم أعلام الكورد ٤٤٠.
٣. مشاهير الكورد ٢/٣٣ – ١٢٧.
٤. معجم المؤلفين ٣/٦.

## عبدالکریم محەممەد (مدرس) (٩١٥)

ناوی عبدالکریمە، کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالفتاحی کوڕی سولەیمانی کوڕی مصطەفای کوڕی محەممەدە، عەشیرەتی (قازی)یە، لە مانگی مەولودی ساڵی ١٣٢١ك – ١٩٠٣ز لە گوندی (دەرەشیش) سەر بە (هەڵەبجە) هاتووتەدنیا.

لە لای باوکی دەستی کرد بە قورئانی پیرۆز، دوای خەتم کردن و تەواوکردنی چەند کتێبی سەرەتایی، ساڵی ١٣٣١ك دەستی کرد بە (تەصریفی زەنجانی)، ساڵی ١٣٣٣ك دەستی کرد بە (جامی)، لەو کاتە جەنگی جیهانی یەکەمی دەستی پێکرد، چووە مزگەوتی ملکەندی لە (سلێمانی)، دوایی چووە مزگەوتی مەلا محەممەدئەمینی بالیکدەری لە گەڕەکی (سەرشەقام)، ماوە لەوێ تا (سیوطی) تەواوکرد، پاشان گرانی و نەبوونی کاری کردە سەر خەڵکان، بە تایبەت فەقێ ناڕەحەت بوون، مامۆستا (سلێمانی) بەجێهێشت، چووە (دورود)، لەوێ شێخ عەلائەدینی شێخ عومەر چاودێری کرد، لە بارەی خوێندن و ژیان، تا شارەزا بوو لە شەریعەت و نەحو و ئاداب و مەنتیق و فەلەکیات، ساڵی ١٣٣٨ك لەگەڵ شێخ چووە (بیارە) لەوێ لای مەلا محەممەد سەعیدی عوبێدی دەستی کرد بە بورهانی (گەلەنبەوی)، دوایی لە گوندی (بالك) لای مەلا مەحمود فەرائیزی شێخ مەعروف و شەرحی عەقائیدی نەسەفی خوێند، پاشان لەسەر فەرموودەی شێخ گەڕاوە (بیارە) لەوێ لە لای مەلا ئەحمەدی (ڕەش) دەستی کرد بە عەقیدەی مەرضیە و (مطول)، ساڵی ١٣٤٠ك لەگەڵ مەلا ئەحمەد چووە خانەقای مەولانا لە (سلێمانی)، دوایی مەلا ئەحمەد بووە مەلای (گەلالە)، مامۆستا عبدالکریم لە خانەقا ماوە، لە خزمەت شێخ عومەری قەرەداغی دەستی کرد بە خوێندن کەوتە ژیانێکی نوێ، دەرگەی زانستی لێ کراوە، دەستی کرد بە نووسین و کتێب دانان و حاشیە دانان، لەو ماوەیە کتێبانی: (أقصی الأماني) و (بەلاغە) و (فریدە)ی نەحو و (شرح المنهج)ی شێخ زەکەریای ئەنصاری و باسی خولع لە (توحفە)ی خوێند، گوێی لە دەرسەکانی: (بورهان) و (تشریح) و (خلاصة الحساب) و (أشکال التأسیس) و (تقریب المرام) و (جمع الجوامع) و (أسطرلاب)

و (ربع) و (لاري) حیکمەت و حاشیەکانی شێخ عبدالقادری موهاجیر گرت، ساڵی ١٣٤٣ك – ١٩٢٤ز ئیجازەی مەلایەتی لە جەنابی قەرەداغی وەرگرت.

مەلایەتی: یەکەم جار بووە مەلا لە (نەرگسەجارِ) نزیك (هەڵەبجە) لەوێ دەستی کرد بە دەرسدانەوە و کاروباری مەلایەتی، پاشان لە سەرەتای ساڵی ١٣٤٧ك لەسەر خواستەی شێخ عەلائەدین چووە (بیارە) لەوێ کرا (مدرس)، ئەمجا پتر توانی دەرس بدا و دەگەر مەلایە چاکەکانی دەهاتنە خانەقا پتر گفتوگۆ بکا، لە کتێب پەك نەدەکەوت، کتێبخانەی شێخ دەوڵەمەند بوو، لەبەر ئەو هۆیانە لەو شوێنە پیرۆزە شارەزای تەواوی لە زانستەکان پەیدا کرد، دەستی باڵا بوو لە دەرس و نووسین و دانان، بە هۆنراوە و بە پەخشان، بە کوردی و عەرەبی و فارسی هەر سێ زمان، بووە پسپۆڕ و سەرچاوە بۆ بابەتەکان، خوای گەورە وای کرد، ئەو مەڵبەندە ئاینیە، رۆژ بە رۆژ پتر گەشەی پێ دەدرا نزیکەی صەد فەقێ لەو خانەقایە بوون، شێخ عەلائەدین هەموو پێداویستی بۆ جێبەجێ دەکردن، لە ساڵی ١٣٤٧ك تا ساڵی ١٣٧١ك مامۆستا دەوری چل و پێنج ئیجازەی مەلایەتی دا.

ساڵی ١٣٧١ك باری کرد لە (بیارە) چووە شاری (سلێمانی) مزگەوتی حاجی جان لە گەڕەکی ملکەندی، ساڵی ١٣٧٤ك چووە (کەرکوك)، ساڵی ١٣٨٠ك چووە (بەغدا) لەوێ کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی (ئەحمەدیە) و (مدرس) لە مزگەوتی شێخ عبدالقادری گەیلانی، جگە لە کورد و عەرەب، چەند قوتابی لە (جاوە) و (تورکیا) و (مەغریب) و (جەزائیر) دەهاتنە لای، ساڵی ١٣٨٨ك – ١٩٦٨ز چووە سەفەری (حەج)، ساڵی ١٣٩٣ك مزگەوتی (ئەحمەدییە)ی بە جێهێشت یەکجاری هاتە مزگەوتی (غەوس) بۆ دەرس و فەتوا و کاروباری ئاینی، ساڵی ١٩٧٣ز خانەنشین کرا، ساڵی ١٩٧٤ز کرا سەرۆکی زانایانی موسوڵمانانی عێراق، ساڵی ١٩٧٨ز کرا ئەندامی کۆڕی زانیاری عێراق.

مامۆستا و مزگەوتی غەوس: مامۆستا لە لایەن ئەوقاف خانەنشین کرا، بنەماڵەی گەیلانی کە سەرپەرشتی مزگەوتیان دەکرد، ڕازی نەبوون مامۆستا بڕوا و ئەوێ چۆڵ بکا. لە لای خۆیان دایانمەزراندەوە وەکو جاران بەردەوام بوو لەسەر دەرس و فەتوا و نووسین و ئامۆژگاری، شەوان و ڕۆژان لە هۆدەکی قاتی سەرەوە دادەنیشت، وەڵامی پرسیارەکانی دەداوە کە ئاراستەی دەکران لە لایەن کورد و عەرەب و تورکمان، لە عێراق و عەرەبستان، لە ئەفغان و لە پاکستان، مەلایانی (بەغدا) بە کۆمەڵ دەهاتنە لای بۆ خوێندن، بە ڕاستی مەجلیسی پڕ خێر و بەرەکەت بوو، باسی دنیا لەوێ نەبوو، ئەو ماوەی لە خزمەتی دەمایەوە هەستت بە دڵخۆشی دەکرد، دەتویست لەوێ هەڵنەستی، ئەو کەسەی ئەو ڕووی خۆی دەدایێ، کابرا وای دەزانی دەستکەوتێکی گەورەی دەستکەوت، زانایەکی بێ فیز بوو، لاف لەسەر کەس لێ نەدەدا، بەرانبەر زانایان خۆی بە نزم دادەنا، بە تایبەت ڕێزی شێخەکانی (بیارە) و (تەوێڵە) ی زۆر دەگرت، مریدی شێخ عەلائەدین بوو (خوا لێی خۆش بێ)، بەردەوام خەریکی نووسین بوو، دانراوی کوردی و عەرەبی و فارسی هەیە، بە پەخشان و هۆنراوە، بەشێکیان دەستنووسن، بەشێکیان چاپ کراون.

دانراوەکانی کوردی:

١. نامەی حەقیقەت: ساڵی ١٣٦٢ك دایناوە
٢. ئیمان و ئیسلام: ساڵی ١٣٥٢ك دایناوە.
٣. باخچەی مەعریفەت: ساڵی ١٣٧٣ك دانیاوە.
٤. أساس السعادة: ساڵی ١٣٥٤ك دایناوە.
٥. نامەی هۆشیار: ساڵی ١٩٨٨ز دایناوە، لە ١٩٩٢ز چاپ کرا.
٦. ئاوی حەیات: مێژووی پێغەمبەران (د.خ) ساڵی ١٣٥٨ك دایناوە.
٧. سەنا و سکاڵا: ساڵی ١٩٨٦ز دایناوە، لە ١٩٨٧ز چاپ کرا.
٨. چل چرای ئیسلام: ساڵی ١٣٥٩ك دایناوە.
٩. نامەی بەختیار: ئامۆژگاری یە، ساڵی ١٣٨٤ك دایناوە.

١٠. هۆنراوەی نور و نەجات: ساڵی ١٣٧٦ك دایناوە.
١١. هۆنراوەی نور صەباح: ساڵی ١٣٤٦ك دایناوە.
١٢. مەولودنامە و میعراج نامە: ساڵی ١٣٧٨ك دایناوە، لە ١٩٨٢ز چاپ کرا.
١٣. دوورِشتە: لە شێوەی (ئەحمەدی) شێخ مەعروفە، لە ١٣٨٥ك دایناوە، لە ١٩٩٢ز چاپ کرا.
١٤. شەریعەتی ئیسلام: چوار بەرگە، ساڵی ١٣٧٨ك دایناوە، لە ١٩٧٢ز چاپ کرا.
١٥. بەهار و گوڵزار: ساڵی ١٩٧٧ز چاپ کرا.
١٦. وتاری ئاینی بۆ ڕۆژانی هەینی: ساڵی ١٣٨٢ك دایناوە، لە ١٩٧٠ز چاپ کرا.
١٧. بارانی ڕەحمەت: ساڵی ١٣٥٤ك دایناوە، لە ١٩٥٨ز چاپ کرا.
١٨. یادی مەردان: دوو بەرگە، لە ١٩٧٩ و ١٩٨٣ز چاپ کرا.
١٩. لێکدانەوەی دیوانی مەولەوی: ساڵی ١٣٨٢ك دایناوە، لە ١٩٦١ز چاپ کرا.
٢٠. شەرحی دیوانی نالی: ساڵی ١٩٧٦ز چاپ کرا.
٢١. شەرحی دیوانی سالم.
٢٢. شەرحی دیوانی مەلا مصطەفای بێسارانی.
٢٣. شەرحی دیوانی مەحوی: ساڵی ١٣٨٢ك دایناوە.
٢٤. شەرحی دیوانی فەقێ قادری هەمەوەند: ساڵی ١٩٨٠ز چاپ کرا.
٢٥. ئیقبال نامە: ساڵی ١٣٥٤ك دایناوە.
٢٦. نوری قورئان: ساڵی ١٣٩١ك دایناوە، لە ١٩٨٥ز چاپ کرا.
٢٧. ڕێگای بەهەشت: ساڵی ١٩٨٧ز چاپ کرا.
٢٨. حەج نامە.
٢٩. شەرحی عەقیدەی مەرضیەی مەولەوی: ساڵی ١٩٨٨ز چاپ کرا.
٣٠. باوەشینی دڵ: ژیانی خۆی و مەولانا خالید و چەند شێخانی ترە.
٣١. شەمامەی بێندار: فەلسەفە و ئامۆژگارییە.

٣٢. پەیرِەوان: باسی خەلیفە و کورِەکانی شێخ عوسمانە (خوا لێی خۆش بی).

٣٣. وەنەوشەی ئازار: ساڵی ١٤٠٣ك دایناوە.

٣٤. بنەماڵەی زانیاران: ساڵی ١٩٨٤ز چاپ کرا.

٣٥. شەرحی تەصریفی زەنجانی: ساڵی ١٣٧٣ك چاپ کرا.

٣٦. شەرحی قەصیدەی نوری (خاکی).

٣٧. شەرحی (فتح القریب).

٣٨. رِۆژگاری ژیانم.

٣٩. تەفسیری نامی: حەوت بەرگە، لە ١٩٧٧ز – ١٩٧٩ز دایناوە لە ١٩٨٠ز – ١٩٨٤ز چاپ کرا.

٤٠. خولاصەی تەفسیری نامی: سێ بەرگە، ساڵی ١٩٨٥ز دایناوە.

٤١. الحدیقة الوردیة لأهل العقیدة المرضیه.

٤٢. رِێگەی رِەهبەر: ساڵی ١٩٨٢ز دایناوە، لە ١٩٨٥ز چاپ کرا.

٤٣. زمانی دووبرا.

٤٤. بەدیع و عەرووزی نامی: ساڵی ١٩٨٩ز دایناوە، لە ١٩٩١ز چاپ کرا.

٤٥. سۆسەنی کۆسار: ئامۆژگاری یە، لە ١٤١٩ك دایناوە.

٤٦. مەکتوباتی کاك ئەحمەدی شێخ: لە ١٩٨٤ – ١٩٩١ز چاپ کرا.

٤٧. بەڵگەی نادان.

دانراوەکانی فارسی:

٤٨. شمشیری کاری، بر فرقی نسیمی رستەگاری: وەڵامی کتێبی (نەسیمی رِستەگار)ی ئایة الله محەممەد مەردۆخی سنەیە، لە باسی تەقلید و ئیجتیهاد، ساڵی ١٣٥٦ك دایناوە.

٤٩. شەهابی سەما دەر رەجمی جن جانی نما: وەڵامی نامەی (جان نما)ی ئایة الله محەممەد مەردۆخی سنەیە: ساڵی ١٣٦٤ك دایناوە.

٥٠. فیوضات خداي ذی المنن: هۆنراوەیە، ڕەدی (یەزدان و ئەهرەمەن)ی ئایەالله ی مەردۆخی سنەیە، ساڵی ١٣٦٥ك دایناوە.

٥١. گوڵزاری حیکمەت: ساڵی ١٣٧٧ك دایناوە.

٥٢. هۆنراوەی تەجوید: ساڵی ١٣٧٣ك دایناوە.

٥٣. ڕای حیکمەت: هۆنراوەیە.

٥٤. فوائد الفوائح: شەرحی هۆنراوەی مەولەوی یە، لە ١٩٩٢ز دایناوە، لە ١٩٩٥ز چاپ کرا.

دانراوەکانی عەرەبی:

٥٥. العلمان في العلمين: الوضع والاستعارة: ساڵی ١٩٧٣ز دایناوە.

٥٦. الصرف الواضح: ساڵی ١٩٦٣ز دایناوە

٥٧. العقد الذهب في جيد الأدب: بەدیع و عەرووزە.

٥٨. مفتاح الأدب: ساڵی ١٩٧٣ز دایناوە.

٥٩. خلاصة البيان في الوضع والبيان: ساڵی ١٣٧٤ك دایناوە.

٦٠. المفتاح: ساڵی ١٩٣٤ز دایناوە.

٦١. الورقات: ساڵی ١٣٤٩ك دایناوە.

٦٢. العزيزة: ساڵی ١٣٤٨ك دایناوە.

٦٣. الوجيهة: ساڵی ١٣٤٩ك دایناوە.

٦٤. المقالات في المقولات العشرة: ساڵی ١٣٤٩ك دایناوە.

٦٥. جواهر الفتاوى: پێ بەرگە، ساڵی ١٣٨٢ك دانیاوە، لە ١٩٦٩ – ١٩٧١ز چاپ کرا.

٦٦. الوسيلة في شرح الفضيلة للمولوي: لە ١٣٧٦ك دایناوە، لە ١٩٧٢ز چاپ کرا.

٦٧. إرشاد السالك إلى المناسك: ساڵی ١٩٨٣ز چاپ کرا.

٦٨ المواهب الحميدة في حل الفريدة للسيوطي: دوو بەرگە، ساڵی ١٣٧٤ك دایناوە، ساڵی ١٩٧٧ز چاپ کرا.

٦٩ نور الاسلام: ساڵی ١٩٧٧ز دایناوە، لە ١٩٧٨ز چاپ کرا.

٧٠ مواهب الرحمن في تفسير القرآن: حەوت بەرگە، ساڵی ١٩٨٥ز دایناوە، لە ١٩٨٦ – ١٩٨٩ز چاپ کراوە.

٧١ نور الإيمان: ساڵی ١٩٧٨ز چاپ کراوە.

٧٢ علماؤنا في خدمة العلم والدين: مێژووی زانایانی کوردە: ساڵی ١٤٠١ك دایناوە، لە ١٩٨٣ز چاپ کرا.

٧٣ إسناد الأعلام إلى سيد الأنام: ساڵی ١٩٨١ز دایناوە، لە ١٩٨٣ز چاپ کراوە.

٧٤ الرسالة وأنوارها: ساڵی ١٩٨٩ز چاپ کرا.

٧٥ البركات الأحدية، في شرح الصمدية: ساڵی ١٣٤٠ك دایناوە.

٧٦ صفوة اللآلي من مستصفى الغزالي: لە ١٣٧٥ك دایناوە، لە ١٩٨٦ز چاپ کرا.

٧٧ إرشاد الأنام، الى أحكام الإسلام: لە ١٩٨٧ز دایناوە، لە ١٩٩٠ز چاپ کرا.

٧٨ الأنوار القدسية في الأحوال الشخصية: ساڵی ١٤٠٨ك دایناوە، ساڵی ١٩٩٠ز چاپ کرا.

٧٩ مناجات عند قاضي الحاجات.

٨٠. الوردة العنبرية: ساڵی ١٩٩٢ز دایناوە، لە ١٩٩٤ز چاپ کرا.

٨١. جواهر الكلام: ساڵی ١٩٥٦ز دایناوە، لە ١٩٩٣ز چاپ کرا.

٨٢. خلاصە جواهر الكلام: ساڵی ١٩٩٢ز دایناوە و چاپ کراوە.

٨٣. التجويد المنظوم بالرجز: ساڵی ١٣٤٨ك دایناوە.

٨٤. القصيدة الوردية.

نمونەی شیعری مامۆستا:

گەلێ لە زانای خاوەن بیر و هۆش گەلێ ئەدیبی بوساغی تێکۆش

گەلێ مەردانی بە عەقڵ و ویژدان زۆر پاڵەوانی ئامادەی مەیدان

گەلێ دڵپاکی بۆ مەردوم دڵسۆز زۆر دڵڕۆناکی خاوەن عەشق و سۆز

گەلێ دلبەری سەروی سنۆبەر کە تانەی ئەدا باڵای لە عەرعەر

گەلێ بەخشندەی خاوەن خانەدان پەنای ڕۆژی ڕەش بۆ حاجەت مەندان

مردن و گیانیان گەیشتە بەهەشت باسێکیان نەما نە لە شار نە دەشت

مایەی ئازارە بۆ دڵی هۆشیار سوودێ وەرنەگرێ لە چەرخی دەووار

تۆماری دەوری خۆی نەکاتەوە ئاور بۆ حاڵی کەس نەداتەوە

نەکا بە سەر مەشق ئیشی پێشینان نەکا بە ڕێگە ڕێی تێکۆشینیان

جیهان قەڵایە و ئینسان پاسەوان نا ڕەوایە بۆی نوستنی شەوان

پێویستی مەردە لە ڕووی جیهانا بێداربی لە گشت ماوەی ژیانا

مەبەستی (نامی) لەم تولی و عەرزە ئەمەیە بۆ مەرد کەرامەت فەرزە

کۆچی دوایی: پاش خزمەتێکی بێ وچان بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام، تەمەنێکی پڕ لە صەد ساڵ لە خواپەرستی و فەتوا و نووسین و دانان و بەلاوکردنەوەی ئەدەب و ڕێزمان، ڕۆشنبیری و شیعر بۆ گەلی کورد، لە ڕۆژی سێ شەمەی ٣٠/٨/٢٠٠٥ز ٢٥ی ڕەجەبی ١٤٢٦ك بارگەی خۆی تێکنا لە مزگەوتی غەوسی گەیلانی بەرەو بارەگای پەروەردیگار، خواحافیزی لە فەقێ و مەلایان و دۆست و برادەران و گەلەکەی کرد، سڵاوی خوات لەسەر بی مامۆستای دڵپاك، لەو ڕۆژە بووی، لەو ڕۆژە چووی، وە لەو ڕۆژەی کە زندی دەبیەوە، خواپاداشتی هەموو چاکەکانت بداتەوە کە بە ئیسلامت گەیاند، گەلی کورد شانازیت پێ دەکا هەتا ڕۆژی دوایی.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٢٤ – ٣٣٢ – ٣٦٩.

٢. الفرائد الجديدة / پێشەکی

٣. عقد الجوهر ١٩٦٢ – ١٩٦٣.

٤. أعلام کورد العراق ٤٧٩ – ٤٨٣.
٥. معجم أعلام الکورد ٤٤١ – ٤٤٣.
٦. خۆری ئیسلام ١٨/٢٠٠٢ز، ٧٩ – ٨٠.
٧. خۆری ئیسلام ٣١/٢٠٠٦ز، ٦٤ – ٦٦.
٨. سەدەیەك تەمەنی نورین ٣٨.
٩. إسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢٥٩.

## عبدالکریم محەممەد واژی (٩١٦)

ناوی عبدالکریمە، کوڕی سەید محەممەدە، ساڵی ١٨٨٦ز لە گوندی (کانی هەڵۆژە) هاتووتەدنیا، باوکی لە زووەوە کۆچی دوایی کرد، لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا دایکی ناردییە (بانە) بۆ خوێندن، دوایی چووە شاری (سلێمانی) لای شێخ عومەری قەرەداغی، دوایی چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادر ماوە تا ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (سنە) ماوەك لەوێ مەلا بوو، دوایی چووە ناوچەی (موکریان)، لەوێ چەند دەرسی داوە، مەلا صادقی قزلجی و مەلا حەکیمی تالشی فەقێی ئەون، مامۆستا واژی چەند ئیجازەی مەلایەتی داوە، بەردەوام بوو لەسەر خزمەتی ئاینی پیرۆز، تا ساڵی ١٩٥١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تأریخ فرهنگ وادب مکریان ٣٧٨ – ٣٨٠.

## عبدالکریم مەنصور باوەشنایا (٩١٧)

ناوی عبدالکریمە، کوڕی مەنصوری کوڕی ئەبوبەکری کوڕی عەلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی جابیرە، ساڵی ٥٨٣ك – ١١٨٧ز لە گوندی (باوەشنایا)ی سەر بە (موصل) هاتووتەدنیا، زانایەکی خێرخواز و بەدین بووە، دنیای مەبەست نەبووە، زۆر بە قەناعەت بووە قورئانی پیرۆزی هەموو لەبەربووە، خەریکی فەرموودە و شەریعەت و نەحو بووە، هاتە (هەولێر) بەڵام لەبەر نەخۆشی نەیتوانی دەرس بداتەوە، مامۆستا شاعیرەکی

چاك بووە لە مەتحی ئیمامەکان ئەو پارچە شیعرەی بە دیاری بۆ (ابن المستوف) ڕەوان کردیە:

| | |
|---|---|
| وقائل عبدالكريم مالكا | لاتمدح الحبر الإمام مالكا |
| وتمدح المطلبي بعده | وابن هلال أحمد المباركا؟ |
| قلت له: إسمع مديحي فيهم | فانني لست لذاك تاركا |
| وكيف لا أمدح أشياخ الهدى | وكلهم للحق كان سالكا |

ساڵی ٦٥١ك – ١٢٥٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. تأريخ أربيل ١/٤٤٧ /٢/٦٩٧.
٢. معجم البلدان ١/٣٢٢ ، ٣٣٣ ، ٣٨٧ ، ٤٧٢ ، ٥/٢٨٨.

## عبداللطیف ئەحمەد شارەزوری (٩١٨)

ناوی عبداللطیفە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی عبداللّٰهی کوڕی قاسمی شارەزورییە، نازناوی (أبوالحسن)ە، لە ٢٢ی مانگی مەولودی ساڵی ٥٤٢ك – ١١٤٧ز هاتووتەدنیا دەرسی لە لای فەخرەدینی عبداللّٰهی شارەزوری خوێندووە، چەند جار لە (موصل) کرایتە قازی، شەوی چوار شەمەی ٨ی جیمادی دووەم، ساڵی ٦١٤ك – ١٢١٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٦٤.
٢. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٤١٩.
٣. مشاهير الكورد ٢/٣٦.
٤. معجم أعلام الكورد ٤٤٦.
٥. الإكليل في محاسن أربيل ٩٤.

## عبداللطیف ئەحمەد گۆران (٩١٩)

ناوی عبداللطیفە، کوڕی ئەحمەدە، ناسراوە بە گۆرانی، مەزهەبی حەنەفی بووە، لە شاری (حەلەب) هاتووتەنیا، هەر لەوێ پێگەیشتووە، کرایتە (موفتی)، زانایەکی زۆرزان و نووسەر و شاعیر بووە، دوا عەمری وازی لە هەموو شت هینا، تەنیا لە مالەوە خەریکی خواپەرستی بوو، سالی ١١٥٠ك – ١٧٣٧ز لە حەلەب کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الکورد ٢٨٤.

٢. معجم أعلام الکورد ٤٤٦.

## عبداللطیف عبدالرحیم بەرزنجی (٩٢٠)

ناوی عبداللطیفە، کوڕی عبدالرحیمی کوڕی قاسمی کوڕی حەسەنی کوڕی ئەبایەزیدی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی بابارەسولی کوڕی موئتەمەنی کوڕی ڕەسولی کوڕی قەلەندەری کوڕی عیسا ئەحدەبی کوڕی حوسێنی کوڕی ئەبو یەزیدی کوڕی عبدالکریمی کوڕی سەید عیسای گەورەیە، کە یەکەم کەسە لە کوردان لە (بەرزنجە) دانیشتووە، ئەو زانایە زاتێکی پایەدار و شارەزا بووە لە زانستەکان، بە تایبەت شەریعەت و فەرائیز و حیساب و جەبر و موقابەلە و نەحو و ئاداب و کەلام و ئەدەبیات.

دانراوەکانی: لە زۆر بابەتان، دانراوی خۆی هەیە، لەوانە:

١. منهج الفرائض: هۆنراوەیە، لەسەر داوای مەلا خضر ناوەك، دایناوە.

٢. روضة اوداد السنن: هۆنراوەی دانراوێکی شێخ وەسیمی (سنە)یە سەرەتایەکەی دەست پێ دەکا بە:

| | |
|---|---|
| ضمنتها من سنن الصلاة ما | جمعه (الوسیم) فخر العلما |
| سمیتها (روضة أوداد السنن) | ففي اسمها تأریخ نظمها علن |

١٢١٧ك.

٣. القواعد النحویة: هۆنراوەیە، کۆتاییەکەی ئەوەیە:

وإذ لجلّ النحو نظمي فاكتفى　　أرّخته بقولي: (نظمي قد كفى) ١٢١٤ك.

٤. نامیلکەی ئاداب: هۆنراوەکی بچووکە.

٥. العوامل الحرفية: هۆنراوەیە، لە کۆتایی دا، دەڵێ:

وحين وفقت على الإتمام　　أرختها بـ (أليق الختام) ١٢١٢ك.

٦. أحكام الصفة المشبهة: هۆنراوەکی بچووکە.

٧. نظم العوامل: بۆ عەلی کوڕی سولەیمانی داناوە، سەرەتایەکەی دەڵێ:

يقول عابد اللطيف المعتصم　　أحمد من إليه يصعد الكلم

٨. جەبر و موقابەلە: هۆنراوەیە.

٩. قەسیدەی (لامیە): لە ستایشی خالید پاشای بابانی داناوە.

١٠. مێژووی دروستکردنی مزگەوتی عبدالرحمان پاشا.

١١. مێژووی دروست کردنی مزگەوتی (نەفت).

١٢. چەند فەتوای شەرعی.

١٣. هۆنراوەی عەرەبی بە بۆنەی کۆچی دوایی عبدالرحمان پاشای بابان.

١٤. نامیلکەی کەلام، لەسەر داوای صبغةالله ی کۆیە.

١٥. چەند شیعری فارسی.

١٦. لێکدانەوەی چەند مەتەڵی (حیساب).

١٧. نامیلکەی کەوتنی تەڵاقی سێ بە سێ، دژی مامۆستا محەممەدی مەدەنی.

١٨. قەصیدەی عەرەبی: لە مەتحی مەولانا خالیدی شارەزوری.

سەرچاوە: بوژاندنەوە ١/٣٠٢ ، ٣٠٣ ، ٣٠٥ ، ٣١٨.

## عبداللطیف عبدالله بەرزنجی (٩٢١)

ناوی عبداللطیفە، کوڕی سەید عبدالله ی بەرزنجی یە، ساڵی ١٩٤٣ز لە گوندی (کوردا)ی سەر بە شاری (سلێمانی) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، ماوەك لە (سلێمانی) و ماوەك لە (هەڵەبجە)، ساڵی ١٩٦٤ز ئیجازەی لە مەلا عارفی ئەبوبەکری

چۆڕی وەرگرت، پاشان چووە (بەغدا) ساڵی ١٩٧١ز (کلیە)ی ئیمامی ئەعزەمی تەواو کرد، هەر لەوێ بڕوانامەی (ماستەر)ی لە شەریعە تی ئیسلام وەرگرت، ماوەك پێش نوێژ و وتارخوێن بوو لە بەغدا، دوایی کرا (مدرس) لە (کلیە)ی شەریعە، پاشان کرا (مدرس) لە زانکۆی (سلێمانی)، لە ئەنجامی ڕووداوێکی (سەیارە) لە ئێران کۆچی دوایی کرد. کتێبی (التعارض والترجیح بین الأدلة الشرعیة)ی داناوە، دوو بەرگە.

سەرچاوە: إسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الإسلامیة ٢١٢.

## عبداللطیف عبدالله قەرەداغی (٩٢٢)

ناوی عبداللطیفە، کوڕی عبداللّٰەی کوڕی عوسمانی کوڕی شێخ عبداللطیفی گەورەیە، ساڵی ١٢٢١ك - ١٨٠٦ز هاتووتەدنیا، یەك بووە لە زانایە بەرزەکانی سەردەمی خۆی لە قوتابخانەی باب و باپیرانی خۆی خوێندووە، هەر لەوێش پێگەیشتووە، بەردەوام بووە لەسەر خزمەتی ئاینی پیرۆز، تا ئەو ڕۆژەی ماڵئاوایی یەکجاری کرد لە دۆست و برادەران، بارگەی تێکنا بەرەو خزمەت بارەگای پەروەردیگار.

کوڕەکانی: خوای گەورە دوزادە کوڕی زانای پێ بەخشیبوو، ناوەکانیان ئەمانەن: شێخ عبدالله، شێخ محەممەد، شێخ مەحمود، محەممەد نەجیب، شێخ جەلال، شێخ عبدالرحمان، شێخ عبدالقادر، شێخ ئەحمەد، شێخ عبدالکریم، شێخ عەلی، شێخ عبدالله، شێخ صالح.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٣٦٦ - ٣٦٧.

٢. بنەماڵەی زانیاران ١٥٧ - ١٥٩.

## عبداللطیف عبدالعزیز حەڕانی (٩٢٣)

ناوی عبداللطیفە، کوڕی عبدالعزیزی کوڕی یوسفی کوڕی عەزیزی کوڕی نیعمەتی کوڕی زەوالەی (حەڕانی)یە، ناسراوە بە (ابن المرحل) واتە: کوڕی زین فرۆش، زانایەکی مەزن بوو، لە زانایارییەکانی قورئانی پیرۆز و ڕێزمانی عەرەبی و مەعان و بەیان

شارەزا بوو، لە (حەلەب) و (قاهیرە) دەرسی دەداوە، جەمالەدینی کوڕی هیشام، خاوەنی کتێبی (مغني اللبيب)، یەکە لە فەقێیان ئەو زاتە، هەر ئەو دەڵێ: {ئەبو حەییانی نەحوی خاوەنی تەفسیری (البحر المحيط) هەرچەندە ناوبانگی زۆر ڕۆیشتووە، بەڵام بۆ سوودی فەقێیان و فێرکردن، ناگاتە مامۆستای من، کە (ابن المرحل)ە، لە مانگی (محرم)ی ساڵی ٧٤٤ك – ١٣٤٣ز لە شاری (قاهیرە) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٢/٢٤٧.

## عبداللطیف عبدالمنعم حەڕانی (٩٢٤)

ناوی عبداللطیفە، کوڕی عبدالمنعمی کوڕی عەلی کوڕی نەصرە، ساڵی ٥٨٧ك – ١١٩١ز لە (حەڕان) هاتووتەدنیا، مەزهەبی حەنبەلی بووە، زانایەکی فەرموودەناس و شەرع زان بووە، ساڵی ٦٧٢ك – ١٢٧٣ز لە قەڵاتی جەبەل لە (قاهیرە) کۆچی کرد.

دانراوەکانی: (السباعيات والثمانيات في الحديث): چەند بەرگە، وە (المعجم): حەوت بەرگە، مێژووی ئەو مامۆستایانەیە کە ئیجازەیان پێداوە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/٣٣٦.
٢. معجم المؤلفين ٦/١٢ – ١٣.
٣. كشف الظنون ١/٥٢٣ /٢/ ٩٧٥.
٤. هدية العارفين ١/٦١٦.

## عبداللطیف محەممەد قەرەداغی (٩٢٥)

ناوی عبداللطیفە، کوڕی محەممەدی کوڕی عبداللطیفي کوڕی عبدالله ی کوڕی عوسمانی کوڕی شێخ عبداللطیفي گەورەیە، لە دەوری ساڵی ١٢٩٠ك – ١٨٧٣ز لە شاری هەڵەبجە هاتووتەدنیا، لە قوتابخانەی محەممەد پاشای جاف لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادر ماوە، تا ئیجازەی وەرگرت.

گەڕاوە (هەڵەبجە) یارمەتی باوکی و شێخ محیەدینی برای دەدا، پاش کۆچی دوایی ئەو دووانە شێخ عبداللطیف بووە جێگریان، خەریکی دەرسدانەوە و خزمەتی میوانان بوو، دوایی کرا قازی شەرعی (هەڵەبجە)، هەر لەوێ ساڵی ١٣٤٦ك – ١٩٢٧ز کۆچی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٦٧.

## عبداللطیف مەعروف دمرقولەیی (٩٢٦)

ناوی عبداللطیفە، کوڕی مەعروفی کوری عبداللطیفی کوڕی حەسەنی کوڕی شەمسەدینی کوڕی عبدالغفاری کوڕی مەلا گوشایشی کوڕی شێخ محەممەدی مەردۆخی یە، لە گوندی (خارگێلان) نزیك (بیارە) هاتووتەدنیا، پاش تەواوکردنی خوێندنی لە گوندی (زەردی ئاوا) سەر بە (قەڵاچوالان) لە لایەن پاشای بابان کرا (مدرس)، هەروەها پاشا چەند گوندی ئەو ناوچە و چەند گوندی ناوچەی (سەنگاو)ی بۆ خەرجی قوتابخانەکەی دانا، مامۆستا ساڵی ١١٦٣ك – ١٧٥٠ز چووە (قەرەداغ)، ساڵی ١٢١٢ك – ١٧٩٧ز کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی: چوار کوڕی زانای هەبوون: شێخ عومەر و شێخ عوسمان و شێخ ئەحمەد و شێخ محەممەد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٦٥ – ٣٦٦.
٢. بنەماڵەی زانیاران ١٤٧.

## عبدالمؤمن جەمالەدین (٩٢٧)

ناوی عبدالمؤمنە، کوڕی جەمالەدینی کوڕی عبدالمؤمنە، ساڵی ١١٥٢ك – ١٧٣٩ز هاتووتەدنیا، زانایەکی پایە بەرز و بە توانا بووە، کتێبی (درر النظیم)ی داناوە، ساڵی ١٢١١ك – ١٧٩٦ز کۆچی دوایی کردووە.

دوو کوڕی هەبووە:

١. شێخ حەسەن: لە ریازیات شارەزا بووە، خۆشنووس بووە، زۆربەی کتێبە دەستخەتەکانی مزگەوتی (دار الإحسان)ی (سنە) خەتی ئەون.

٢. جەمالەدین: ناسراوە بە جەمالەدینی دووەم.

سەرچاوەکان:

١. تأریخ مشاهیر کورد ١/٢٨١ – ٣٤٧.

٢. بنەماڵەی زانیاران ١٢٥ – ١٢٦.

## عبدالمؤمن عەینتابی (٩٢٨)

ناوی عبدالمؤمنە، ناسراوە بە موئمین حەنەفی، زانایەکی ئاگاداربووە، بە تایبەت لە شەریعەت، زاتەکی دیمەن جوان و ڕووخۆش بووە، لە (عەینتاب) ماوەك دەرسی دەدا، پاشان چووە (حەلەب) ماوە لەوێ، تا ساڵی ٨٠٤ك – ١٤٠١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٧/٤٤.

## عبدالمؤمن فاخیر ئورمەوی (٩٢٩)

ناوی عبدالمؤمنە، کوڕی فاخیرە، خەڵکی شاری (ورمێ)یە، لە (بەغدا) هاتووتەدنیا، هەر لەوێ پێگەیشتووە، نازناوی (رضی الدین) بووە، لە ٦٩٣ك – ١٢٩٣ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبانی (رسالة الشرفية) و (كتاب الأدوار)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٦/١٩٨.

٢. هدية العارفين ١/٦٣٠.

## عبدالمجید سەعید هەرتەلی (٩٣٠)

ناوی عبدالمجیدە، کوڕی مەلا سەعیدی کوڕی خضرە، ساڵی ١٨٩٤ز لە گوندی (هەرتەل) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغی سوختەیی تەواوکرد، لە قۆناغی موستەعیدی: ماوەك لە لای مەلا شێخ طاهای بالیسانی و ماوەك لە لای مەلا ئیسماعیلی

ماویلی و ماوەك لە لای مەلا فتح الله ی هەرتەلی بوو، پاشان چووە مزگەوتی حاجی قادر دەباغ لە (هەولێر) لای مەلا محەممەدئەمینی کونەفلوسەیی ماوە، تا ئیجازەی وەرگرت.

بووە مەلا لە (بێلینگە)، چەند ساڵ لەوێ مەلا بوو، دوایی باری کرد بۆ (هەرتەل) لەوێ دەرسی دەداوە، مەلا مصطفای بێلینگە و مەلا محەممەدئەمین وەرتی و مەلا عەلی (ئال مدرس) فەقێی ئەو بوون، خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆز بوو، تا ساڵی ١٩٨٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عبدالمجید عبدالله گڕاوی (٩٣١)

ناوی عبدالمجیدە، کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی مەلا عبدالکریمی کوڕی مەلا عبداللەی گەورەیە، عەشیرەتی میکائیلی یە، ساڵی ١٩١٦ز لە گوندی (گڕاو) هاتووتەدنیا، (گڕاو): گوندێکە لە ناو دۆڵێك لە ڕۆژهەڵاتی (سەربەن)، کانیاوەکی دەرماناوەی لێیە، بۆیە ناوبراوە بە (گڕاو)، ئەو شوێنە لە قوتابخانە کۆنەکانی کوردستانە مەولانا خالیدی شارەزوری و مەلا ئیبن ئادەمی بالەکی لەو جێگایە لە لای مەلا عبدالله ی گەورەیان خوێندووە.

خوێندنی: لە خزمەت بابی دەستی کرد بە خوێندن، لە قۆناغی سوختەیی بابی کۆچی دوایی کرد، دوایی لە قوتابخانەکانی حوجرەی فەقێیان لەو شوێنانە: (خەتێ)، (بالیسان)، (هیران)، (شەقڵاوە)، (باتاس)، (ڕواندز)، لە لای ئەو بەرێزانەی خوێند: مەلا ئیسماعیل ناقیص، مەلا عوسمانی دۆلەزەیی، مەلا عبداللەی تەرجانی، مەلا عبدالعزیزی شیلەخانی، پاشان چووە (هەولێر) مزگەوتی شێخ مصطفای نەقشبەندی، ماوەی سێ ساڵان لە خزمەت شێخ ماوە، ساڵی ١٩٤٠ز ئیجازەی وەرگرت، بەڵام خوێندنەکەی تەواو نەکردبوو، بۆ ئەو مەبەستە ساڵی ١٩٤١ز چووە (کەرکوك) لای مەلا ئەحمەد حەکیم، ماوەك لەوێ بوو نەخۆش کەت، گەڕاوە (گڕاو) پاش چا بوونەوە، گەڕاوە (کەرکوك) ماوە تا کۆتایی بە خوێندنەکەی هینا، ساڵی ١٩٤٥ز ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: یەکەم جار بووە مەلا لـە گونـدی (تـۆبزاوە) نزیـك کـەرکوك، چـەند ساڵان لەوێ بوو دەرسی فەقێیانی دەدا، دوایی کرا پێش نوێژ و وتـارخوێن لـە مزگـەوتی حاجی مەحمود لە کەرکوك، دوایی هاتە مزگەوتی (ئال میران) لـە شـەقڵاوە، کـە عوسمـان بەگ تازە دروستی کردبوو، پاشان ساڵی ١٩٨٥ز لە (مەسیف) مزگەوت و خانووبەرە و حوجرەی فەقێیانی دروست کرد، بەناوی (مەدرەسەی گڕاو)، چەند خـانووی بـۆ مـەلایان دروست کرد، کە دەرسیان دەداوە، خۆی و فەقێیان و مەلایەکان، لـەوێ جـێگیر بـوون، دەستیان کرد بە دەرسدانەوە، خۆی بە زۆری دەرسی توحفە و بەیزاوی دەداوە بە (ئالقـە) جگە لە فەقێیەکان، چەند مەلا دادەنیشتن لەو دەرسە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبدالصمدی ڕێدار، مەلا عبدالرحمانی شەمشـولەیی، مـەلا صـالحی گردەسـۆری، مـەلا محەمـەدی ئازیانـەیی، شـێخ جـەلالی بـەرزنجی، مـەلا عبدالرحمانی کەلاری، مەلا عومەری باوەفەتی، مەلا ئەحمەد مەهدی مـەتاو، مـەلا عوسمـانی لاسەیی، مەلا عبدالعزیز ئیبراهیم، مەلا شەمسەدینی بەحرکەیی، مەلاعوسمانی گڕاوی، مـەلا محەمەدی گۆڵدەرەیی، مەلا ڕەسولی شێخ مەموندی، مەلا جونەید، لەگەڵ زۆرانی تر.

سەفەرەکانی: ساڵی ١٩٤٦ز چووە سەفەری (حەج)، لە ١٩٦٩ز دووبارە چووە حەج، ساڵانە دەچووە (بەغدا) سێ مانگی زستان لـە تەکیـەی خالیدیـە دەمـاوە هـۆدەی تایبەتی هەبوو، مەلایان قوتابیان ڕۆشنبیران دەهاتنە لای، وەعزی بۆ دەدان، دەرسی ئالقەی دەداوە، مێوانداری دەکردن، خەڵکی بە زۆری دەگێڕاوە، ئەوانەی لە کوردستان دەچوونە لای لەوێ دەمانەوە، یارمەتی دەدان بـۆ ئـیش و کـاری پێویسـتیان، بـە تایبـەت ئەوانـەی نەخۆش بوون هاتووچۆی دکتۆرانیان دەکرد.

خووڕەوشتی: مامۆستا زانایەکی مەزن بـوو، ڕێـزی خـەڵکی دەگـرت، خـەڵکان ڕێزیان لێ دەنا، قسەی خێری دەکرد، قسەی دەڕۆیشت، یارمـەتی هاووڵاتیـانی دەدا، بـە تایبەت بۆ مەلا و فەقێیان قەڵەمی لەکاربوو، لە لای کاربەدەستان نامـەی ڕەت نـەدەکراوە سەخی بوو، حوجرەکەی شێوەی خانەقا بوو، بێ منەت و کرایەوە و والابـوو، حـەزی لـە

تێکەراتی بوو، نەرم و هێمن بوو، قسەخۆش بوو، مەجلیس ئاوەدان بوو، چاوی لە دەستی کەس نەبوو، حەزی لە بەخشین بوو نەك وەرگرتن، سەردانی برادەرانی دەکرد، دیاری بۆ دەبردن، لە شوێنەك دابەزیبایە ،چ سەردانبایە چ سەرەخۆشی بایە چ کۆبوونەوە بایە، وەعزی خۆی هەر دەدا، ئامۆژگاری گەلەکەی دەکرد، جیاوازی لە نێوان کورد و عەرەب و تورك نەدەکرد، کە وەعزی دەدا ئایەتی قورئانی پیرۆزی دەخوێندەوە، فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) لەگەڵ دەبەستا، قسەی نەستەق پەندی پێشینانی لەگەڵ تێکەڵ دەکرد و ووتەی خۆشی بە گەڵدەدا، بۆیە وتارەکانی هەرچەند درێژبوون بەڵام بەتام و جێگربوون، گوێ ڕاگرەکان حەزیان دەکرد، نەبڕێ، ئەوەی ئێستا دەڵێم و نووسیمە، بە چاوانی خۆم دیمە، لە سنوور تێپەڕین نیە، بۆ خاتری کەس نیە، بەڵکو ئەمانەتەکە دەمەوێ بەلاوی بکەمەوە، تاکو گەنجانی نوێ بزانن، ئەو زانایانەی پێشوو، چ خزمەتەکیان پێشکەش کردیە بۆ ئاین و کۆمەڵ و نیشتمان و گەل، وە هەندێ کەس ماوەك پێش ئێستا تانەو تەشەرەیان لەو زانا بەرێزانە دەدا، وە خۆیان دەکردە هاوسەنگ لەگەڵیان، دەیان وت: (هم رجال ونحن رجال)، واتە: (ئەگەر ئەوان زانا بووینە خۆ ئێمەش زانایین)، وە پێیان داخ بوو لە دوو ئەوان بڕۆن، بە داخەوە ئێستا گەنجی واپەیدابووە لەو سنوورەش دەرچووە و دەڵێ: (نحن الرجال فقط)، واتە: تەنیا ئێمە زانایینە ئەوانەی پێشوو، سەریان لە ئاین دەرنەچووەو نەیان زانیوە خزمەت بکەن، خزمەتیان بە ئایین نەکردووە، لە دوو ئەوانە نارۆین چاویان لێ ناکەین.

کۆچی دوایی: ڕۆژی هەینی (٢٠) بیستی مانگی صەفەر، ساڵی ١٤١٥ك – ١٩٩٤ز لە نەخۆشخانەی کۆماری (هەولێر) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانەکەی پێش مزگەوتەکەی خۆی لە (مەسیف) – کە لە پێشدا ئامادەی کردبوو – بە خاك سپێردرا، بەو بۆنەیە بەڕێز (رافع طه العانی) هۆنراوەکی سەرەخۆشی بریتی لە بیست و سێ دێڕ نارد بۆ منداڵەکانی مامۆستا، لە سەرەتایەکەی دەڵێ:

بکت الجبالُ علی الفقید عویلا وتزعزعت لجنابه تبجیلا

دوایی دەڵێ:

بوراثة المختار كان متوجها | بالعلم والتقوى تزغم جيلا

دوایی دەڵێ:

أنعم بجنات النعيم مخلداً | فقطوفها قد ذللت تذليلا

لە کۆتاییدا دەڵێ:

عجبا لقبر كيف يلقف لحده | جبلا يبزّ بين الشاهقات طويلا

أو كيف يحوي بحر علم قاعُه | لاتستطيع له الفحول وصولا

لكن فصل القول فينا إنه | قدكان أمر إلهنا مفعولا

أنا لست أبكي فقدكم فجنابكم | قد صار عند الها شمي دخيلا

لكنني أبكي على بلد غدت | شمس العلوم به تروم أفولا

منیش هۆنراوەکی کوردیم بەو بۆنەوە داناوە، لە ڕۆژی ٣١/٧/١٩٩٤ز کۆتایی تازیە، لە مزگەوتی مامۆستای خوالێخۆشبوو خوێندمەوە، ئەوە دەقەکەیتی:

وا سەرم سوڕما لە ڕۆژێ هۆی چ بوو گۆڕی مەدار

هەر (گڕاو)بوو ڕۆژهەڵاتمان، هەر لەوێش خۆیدا حەشار

تاریکەستان پڕ وولات بوو، نوقتەیی ڕۆنی نەما

داد و فیغان کەوتە ئەرزی، تاکو ئەستێرەی سەما

خۆ (صەفەر)بوو بۆ سەفەر چوو، هەینێ (هەینی) هاتە لای

هەردەبێ میوانی من بی، چونکە ماقوول و مەلای

(مەدرەسە)ی (شەقلاوە) و (کەرکوك) و (تۆبزاوە) دەڵێن:

کێ بە ئالقە دەرسی (بەیزاوی) دەڵێ؟ پێمان بڵێن؟

ئاخیری میسکی خیتام بوو مەدرەسەی (هاوین هەوار)

شاهیدە بۆ دین کە کردت عومری خۆت خزمەتگوزار

وا لە لای باوکی (جەمیلی)، دام و دەزگا ڕێکخراو

هیممەتی پیرمام لەگەڵ بوو، (پیرمەم)ی کردە (گڕاو)
تا لە دەریایی نەزانین، تەڕنەبی پێی قەومی کورد
بۆ قوتابی زۆری دروستکرد، یێکەمین ڕێباز و پرد
خزمەتێکی بێ وچانی ئەحەقا، ئەو شێخە کرد
زیندووە پاش مردنیش، کەس بۆی نەڵێ هاوارە مرد
جارییە ئەو خێرە چونکە، بەردەوامە نابڕێ
غەیری زاتی حەق بە کەس، ئەو چاکە شوکری ناکرێ
نایەهوێ لێتان گەلی کورد، هیچ سوپاسێکی بکەن
دەیەهوێ بەس لای خودا، پاداشەکەی ئاڕاستە کەن
خۆ (گڕاو)بوو جێ نەزەرگە و خوێندنی (مەولانە)مان
واتە: هەردەم حازرە ئەو هیممەتی، نەتبی گومان

کوڕەکانی: مامۆستا سێ کوڕی هەیە:

١. حاجی جەمیل: بەڕێوەبەری کاروباری حەجە لە بەغدا، تا ئێستا پتر لە سی جار چوویتە حەج.
٢. حاجی عبدالحمید: جێگری باوکیی، مزگەوت و قوتابخانەکە بەڕێوەدەبا سوپاس بۆ خودا دریغی نەکردیە بۆ ئاوەدانکردنەوەی ئەو شوێنە ئاینیە، خوا ئەو بنەماڵە خانەدانە نەبڕێنتەوە.
٣. عبدالباری: پێش نوێژ و ووتارخوێن بوو لە بەغدا ئێستا لە دەرەوەی وولاتە.

سەرچاوەکان:


١. نامەی نامیق مەلا ئیسماعیل گەزنەیی.
٢. دیوانی مەلا طاهیری بەحرکەیی ٣٨ - ٣٩.

## عبدالمجید طەها سنەیی (٩٣٢)

ناوی عبدالمجیدە، کوڕی مەلا طاهای کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەد قەسیمی گۆرانی یە خەڵکی (سنە)یە، باوکی هاتوتە (بەغدا) مامۆستا عبدالمجید لەوێ پەروەردە بووە، ساڵی ١٢٨٧ك – ١٨٧٠ز ئیجازەی لە مەلا حوسێنی پشدەری وەرگرتیە، کرایتە (مدرس) لە مزگەوتی حەسەن پاشا، دوایی لە مزگەوتی (الوزیر) لە گەڕەکی ڕەصافە لە بەغدا دەرسی دەدا، هەروەها قازی بوو لە: (حلە) و (کەربەلا) و (دیوانیە) و چەند شارانی تورکیا، مامۆستا لە بەغدا ناسرابوو بە (خۆشنووس)، ساڵی ١٢٩٢ك وەضع و ئیستیعارەی مەلا ئەبوبەکری میرڕۆستەمەی نووسیيەوە، ساڵی ١٢٩٩ك (تهذیب المنطق)ی نووسیيەوە، لە ١٢٩٨ك شەرحی (منظومة الدرر الغرر)ی سەید مەحمود ئەفەندی ئالوسی کردیە لە بابەت فەرائیز بە زمانی تورکی، پێشکەشی بە سوڵتان عبدالحمیدی عوسمانی کردیە، لە ٩/٥/١٩٢٧ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: بوژاندنەوە ٣/١٩٨، ٤/١٦٤–١٦٧، ٦/٣٣٠.

## عبدالمجید محەممەد بەدلیسی (٩٣٣)

ناوی عبدالمجیدە، کوڕی مەلا محەممەدی (بەدلیسی)یە، لە گوندی (بێساران) هاتوتەدنیا دەستی بە خوێندن کرد، ماوەك لە تەکیەی شێخ مەلا صبغةالله ی ئەرواسی بوو، پاشان تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ خەلیفە سەلیم وەرگرت، دوایی لەبەر زۆرداری حکومەتی تورکیا باری کرد، چووە (دیمشق) لە مزگەوتی مەلا قاسم لە گەڕەکی کوردان، دەستی کرد بە دەرسدانەوە و فەتوادان، یەك لە قوتابییەکانی مەلا شێخ ئەحمەد کفتارۆ بوو، هەروەها لە مزگەوتی سەعید پاشا وتارخوێن بوو، لە قوتابخانەکانی ئامادەیی شەرعی دیمشق دەرسی دەدا، ساڵی ١٩٦٧ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی مەولانا خالیدی شارەزوری بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: معجم أعلام الکورد ٤٤٤.

## عبدالمجید محەممەد خانی (٩٣٤)

ناوی عبدالمجیدە، کوڕی محەممەدی کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالله یە، ساڵی ١٢٦٣ك – ١٨٤٧ز لە (دیمشق) هاتووتەدنیا، هەر لەوێ پێگەیشتووە، زانایەکی نووسەر و مێژوونووس و شاعیر بووە، سەفەری (ئەستانە)ی کرد، ساڵی ١٣١٩ك – ١٩٠١ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: چەند کتێبی داناون، لەوانە: (الحدائق الوردیة في حقائق أجلاّء النقشبندیة): ساڵی ١٣٠٦ك تەواوی کردووە، و (سبع مقامات) و (وجه الحل من جهد المقل) و (دیوانی شیعر).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ٦/١٧٠.
٢. هدیة العارفین ١/٦٢١.
٣. إیضاح المکنون ١/٣٩٦.
٤. معجم أعلام الکورد ٤٤٤ – ٤٤٥.

## عبدالمجید مەردان قوطب (٩٣٥)

ناوی عبدالمجیدە، کوڕی حاجی مەردانی کوڕی مەلا محەممەد ئەفەندی قوطبە، دایکی (ڕەحما) خانە کچی محەممەد سەعیدی ئەفەندییە، لە نەتەوەی ئیمامی عوسمانە (خوا لێی ڕازی بێ)، ساڵی ١٣٢٤ك – ١٩٠٦ز لە کەرکوك هاتووتەدنیا، لە بنەماڵەیەکی ڕوو لە ئایین پەروەردە بوو، دەستی کرد بە قورئانی پیرۆز بەشێکی زۆری لەبەر کرد، دوایی لە چەند شوێنان خوێندنەکەی بردەسەرە: ماوەك لای مەلا سولەیمان سالم و ماوەك لە لای مەلا ناصیح محەممەد لامیع، زۆربەی خوێندنی لە لای ئەو دووانە بوو، لە خزمەت مامۆستای دووەم ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: ساڵی ١٩٢٨ز کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی شێخ نوری لە (کەرکوك)، هەر لەو شوێنە لە ١٥ی ڕەمەزانی ساڵی ١٩٣٠ز حاشیەی مەلا سولەیمانی سەر

گەلەنبەوی ئادابی نووسییەوە، وە لە ١٩ی ڕەمەزانی هەمان ساڵ هۆنراوەی ئیستیعارەی مەلا سولەیمانی نووسییەوە، سەرەتایەکەی ئەوەیە:

وبعد يا طالب البيان يا مغرما في طلب المعاني

خذ من (سليمان) نظيما جعلا لجيد بلقيس بلاغة حلا

هەروەها خۆم نوسخەکی کەمالی شەرحی شافییەم دیت، لە لای مەلا عومەری پێش نوێژی مزگەوتی شێخەرەشکە لە هەولێر خەتی مامۆستای قوطب بوو، مامۆستا عبدالمجید لە مزگەوتی شێخ نوری، چووە مزگەوتی حاجی خەلیل ئاغا، ساڵی ١٩٣٠ز کرا ئەندامی کۆڕی زانیاری لە کەرکوك، ساڵی ١٩٣٦ز کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن و (مدرس) لە مزگەوتی حەیدەر پاشا، دوایی کرا بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئاینی، ساڵی ١٩٥٨ز گەڕاوە مزگەوتی خەلیل ئاغا، ساڵی ١٩٥٩ز کرا سەرۆکی کۆڕی زانیاری، هەر لەو ساڵەدا چەند کاری نائەموار لە کەرکوك ئەنجام درا، مامۆستاش بەرگری کرد، بۆیە لە لایەن حکومەت دەستگیر کرا، ماوەك لە بەندیخانە بوو دوایی ئازاد کرا، ساڵی ١٩٦٤ز کرا بەڕێوەبەری پەیمانگای ئیسلامی لە (کەرکوك)، ساڵی ١٩٧٥ز پەیمانگەکە داخرا، مامۆستا هاتە مزگەوتی (نەعمانی) نوێ، دوایی تەمەنی گەیشتە کاتی خانەنشینی بڕیارێکی کۆماری تایبەت بۆ مامۆستا دەرچوو، کە بەردەوام بێ لەسەر فەرمانبەری، تا لە ژیان ماوە خانەنشین نەکرێ، لەبەر ئەو خزمەتە سەرتاسەرەی پێشکەشی کرد، بە گەلی ئیسلام و کورد.

خووڕەوشتی: زانایەکی زیرەك و بە توانا بوو، کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی چاك دەزانی ،ڕووخۆش و مەجلیس ئاوەدان بوو، مەلایان لە لای گرد دەبوونەوە هەرجار کتێبەکی دەدا دەست یەکەك دەیخوێندەوە، خۆشی مانای دەکرد، هەریەك ڕای خۆی دەردەبڕی، ئەو کتێبەی دەست نیشان نەکردبوو، بەڵام بە زۆری تەفسیری بەیزاوی بوو، تاکو مەجلیسەکەی پیرۆز بێ، مەلایەکان لە زانیاری دوورنەکەون، دنیا لە بیر بکەن، خەریکی ئایین بن، ئەی هاوار ئەو زانایە مەزنانە چیان لێ هات؟ ئەو مەلایە چاکانە، ئەو

هۆشمەندانە خۆیان باش بوون، خەڵکانیان دەیناوە سەر ڕێگای ڕاست، دکتۆری هەموو دەردانی دەروونی بوون.

(مامۆستای قوطب) شاعیرەکی چاك بوو، بۆ پەسەندکردنی کتێبی (بارانی ڕەحمەتی) مامۆستا عبدالکریمی (مدرس) ئەو شیعرەی نووسییە:

مەدحی پێناویَ زاتێکی وەك تۆ — تەئلیفەکانت شاهیدن بۆ تۆ
ئەوە دەلیلە کە مەلای چاکی — شاسوارێکی چوست و چالاکی
(أشهد بالله) پێت ئەلێم مەلای — لە ئیشی بی جێ بە خوا تەوەللای
هەرچی چاکەیە هەمووت تێدایە — مەلا واریسی ڕێی ئەنبیایە
با کۆتای بینین ئەم قسە و باسە — ڕێی بەتال لارە و ڕێگەی حەق راسە
دوو شاهید دەرچوو حەقیقەت ڕاست گۆ — بە شارەتیاندا، بە من و بە تۆ
تأریخی تەئلیف بێ گریَ و زەحمەت — {ڕژا بسردا بارانی رحمت}

١٣٧٩ك

کۆچی دوایی: لە بەرواری ٢٥/٤/١٩٨٦ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی شێخ محیەدین نزیك تەکیەی طالەبانی بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/١٢٤ – ١٢٥.
٢. بنەماڵەی زانیاران ٦١١.
٣. سەدەیەك تەمەنی نورین ١٢٠.
٤. نامەی مەلا مەحمود عەزیز شێخ بزێنی.

## عبدالمحسن سولەیمان گۆران (٩٣٦)

ناوی عبدالمحسنە، کوڕی سولەیمانی گۆرانی یە، مەزهەبی شافیعی بووە، لە ڕەوضەی خۆشەویست (د.خ) دەرسی داوە، تەفسیری قورئانی پیرۆزی هەیە، بەناوی: (جامع الأسرار)، لە دەوری ساڵی ١٠٤٠ك – ١٦٣٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. كشف الظنون ١/٥٣٤.

٢. هدية العارفين ٥/٦٢١ – ٦٢٢.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٦٨.

٤. معجم المؤلفين ٦/١٧٢.

٥. معجم أعلام الكورد ٤٤٥.

## عبدالمحسن یەعیش حەڕانی (٩٣٧)

ناوی عبدالمحسنە، کوڕی یەعیشی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی یەحیایە، خەڵکی (حەڕان)ە، زانایەکی شەرع زانی مەزهەبی حەنبەلی بووە، یەکەم جار لە (حەڕان) دەستی کرد بە خوێندن، دوایی بۆ ئەو مەبەستە چووە (بەغدا)، ماوەك لەوێ بوو، گەڕاوە (حەڕان)، ساڵی ٦١٠ك چووە (حەج)، هاتەوە (بەغدا) ماوەك لەوێ دەرسیداوە، گەڕاوە (حەڕان) لە ٦١١ك – ١٢١٤ز بە گەنجی جوانەمەرگ بوو.

سەرچاوەکان:

١. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/٨٢.

٢. معجم أعلام الكورد ٤٤٥.

٣. شذرات الذهب ٥/٤٧.

## عبدالمطلب مورتەضا جزیری (٩٣٨)

ناوی عبدالمطلبە، کوڕی مورتەضای حوسەینیە، خەڵکی جزیرەیە، زانایەکی شەرع زان و نەحوزان بووە، زانایەکانی شاری (موصل) دەرسیان لەلا دەخوێند، لەسەر دەستی ئەو ئیجازەیان وەرگرتووە، کتێبی (ضوء الدرر في شرح ألفية ابن معط) لە نەحو داناوە، لە دەوری ساڵی ٦٥٠ ك – ١٢٥٢ز هاتووتەدنیا، لە ٧٣٥ك – ١٣٣٤ز کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٦/١٧٦.

٢. کشف الظنون ١/١٥٥.
٣. هدية العارفين ١/٦٢٢.
٤. الدرر الکامنة ٢/٢٥١.

## عبدالملك ئیبراهیم قەرمەسینی (٩٣٩)

ناوی (عبدالملك)ە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی ئەحمەدی کوڕی حوسێنی (قەرمەسینی – کەرمانشا)یە، لە مانگی صەفەری ساڵی ٣٠٧ک –٩١٩ز لە (بەغدا) هاتووتەدنیا، زانایەکی بە دین و بڕواپێکراو بووە، لە لایەن چەند مامۆستایان دەرسی خوێندووە، پاشان خۆی دەرسی دەدا، لە مانگی شەووالی ساڵی ٣٧٥ک – ٩٨٦ز لە بەغدا کۆچی کرد.

سەرچاوە: الأنساب ٤/٤٥٩.

## عبدالملك سەعید دەربەندی (٩٤٠)

ناوی (عبدالملك)ە کوڕی سەعیدی کوڕی حەسەنە، لە مانگی شەعبانی ساڵی ٧٤٩ک – ١٣٤٨ز هاتووتەدنیا، مەزهەبی شافیعی بووە، دەرسی لە لای نور عبدالرحمانی بەغدایی خوێندووە، سەفەری بۆ (مەککە) و (مەدینە) و (قودس) و (یەمەن) کردووە، چەند ئیجازەی مەلایانی داوە، زاتەکی بە دین و خواناس و پڕ خێر و بەرەکەت بووە، ئاگاداری لە شەریعەت و تەسەووف هەبووە، هەروەها زانیاری لە (مێژوو) بووە، لە ٢٣ی جیمادی یەکەم، ساڵی ٨٢٤ک – ١٤٢١ز لە (مەککە)ی پیرۆز کۆچی دوایی کرد، وە هەر لەوێ لە گۆڕستانی (موعەللا) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:
١. مشاهیر الکورد ٢٩٦.
٢. معجم أعلام الکورد ٤٤٧.

## عبدالملك عبدالقاهر حەڕانی (٩٤١)

ناوی عبدالمليکە، کوڕی عبدالقاهیری کوڕی عبدالغنی یە، خەڵکی (حەڕانـە) لـە مانگی مەولودی ساڵی ٦٤٦ك – ١٢٤٨ز هاتووتەدنیا، لە لای چەند زانایانی خوێندووە، ئیجازەی وەرگرتووە، لە مانگی ذیالقعدەی ساڵی ٧٢٠ك – ١٣٢٠ز کۆچی کرد.

سەرچاوە: الدرر الکامنة ٢/٤١٥.

## عبدالملك عیسا مارانی (٩٤٢)

ناوی (عبدالملك)ە، کوڕی عیسای کوڕی درباسی مارانی یە، ساڵی ٥١٦ك – ١١٢٢ز لە (مروج) هاتووتەدنیا، مروج: دەشتێکە لە خوار کێوی مەقلوب سەر بە (موصل)ە، لە (حەلەب) و لە (میصر)ی خوێندیە، لە مەزهەبی شافیعی شارەزابووە، زۆر خەریکی زانیاری فەرموودەی پێغەمبەر بوو (د.خ)، ساڵی ٥٦٦ك – ١١٧٠ز صەلاحەدینی ئەیوبی کردیە سەرۆکی قازیەکانی میصر و دەوروبەری، مامۆستای فەرموودەناس (منذري) یەکە لە فەقێیانی ئەو زاتە، مامۆستا ناسرابوو بە زاتەکی بەدین و پیرۆز، بۆ بەرەکەت شمەکیان دەبردە لای نەخۆشان تا چاك ببنەوە، لە ٦٠٥ك – ١٢٠٨ز لە میصر کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. البدایة والنهایة ١٣/٥٤.
٢. مشاهیر الکورد ٢/٥٢.
٣. وفیات الاعیان ٢/٤٠٦ – ٤٠٧.
٤. سیر أعلام النبلاء ١٢/٥٧٦.
٥. إنباه الرواة ٣/١٩٢
٦. معجم أعلام الکورد ٤٤٧.

## عبدالمنعم عبدالوهاب حەڕانی (٩٤٣)

ناوی عبدالمنعمە، کوڕی عبدالوەهابی کوڕی سەعدی کوڕی صەدەقەی کوری خضری کوڕی کولەیبی (حەڕانی)یە، ساڵی ٥٠٠ك – ١١٠٦ز لە بەغدا هاتووتەدنیا. دەرسی لە لایەن مەلا چاکەکانی ئەو سەردەمی خوێندیە، لەگەڵ ئەوە خەریکی بازرگانی بووە، زور دەوڵەمەند بووە، سەدو چل کارەکەری هەبووە، ماوەك لە (دیمیاط) دانیشتووە. حەوت جاران چوویتە حەج، شەوی دووشەمەی ١٧ی مانگی مەولود، ساڵی ٥٩٦ك – ١٢٠٠ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی ئیمامی ئەحمەد، بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. الذیل علی طبقات الحنابلة ٤/٤٥٧ – ٤٥٨.
٢. تأریخ أربیل ١/٢٨٣ – ٢٨٤ /٢/٤٧٤.
٣. شذرات الذهب ٤/٣٢٧.
٤. سیر أعلام النبلاء ١٢/٤٥٩.
٥. وفیات الاعیان ٢/٣٩٤.
٦. أربیل في العهد الاتابکي ٢٧٢.

## عبدالمنعم عەلی حەڕانی (٩٤٤)

ناوی عبدالمنعمە، کوڕی عەلی کوڕی نەصری کوڕی مەنصوری کوڕی هبةالله‌ی حەڕانی یە، ساڵی ٥٧٨ك – ١١٨٢ز بۆ خوێندن چووە (بەغدا)، ماوەك لەوێ بوو، گەڕاوە (حەڕان)، لە ٥٩٦ك – ١١٩٩ز دووبارە گەڕاوە (بەغدا)، ئەمجارە هەردوو کوڕەکانی خۆی: عبداللطیف و عبدالعزیزی لەگەڵ بوون، بە تیر و تەسەلی چووە ناو بابەتەکانی زانست، لە چەند کۆڕان بەشدار دەبوو، دەمەتەقەی لەگەڵ چەند زانایانی ئەو سەردەمی دەکرد، زاتەکی زمان پاراو و قسەخۆش و بێ فیز بوو، ڕاست گۆ و بەدین و بەوێر بوو، پاك و خاوێن بوو مامۆستا لەبەر ئەوەی لەگەڵ ئیبن تەیمییەی ووتارخوێن و

سەرۆکی زانایانی (حەران) ناریك بوو، باری کرد لە حەڕان بۆ (بەغدا) لە ٦٠١ك - ١٢٠٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/٣ - ٤.

٢. معجم المؤلفین ٦/١٩٤.

٣. معجم أعلام الکورد ٤٤٨.

٤. الذیل علی طبقات الحنابلة ٤/٣٦ - ٣٨.

## عبدالمنعم نەجیب حەڕانی (٩٤٥)

ناوی عبدالمنعمە، نازناوی (ئەبومحەممەد)ە، کوڕی نەجیبی کوڕی عبداللطیفی کوڕی عبدالمنعمی کوڕی (صیقل)ی (حەڕانی)یە، ساڵی ٦٠٨ك - ١٢١١ز هاتووتەدنیا، دەرسی لەلای ئیبن تەیمیە خوێندووە، لە مانگی شەعبانی ساڵی ٦٩١ك - ١٢٩٢ز لە شاری (ئەسکەندەریە) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الذیل علی طبقات الحنابلة ٤/٤٦٣ - ٤٦٤.

## عبدالواحد صەدەقە حەڕانی (٩٤٦)

ناوی عبدالواحیدە، کوڕی صەدەقەی کوڕی ئەبوبەکری کوڕی محەممەدی کوڕی یوسفی کوڕی عبدالعزیزی (حەڕانی)یە، مەزهەبی شافیعی بووە، ساڵی ٧٧١ك - ١٣٦٩ز لە (حەلەب) هاتووتەدنیا، لە خزمەت باپیری سونەنی دارەقوطنی خوێند، پاشان خۆی دەرسی دەداوە، زاتەکی ڕوو لە خێر بوو، بەردەوام بوو لەسەر جماعەت، خۆڕاگربوو، فەرموودەی پێغەمبەری (د.خ) بەلاوەکردەوە، هاتووچۆی خەڵکانی نەدەکرد، زۆربەی ژیانی لەماڵەوە دەبردەسەر، خەریکی خواپەرستی بوو، ساڵی ٨٦٢ك - ١٤١٥ز کۆچی دوایی کرد، لەو کاتە باوکی لە ژیاندا بوو.

سەرچاوە: الضوء اللامع ٥/٨٦.

## عبدالواحد عبدالصمد بالکی ( ٩٤٧ )

ناوی عبدالواحیدە، کوڕی مەلا عبدالصەمدە، ساڵی ١٣٠٣ك – ١٨٨٥ز هاتووەتەدنیا، لە گوندی (بالك) لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، لە قۆناغی کۆتایی چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادری (مدرس)، ماوە لەوێ تا ئیجازەی وەرگرت. لەو ماوەی لەوێ بوو لە لایەك دەیخوێند، لە لایەك دەرسی دەدا، یەك لە فەقێیەکانی ئەو مامۆستا عبدالکریم (مدرس) بوو، مامۆستا عبدالواحید لە دەوروبەری ساڵی ١٣٥٢ك – ١٩٣٣ز لە گوندی (ساوجی) نزیك (پێنجوێن) کۆچی دوایی کرد، مەلا ئەحمەدی کوڕی جێگری بوو.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٦٨.

## عبدالواحد عبالقادر دارەتوویی ( ٩٤٨ )

ناوی عبدالواحیدە، کوڕی عبدالقادری کوڕی ئیسماعیلە، ساڵی ١٩٢٣ز لە گوندی (دارەتوو)ی نزیك (هەولێر) هاتووەتەدنیا، لە لای مەلا سەعیدی باغمرەیی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی لە چەند حوجرەی فەقێیان قۆناغی سوختەیی بڕی، گەڕاوە (باغمرە) لای مەلا سەعید، ماوەك چووە (هەرەجە)ی گەورە، لای مەلا مەحمودی (راجی)، چووە (سورێژە) لای مەلا عبدالقادر، چووە (پیرداود) لای مەلا سەید محەممەد، پاشان چووە (هەولێر) مزگەوتی حاجی عبدالقادر دەباغ، لای مەلا عبدالله ی بێتواتەی ماوە تا ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە (دارەتوو)، دوایی چووە (دوازدەهەوار)، دوایی چووە (جێژنیکانی) عەرەب لە ناوچەی بەڕانەتی، دوایی چووە (گردەچار)، دوایی چووە (کەلوڕ)، دوایی چووە (ترکەلان)، پاشان کرا پێش نوێژ و وتارخوێن لە (سولەیمان بەگ)، مامۆستا زاتەکی ڕووخۆش و قسەخۆش و سەخی بوو، ساڵی ١٩٨٢ز لە (سولەیمان بەگ) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (دارەتوو) بە خاك سپێردرا، مەلا عبدالکریمی

کوڕی جێگری بوو، دوایی هاتە مزگەوتی قیبلەخوار لە (هەولێر)، ئێستا لە مزگەوتی (صەحابە)یە، خەریکی ئامۆژگاری خەڵکانە، خوا یاریکاری بی.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عبدالوەهاب ئەحمەد عێراقی (٩٤٩)

ناوی عبدالوەهابە، کوڕی ئەحمەد وەلیەدین ئەبوزەرعەی کوڕی عبدالرحیم حافیزی عێراقی کوڕی حوسێنی کوڕی عبدالرحمانە، لە خزمەت باوك و باپیری پەروەردە بووە، قورئانی پیرۆزی خوێند و لەبەری کرد، هەر لە خزمەت ئەوان چەند کتێبی خوێند، هەروەها لە لای زۆر زانایانی خوێند، ئیجازەی وەرگرت، کرا (قازی) ساڵی ٨١٨ك – ١٤١٥ز لە ژیانی باوکی دا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الضوء اللامع ٥/٨٦.

## عبدالوەهاب حوسێن دیاربەکری (٩٥٠)

ناوی عبدالوەهابە، کوڕی حوسێنی کوڕی وەلیەدینی دیاربەکری یە، ساڵی ١١٩٠ك – ١٧٧٦ز شەرحی (الرسالة الولدية)ی کردیە.

سەرچاوە: هدية العارفين ٥/٦٤٣.

## عبدالوەهاب زاکی حەڕانی (٩٥١)

ناوی عبدالوەهابە، کوڕی زاکی کوڕی جومعەیە، خەڵکی (حەڕان) ە، لە دیمشق دابەزیوە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، لە زانستەکانی عەرەبی و شیعر ئازا بووە، لە (بەغدا) دەرسی داوە، لە ٥ی مانگی ذی القعدە، ساڵی ٦٢٨ك – ١٢٣١ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی ژێر چیای (قاسیون) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/١٢٨.

٢. الذيل على طبقات الحنابلة ٤/١٧٧ – ١٧٨.

٣. معجم أعلام الكورد ٤٥٠.

## عبدالوەهاب عبدالقادر نەرگسەجاڕی (٩٥٢)

ناوی عبدالوەهابە، کوڕی شێخ عبدالقادری کوڕی شێخ عبدالرحمانی نەرگسەجاڕییە، دەوری ساڵی ١٣٣٠ك - ١٩١٢ز هاتووتەدنیا، لە نەرگسەجاڕ دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (ئەحمەد بڕندە) دوایی چووە (ئەبوعوبێدە) لای مەلا عابید، ساڵی ١٩٤٣ز گەڕاوە (نەرگسەجاڕ) لای مامۆستا عبدالکریمی (مدرس) کتێبانی: سیوطی و عبداللە یەزدی و ئادابی تەواوکرد، چووە (سلێمانی) لای شێخ عومەری قەرەداغی، ماوە تا ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (نەرگسەجاڕ)، تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عەلائەدین وەرگرت، دەستی کرد بە دەرسدانەوە و خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، ساڵی ١٣٦٦ك - ١٩٤٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٦٨ - ٣٦٩.

## عبدالوهاب وەهبی ئەرضرۆمی (٩٥٣)

ناوی عبدالوەهابە، ناسراوە بە (وەهبی خەیات) خەڵکی شاری (ئەرزەڕۆمە) لە (ئەرزنجان) دابەزیوە، سۆفی بووە، کتێبی (مفتاح الكنز) ی لە بابەت تەسەووف داناوە، ساڵی ١٢٦٤ك - ١٨٤٧ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٦/٢٣١.

٢. هدية العارفين ١/٦٤٣.

## عبدالوەهاب یوسف کوردی (٩٥٤)

ناوی عبدالوەهابە، کوڕی یوسفی کوردی یە، ناسراوە بە (پەنەوانی) مەزهەبی شافیعی بووە، لە دەوری ساڵی ٨٦٠ك - ١٤٥٦ز کۆچی دوایی کردووە، ئەو کتێبانەی داناون: (رفع الشك والمين في تحرير الفنين) و (قرة العيون في ترتيب نظم السبعة فنون) و (بلوغ الأمل في فن الزجل).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٦/٢٣١ – ٢٣٢.

٢. هدية العارفين ٥/٦٣٩.

٣. معجم أعلام الكورد ٤٥٠.

## عبدالهادی مزوری ئەتروشی (٩٥٥)

مامۆستا عبدالهادی ئەفەندی نەوەی مەلا یەحیای مزوریـە، یـەك بـووە لـە زانایـە مەزنەکانی سەردەمی خۆی، لە (ئەتروش)دەرسی فەقێیانی دەدا، چەند مەلای پێ گەیاندن و ئیجازەی پێ بەخشین، لەوانە: مەلا سەلیم مەلا عبـدالرحمان زاوێتـی لـە ١٩١٢ز کۆچـی دوایی کرد، گۆڕی پیرۆزی لە (ئەتروش)ە.

سەرچاوە: إسهام علماء کوردستان العراق ٢٦ – ٢٧ – ٢٨.

## عەبدۆ سولەیمان کوردی (٩٥٦)

ناوی عەبدۆیە، کوڕی سولەیمانە، لـە چیایەکانی (ئـەقراع) سـەر بـە (حەلـەب) دانیشتووە، مەزهەبی شافیعی بـووە، تەریقـەتی خـەلوَتی بـووە، زانایـەکی بـە دیـن بـووە، کەراماتی لێ دەگێڕنەوە: یەکێك دەڵێ چوومە زیارەتی شێخ عەبدۆ، دیـتم چـەند ولاغ لـە پێش دەرگای ئەو بەسترابوونەوە، لە دڵی خۆم گوتم بریا ئالیکم بۆ ولاغەکەی خۆم کڕیبا، دەترسم لەناو ئەو کۆمەڵە ولاغانە لە برسان بتۆپی، کـە چـوومە ژوورەوە یەکسـەر شـێخ فەرمووی: {ئەوە دەترسێی ولاغەکەت بتۆپی؟}، زانیم ئـەو شـێخە شـتێکی لـە لایـە، لـە ٩٤٤ك – ١٥٣٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٣٥ – ٣٣٦.

٢. مشاهير الكورد ٢٩٦ – ٢٩٧.

## عبیدالله ئەحمەد ڕەقی (٩٥٧)

ناوی عوبیدالله یە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی عبدالأعلیی، کوڕی محەممەدی کوڕی مەروانی (حەڕانی)یە، ساڵی ٣٦٤ك – ٩٧٤ز لە شاری (ڕەقە) هاتووتەدنیا، ساڵی ٣٨٦ك بۆ خوێندن چووە (بەغدا) لای ئەبو حامیدی ئەسفەرائینی، ماوەکیش لە (موصل) دەیخوێند، زاتەکی بڕواپێکراو و ڕاستگۆ بوو، لە ٤٤٣ك – ١٠٥١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. طبقات الشافعية الكبرى ٣/٢٠٦.

٢. اللباب ٢/٣٤.

٣. الأنساب ٣/٩١ – ٩٢.

## عبیدالله ئەسعەد حەیدەری (٩٥٨)

ناوی عوبیداللهیە، کوڕی ئەسعەدی کوڕی عبدالله ی کوڕی صبغةالله ی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی حەیدەری ماوەرانی یە، ساڵی ١٢٠١ك – ١٧٨٦ز هاتووتەدنیا، دەرسی لە خزمەت باوکی و مەلا عبدالرحمانی ڕۆژبیانی و مەولانا خالید و مەلا ئیبراهیمی بەرزنجی خوێندووە، موفتی حەنەفییەکان بووە، لە (بەغدا)، یەکەم خەلیفەی مەولانا بووە، خەلیفەکانی مەولانا لە بەغدا یەکەم جار تەریقەتیان لە مامۆستای حەیدەری وەردەگرت، دوایی مەولانا ئیزنی دەدان، مامۆستای حەیدەری زمان ڕەوان و شاعیر بوو، شیعری عەرەبی و تورکی و فارسی هەیە، باوکی زۆری خۆش دەویست، ساڵی ١٢٤٧ك – ١٨٣١ز بە دەردی تاعوون، لە شاری (بەغدا) کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی: دوو کوڕی هەبوو:

١. عبدالحەلیم: زۆر زیرەك بوو، لە تەمەنی پازدە ساڵیدا شەرحی نامیلکەی (خەطیبی) کرد، لە زانستی (بەیان) شێخ ئیبراهیم فەصیح دەڵێ: {بە منداڵی کتێبی ئاجرومییەم لەلا خوێند، هۆنراوەی خۆشی هەبوون، لەوانە یەکی بۆ باوکی دانا بە بۆنەی پیرۆزبایی پلەی موفتی}.

٢. عبدالحەکیم: ئەوەش زیرەك بوو، شاعیر بوو، بە داخەوە ئەو دووانەش بە گەنجی ماوەکی کەم پاش باوکیان کۆچی دوایی یان کرد.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٢١ – ١٣٠.
٢. یادی مەردان ١/٩٩ – ١١٦ – ١١٨.
٣. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/١٩٥.
٤. علماء ومدارس في أربیل ٥٥.

## عبیداللە سەربیری (٩٥٩)

مامۆستا عبیداللە، زانایەکی خواناس و بە دین بوو، ڕووخۆش و قسەخۆش بوو، لە قۆناغی کۆتایی لە مزگەوتی قەلاَت لە (هەولێر) لە لای مەلا ئەفەندی دەخوێند، لەگەڵ مەلا طەییبی دووشیوانی و شێخ عبدالکریمی ئۆمەراوە، ماوە لەوێ تا ساڵی ١٩٢٩ز ئیجازەی وەرگرت، بووە مەلا لە گوندی (سەربیر) ناوچەی سالەیی لای شێخ نەجمەدین، ماوەی چل ساڵان لەوێ بوو، خەریکی جێبەجێ کردنی کاروباری ئاینی، دەرسی فەقێیان، ئامۆژگاری خەڵکان بوو، بەڕێز شێخ عبدالقادری (سەربیر) زۆر باسی مەلا چاکی و پیاو چاکی و بە دینی ئەو زاتە دەکا، بەردەوام بوو لەسەر خزمەتی ئاینی پیرۆز، تا کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی گوندەکە بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. الإکلیل في محاسن أربیل ٣٣٧.
٢. چاوپێکەوتن لەگەڵ بەڕێز شێخ قادر سەربیر.

## عبیداللە سەعید بروجردی (٩٦٠)

ناوی عوبیداللە یە، نازناوی ئەبولحەسەنە، کوڕی سەعیدی کوڕی عبداللە قازی یە، خەڵکی (بروجرد)ە، لە (بەغدا) دانیشتووە، لای کۆمەڵێك زانای خوێندووە، دەرسی داوە، چەند کەسی پێگەیاندووە، دوای ساڵی ٣٧١ك – ٩٨١ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الأنساب ١/٣٤٧.

## عبیداللە صبغەاللە حەیدەری (٩٦١)

ناوی عوبیداللە یە، کوڕی صبغةاللەی کوڕی ئیبراهیمی حەیدەری یە، لە خزمەت باوکی خوێند لە کوردستان، هەر گەنج بوو کرا (مدرس) دوایی چووە (بەغدا)، عبداللە بەگی شاوی کچی خۆی پێدا، مامۆستا زانایەکی بە توانا بوو، دەرسی بە شێخ عبدالفتاح و شێخ موسای سومەیکی بەغدایی و سەید ئیبراهیمی بەرزنجی دەدا، وەڵامی پرسیارەکانی محەممەد ئەبوبەکری هیندی دایەوە، بەناوی (الأجوبة علی الأسئلة الهندیة)، حاشیەی لەسەر حاشیەی یوسفی ئەصەم لەسەر حاشیەی عیصامەدین لەسەر (جامی) هەیە، ساڵی ١٢٦١ك – ١٨٤٥ز کۆچی دوایی کرد، گۆیا شەهید کراوە بەڵام نازانم بەهۆی چ بووە.

کوڕەکانی: سێ کوڕی هەبووە:

١. عبدالسلام: موفتی شافیعیەکان بووە لە بەغدا، ئەدیب و مێژووناس بووە.
٢. ئەسعەد صەدرەدین: لە پێشدا باسمان کردووە.
٣. عبیداللە: بەناوی خۆی کرایەوە، ساڵی ١٢٣٣ك – ١٨١٧ز لە بەغدا مەقاصیدی نەوەوی نووسیتەوە.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٢٢ ، ١٢٣ ، ١٣١ ، ١٣٤ ، ١٤٦.
٢. غایة المرام ٢٦٣.
٣. بوژاندنەوە ٦/١٩١ ، ١٩٣ ، ١٩٥ ، ٢٨٤ ، ٢٨٧.
٤. بنەماڵەی زانیاران ٢٣٦ ، ٢٣٧ ، ٢٣٨ ، ٢٣٩.

## عبیداللە طاها نەهری (٩٦٢)

ناوی عوبیداللە یە، کوڕی سەید طاهای گەورەیە ئەویش کوڕی ئەحمەدە ناسراوە بە شەهابەدین، لە نەتەوەی شێخ عبدالعزیزی کوڕی شێخ عبدالقادری گەیلانی یە، لە

وەختی خۆی لە بەغدا هاتووتە (ئاکرێ)، یەك لە کورەکانی ئەو چوویتە کوردستانی سەرەوە، شوێنەکی بەناوی خۆی ئاوەدان کردیتەوە: (شەمسەدین)، پاشان ئەو ناوە بەرەبەرە گۆڕانکاری لێ کرا بووە: (شەمزین – شەمزینان)، سەید طاها خەلیفەی مەولانا خالید بووە، شێخ عبیداللە سالّی ١٨٢٠ز لە گوندی (نەهری) سەر بە (شەمزینان) هاتووتەدنیا، زاتەکی خواناس بووە، یەك بووە لە پیرەکانی (نەخشی – نەقشبەندی)، چەند خەلیفەی ناوداری هەبووە، موسولّمانان ڕێزیان لێ گرتووە، هەمیشە لە قسەی دەرنەچووینە، زانایەکی خاوەن بیر و هەست و ڕابووە، ڕۆشنبیر و شاعیر بووە.

دانراوەکانی: چەند دانراوی هەنە، لەوانە:

١. دیوانی کوردی.

٢. دیوانی فارسی.

٣. هۆنراوەی عەقائید: سەرەتایەکەی ئەوەیە:

تو بدان أی مسلم ایمان گزین واجب امد برتو کسب علم ودین

٤.هۆنراوەی (کفایة الإسلام)، ناسراوە بە (فەرض و سوننەت)، سەرەتایەکەی ئەوەیە:

حمدي بي حەد خداي یکتارا انکه جان داد عقل ودین مارا

شێخ عوبیداللە لە جەنگی نێوان ڕوسیا و تورکیا، زۆر یارمەتی لەشکری عوسمانیەکانی دەدا، دوایی شێخ کە داوای ئازادی بۆ کورد کرد، هەموو چاکەکانی شێخیان لە بیرە خۆ برد، بێ ئەمەکیان کرد، داواکاریەکانیان خستە پشت گوێیان، بە شتی نارەوایان ژمارد و لەقەلّەمیاندا، شێخ هەروەکو ڕێ نیشاندەر و مورشید بوو، هەمیشە پەرۆشی گەلەکەی خۆی بوو، کە لە ژێر ستەمکاری قاچار و تورکەکان دەچەوسانەوە، بۆیە لە دژی ئەو داگیرکەرانە بۆ ئازادبوونی کورد و کوردستان، سالّی ١٨٨٠ز لەشکرێکی ڕێکخست، بریتی بوو لە دوو صەد و بیست سەرکردە لە پیاوانی ئاینی و سەرۆك هۆزەکان، زۆرانی دلّسۆز لە ڕواندز و بادینان و شەمزینان و سابلاغ و ورمێ و

سەلماس و شنۆ لەو شۆڕشە بەشدار بوون، ماوەی دوو ساڵان شێخ لە خەباتدا بوو، بە مەبستی دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی، پایتەختەکەی شاری (موصل) بی، بەڵام بە داخەوە بەشێك لە سەرۆك عەشیرەتەکان بوونە پیاوی بێگانە، کورد هەروایە، وەکو قەندیل و چرایە، خۆی دەسووتێنێ و دەورەی خۆی ڕۆناك دەکا، دیتی یەك لێهاتوو هەڵکەوتووە، چاوی دەچیتە پشتی سەر زمانی لێ دەدا، ڕوسەکان و ئینگلیزەکانیش وایان دەزانی، ئازاد بوونی کورد لە بەرژەوەندی ئەوان نیە، بۆیە ڕوسیا سنووری خۆی لە لای قەفقاسەوە لەسەر لەشکری (شێخ) داخست، بە ناچاری گەڕانەوە (شەمزینان)، ڕوس لەگەڵ ئینگلیزەکان تورکیان هان دا بۆ ڕوخاندن و تێکدانی شۆڕشەکە، تورکە عوسمانیەکان بە ناوی وتوویژ شێخیان بانگ کرد، بۆ (ئەستەمبۆڵ) شێخ چوو، یەکسەر دەستگیریان کرد و هاویتیانە (زیندان)، پاش ماوەك قارەمانانە خۆی لە بەندیخانە ڕزگار کرد، گەڕاوە کوردستان، ساڵی ١٨٨١ز دووبارە بە فر و فێڵ دەستگیریان کردەوە، خۆی و ماڵ و منداڵەکانی دوورخرانەوە، بۆ (حیجاز)، لە شاری (مەککە)ی پیرۆز دەست بەسەر کران، ماوە لەوێ تا ساڵی ١٨٨٨ز کۆچی دوایی کرد، هەر لەوی بە خاك سپێردا، دوای خۆی شێخ محەممەد صەدیقی کوڕی جێگری بوو، دوای ئەو سەید طاهای کوڕی.

سەرچاوەکان:

١. یادی مەردان ١/٩٨.
٢. ژیناوەری زانایانی کورد لە جیهانی ئیسلامەتی ١٥٥ – ١٧٤.
٣. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/١٥٧ – ١٥٩.
٤. مشاهیر الکورد ٢/٥٤.
٥. تأریخ مشاهیر کورد / فارسی ٣/٥٤٦ – ٥٤٧.
٦. الأکراد في بهدینان ٧٨.
٧. معجم أعلام الکورد ٤٥٢ – ٤٥٣.

## عبیدالله عبدالملك شارەزوری (٩٦٣)

ناوی عوبیداللەیە، کوڕی عبدالملیکی کوڕی ئەحمەدی شارەزری یە، دەرسی لەلای (ابن الحاجب) و (الجوهري) خوێندووە، دوایی خۆی دەرسیداوە، زانایەکی بە تەمەن و زمان ڕاست و زمان ڕەوان بووە، لە لایەن زانایان بڕوایێکراو بووە.

سەرچاوە: المنتظم ١٠/٢٠٥.

## عبید محەممەد سعێرتی (٩٦٤)

ناوی عوبیدە، کوڕی محەممەدی کوڕی عەباسی کوڕی محەممەدی فەرمودەناسە، ناسراوە بە (تەقیەدین ئەبولقاسم) ساڵی ٦٢٢ ك – ١٢٢٥ز لە (ئەسعەرد) هاتوەتەدنیا، لە ٦٩٢ك – ١٢٩٣ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (السر المصون في ما يقال عند فتح الحصون)ی داناوە، کوڕێکی مەلای هەبووە ناو ئەحمەد: لە ٦٥٩ك – ١٢٦١ز هاتووتەدنیا، لە (قاهیرە) دانیشتووە، دەرسی فەرموودەی داوە، لە ٧٤٥ك – ١٣٤٤ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٦٣.
٢. مشاهير الكورد ٢/٥٣ – ٥٤.
٣. هدية العارفين ٥/٦٤٥.
٤. كشف الظنون ٢/٩٨٩.
٥. معجم أعلام الكورد ٤٥٢.
٦. شذرات الذهب ٥/٤٢١.
٧. معجم المؤلفين ٦/٢٣٥.
٨. إيضاح المكنون ٢/١١ – ١٢.
٩. الأعلام ١/٢٩٥ /٤/٣٤٢.

## عثمان ئەبوبەکر ئەبولفەضل (٩٦٥)

ناوی عوسمانە، کوڕی ئەبوبەکری کوڕی سەعیدە، ناسراوە بە (ئەبولفەضل) لە (هەولێر) هاتووتەدنیا، هەر لەوێ پەروەردە بووە، پاشان چوویتە (میصر) لەوێ ساڵی ٧٤٩ك – ١٣٤٨ز دەرسی فەرموودەی داوە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٢/٢٦٦.

٢. الإكليل في محاسن أربيل ١٨٠.

## عثمان ئەبوبەکر عثمان ئەفەندی (٩٦٦)

ناوی عوسمانە، کوڕی ئەبوبەکر ئەفەندی کچك مەلا کوڕی عوسمان ئەفەندی یە، ساڵی ١٢٤٢ك – ١٨٢٦ز لە (هەولێر) هاتووتەدنیا، لە قوتابخانەی خۆیان لە قەڵات دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە (بەغدا)، دوو ساڵ لە لای محەممەد فەیزی زەهاوی خوێند، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، گەڕاوە هەولێر چەند ساڵ لە مزگەوتی قەڵات دەرسی دا، پاشان کرا قازی (هەولێر)، هەروەها سەرۆکی دادگای (موصل)، دوایی چووە (کەرکوك)، دوایی کرا سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی ئەوقاف (موصل)، شیعری کوردی و عەرەبی وفارسی و تورکی هەیە، نامیلکەی شەریعەت و تەسەووف هەیە بە (تورکی)، ساڵی ١٢٩٧ك – ١٨٨٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. أربيل في مختلف العصور ١٥٠.

٢. علماء ومدارس في أربيل ٣٠.

## عثمان ئەبوبەکر عومەر ئەفەندی (٩٦٧)

ناوی عوسمانە، کوڕی ئەوبەکر ئەفەندی، کوڕی عومەرئەفەندی یە، ساڵی ١١٣٢ك – ١٧١٩ز هاتووتەدنیا، پاش تەواوکردنی خوێندنی ئیجازەی لە مەلا صالح

ئەفەندی حەیدەری وەرگرت، جێگری باوکی بوو لە جێبەجێ کردنی کاروباری ئاینی، ساڵی ١٢٢٢ك – ١٨٠٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماء ومدارس في أربيل ٢٧ – ٢٨.

٢. أربيل في مختلف العصور ١٣٢.

## عثمان ئەبو محەممەد حەڕانی (٩٦٨)

ناوی عوسمانە، کوڕی ئەبو محەممەدی کوڕی ئەبو قاسمی کوڕی خضری کوڕی عبدالمجیدی کوڕی حەسەنی کوڕی موفەرریجی کوڕی عەباسی جەڕانی یە، ساڵی ٦٣٧ك – ١٢٣٩ز هاتووتەدنیا، دەرسی لە لای یوسفی کوڕی خەلیل خوێندووە خۆشی لە (قاهیرە) دەرسی داوە، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٧١٢ك – ١٣١٣ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٢/٢٧٣ – ٢٧٤.

## عثمان ئەحمەد روستی (٩٦٩)

ناوی عوسمانە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی مەلا عبداللە یە، ناسراوە بە (گۆج) لە بەر ئەوەی دەستەکی گۆجە بوو، ساڵی ١٩١٧ز لە گوندی روستێ هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغی سوختەیی بڕی، چووە لای مەلا ئەحمەدی روستێ، ماوە تا شەرحی شەمسییەی تەواوکرد، چووە (سکتان) لای مەلا عبداللە، چووە (کانی دەربەند) مطولی لای مەلا ئەبوبەکری کۆیی خوێند، چووە (گەلالە) لای مەلا محەممەدی ڕەئیس کۆتایی پێهینا، ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە (مەرگە)، دوایی چووە (شێخ ئاودەڵ) لە پشدەر، دوایی باری کرد بۆ (وەلزە)، مامۆستا ناسرا بوو بە زیرەك، مەلای چاك، بێ فیز و بێ نەفس، ڕێزی دەگیرا، بەشداری کرد لە شۆڕش، دەوری سەرەکی هەبوو لە دامەزراندنی یەکیەتی زانایانی کوردستان، یەك بووە لە قازی یە شەرعییەکانی سەرۆك مەلا مصطەفای بارزانی داینابوون لە (گەلالە)، پاشان هاتە (هەولێر) لە مزگەوتی خەلیفە، لە گەڕەکی سیطاقان

کرا پێش نوێژ، بەردەوام بوو لەسەر دەرسدانەوە، تا ساڵی ١٩٩٠ز کۆچی دوایی کرد. مەلا حوسێنی کوری تا کتێبی (مختصر)ی خوێندووە، خوا بکا تەواوی بکا، جێگەی بابی بگرتەوە! ئامین!

سەرچاوە: دەستووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عوسمان ئەحمەد شەوەکی (٩٧٠)

ناوی عوسمانە، کوری مەلا ئەحمەدی کوری مەلا محەممەدی کوری مەلا عبدالقادرە، عەشیرەتی (گەردی)یە، شەوەك: گوندێکە دەکەویتە بن زورگی (سێنك) لە رووی رۆژئاوا، دەستی کرد بە خوێندن، بەشێوەی فەقێیانی کوردستان، گەڕا لە چەند شوێنان تا قۆناغی فەقێیەتی بری: لە قۆناغی موستەعیدی چووە (کۆیە) لای جەنابی مەلا عبدالله ی جەلی، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، پاشان بۆ بەرەکەت ئیجازەی تری لە شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا لە (پیرزین)، دوایی جەنابی شێخ ئەبوبەکر ناردییە (بەحرکە)، بە کاکل ئاغای سەرۆك عەشیرەتی گەردی گوت: ئەوە مەلایەکی چاکم بۆ ناردی، خزمەتێکی چاکی بکە، ئەویش رێزی لێنا، مەدرەسەی بۆ دانا، ناوبانگی مەلا چاکی رۆیشت، فەقێیان لە دووررا هاتن روویان تێکرد، چەند ساڵان دەرسی داوە، باری کرد بۆ (گردمەلا) ماوەکی کەم لەوێ بوو، گەڕاوە (بەحرکە)، دەستی کردەوە بە خزمەتی ئاینی پیرۆز، تاکو ساڵی ١٩٣٠ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (شەوەك) لای باب و باپیرانی بە خاك سپێردرا.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا ئەحمەدی ئاشۆکانی، مەلا صالحی کۆزەپانکەیی، مەلا عبدالله ی گراوی، شێخ طاهیری ئەتروشی، مەلا ئیسماعیلی سوسەیی، مەلا ئیسماعیلی جدیدەیی، مەلا مصطەفای ئاشۆکانی، مەلا عبدالله بەحرکەیی (بابم)، مەلا یوسفی سورچی، مەلا عبدالله ی بێتواتەیی، مەلا صادقی گاینجی، مەلا محەممەدی برادۆست، مەلا صابیری نازەنیی، مەلا محەممەدئەمینی گەلەژێری، مەلا ئیبراهیمی خەتێ، مەلا عبدالقادری

سێگردکانی، مەلا عوسمانی دۆلەزەی، مەلا عومەری سنجاوی، مەلا سەعیدی دووشیوانی، مەلا عبداللە ی کوڕی.

خووڕەوشتی: زاتەکی گران و سەنگین بوو، ڕێزدار بوو، سەخی بوو، کە نانی بۆ دەهاتە حوجرە بە تەنیا نەیدەخوارد، ئەگەر مێوانی نەبا بانگی فەقێیەکی دەکرد تا لەگەری بخوا، بە زۆری ئەو فەقێیە باوکم بوو، حەزی لە ئاواز و گۆتنی لاوك و حەیرانە و شیعری فەقێیان بوو، خەت و قەڵەمی نەبوو، بابم دەیفەرموو: بە مامۆستام دەگۆ: ئایا وشەی (زید) ڕۆژانە ئەوەندە جارە دووبارە دەکەیەوە، ئێستا لە پێش چاوتە، ئەوەندە نووسینی ئاسانە، چۆن لە لات زەحمەتە ؟ دەیفەرموو مەلا عبداللە سوودی نیە، من پیر بوویمە، تۆش درەنگ هاتووی وازبینە فێر نابم.

ئەو تاك تاك حاشیانەی لەسەر جمع الجوامع و بەیزاوی و شەرحی شەمسییە و سەیلەکوتی مەنتیق و کەمالی صەرف دەدیترێن ئەوانە خەتی مامۆستا نینە، بەلاّم لە سەر زمانی ئەو، فەقێیەکان نووسیتیان، کە بە عەرەبی ناودەبردرێن بە: (ئەمالی).

کوڕەکانی: مامۆستا سێ کوڕی مەلای هەبوو:

١. مەلا عبداللە: دوای کۆچی دوایی باوکی بووە جێگری، هەشت ساڵان لە (بەحرکە) مەلا بوو، دەرسی دەدا، کاروباری مەلایەتی ئەنجام دەدا، دوایی باری کرد بۆ گوندی (سیاو)، لەوێ چووە (پەرپیتان) ساڵی ١٩٥٠ز چووە سەفەری حەج، لەوێ کۆچی دوایی کرد.

٢. مەلا محەممەد: مەلا بوو لە گوندی (هەمزەکۆر)، دوایی چووە (ئۆمەرگومبەت) ساڵی ١٩٥٩ز کۆچی دوایی کۆرد، مەلا عبدالرحمانی کوڕی جێگری بوو، ئێستا لە هەولێرە.

٣. مەلا صابیر: مەلا بوو لە گوندی (شاوێس) نزیك (هەولێر) دوایی چووە (پیرزین) ساڵی ١٩٦٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٣/١٧.

٢. دەنگی زانا ٢٨ و ٢٩ / ١٩٩٩ز.

## عثمان ئیسماعیل کانیکەوەیی (٩٧١)

ناوی عوسمانە، کوڕی ئیسماعیلی کوڕی ئەحمەدی کوڕی فازیلی کوڕی حەسەنی کوڕی مەلا میرە، لە نەتەوەی بابا طاهیری هەمەدانی یە، ساڵی ١٢٢١ك - ١٨٠٦ز لە گەڕەکی دەرگەزێنی شاری (سلێمانی) هاتووتەدنیا.

دەستی کرد بە خوێندن، لە چەند قوتابخانان خوێندنەکەی بردەسەر، چووە خزمەت سیراجەدین شێخ عوسمانی تەوێڵەیی تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت، دوایی کرا (خەلیفە)، گەڕاوە شاری (سلێمانی) دەستی کرد بە ئامۆژگاری خەڵکان و دەرسی فەقێیان، کتێبی (جوهرة العرفان) ی بە عەرەبی دانا، دیوانی شیعری هەیە بە کوردی و عەرەبی وفارسی، ساڵی ١٣٠٧ك - ١٨٨٩ز کۆچی دوایی کرد، کە بە ژمارەی ئەبجەد لە پیتەکانی (قد فاز فوزا عظیما) دەردەچی، دوو کوڕی مەلای هەبوو: مەلا عەلی و مەلا صاڵح.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٨٠ - ٣٨١.

٢. بنەماڵەی زانیاران ٤٦٨ - ٤٦٩.

## عثمان ئەییوب سیوەرکی (٩٧٢)

ناوی عوسمانە، ناسراوە بە ئەبو ئەسعەد ئەفەندی کوڕی حاجی ئەییوب ئەفەندی یە، خەڵکی (سیوەرك)ی سەر بە (ئۆرفە)یە لە کوردستانی تورکیا، زانایەکی لێهاتوو بوو، موفتی شارەکە بوو، ڕێزیان دەگرت، لە لایەن حکومەت پێکرا بوو، هۆنراوەی مەولودی پێغەمبەری بە زمانی (زازا) دانا، پێشکەشی بە (جەلادەت عالی بەدرخان) کرد کە خاوەنی گۆڤاری (هاوار)ی کورد بوو، لە (دیمشق)، ئەویش لە ١٣٥٣ك - ١٩٣٤ز لە چاپی دا.

سەرچاوەکان:
١. مشاهير الكورد ٢٩٨ – ٢٩٩.
٢. معجم أعلام الكورد ٤٦١ – ٤٦٢.

## عثمان خالید ئاغا تەوێڵەیی (شێخ عثمان سیراجەددین) (٩٧٣)

شێخ عوسمان، کوڕی خالید ئاغای کوڕی عبدالله ئاغای کوڕی سەید محەممەدی کوڕی سەید دەروێشی کوڕی سەید مەعروفی کوڕی سەید جومعەی کوڕی سەید ظاهیرە، محەممەد دەروێشی باپیریان لە سەیدە نعێمەکانی لای چیای (حەمرین)ە، هاتووتە (هەورامان) لە (تەوێڵە) نیشتەجێ بووە.

(شێخ عوسمان) نازناوی سیراجەدینە، ساڵی ١١٩٥ك – ١٧٨١ز لە گوندی (تەوێڵە) لە بنەماڵەکی ماقوڵ و ڕێزدار هاتووتەدنیا، باوکی دەچێتەوە سەر ئیمامی حوسێن، دایکی دەچێتەوە سەر ئیمامی حەسەن، کەواتە لە هەردوولاوە سەیدی جەنە، بەڵام ناوی خۆیان بە سەید نەبردیە، تاکو نەوەکانیان پشت بە سەیدایەتی نەبەستن، تەنیا کردەوەی چاك مرۆڤی مسوڵمان دەڕازێنێتەوە، وەك فەرموودەی خوای گەورە: ﴿إن أكرمكم عند الله اتقاكم﴾، (الحجرات/ ١٣)، لە تەمەنی حەوت ساڵی دا ناردرا بەر خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، لەبەر زیرەکی کتێبە سەرەتاییەکانی زوو بە زوو تەواوکردن، لە لایێکەوە خەریکی خوێندن بوو، لە لایێ تر خەریکی یادی خوا و شەو نوێژ و تەسبێحات و ئادابی تەسەووف بوو، فەقێیاتی لە: (بیارە) و (خەرپان) و (خورماڵ) و (هەڵەبجە) کرد، کتێبانی (وەضع) و (ئیستیعارە) و (فەرائیز)ی لەگەڵ چەند نامیلکە بە دەستی خۆی نووسییەوە، پاشان تەسەووف و تەریقەت دڵیان بزافت و جووڵاند، بۆ ئەو مەبەستە پیرۆزە ڕووی کردە (بەغدا) لە مزگەوتی شێخ عبدالقادر دابەزی، ماوەك لەوێ خەریکی خواپەرستی بوو، ناوەناوەش خەریکی خوێندن و نووسینەوە بوو، لەو ماوەیە (سیوطی) و (فەنناری) تەواو کرد، هەر لەو ساڵە کە ١٢٢٦ك – ١٨١١ز (رسالة الشاه صديق الهراتي في شرح الكلام القدسي) نووسییەوە.

تەریقەت وەرگرتنی: هەر لەو کاتە مەولانا خالید لە هیندستان گەڕاوە، لە مزگەوتی شێخ عبدالقادر لە (بەغدا) دابەزی، شێخ عوسمان چووە خزمەتی، مەولانا لە پێشدا لە (تەوێڵە) دیتبوی دەیناسی، ڕێزی لێنا و خۆشی ویست، دیار نەبا دەی پرسی. ڕۆژەك شێخ عوسمان عەرزی کرد، قوربان حەزدەکەم بە قوتابی خۆتم وەربگری ئادابی تەریقەتم پێ ببەخشی، مەولانا ڕازی بوو، دەستی کرد بە دەرسدانەوەی، لە سەرەتای ساڵی ١٢٢٧ك شێخ گەڕاوە (سلێمانی) لەگەڵ مەولانا، دوو ساڵ لە مزگەوتی باباعەلی ماوە هەر پرسیارەکی لە دڵی دا بوو، ئاراستەی مەولانای دەکرد، ئەویش بۆی ڕۆن دەکردەوە، تا شارەزایی یەکی تەواوی لە تەسەووف پەیدا کرد، مەولانا بە خەلیفەی خۆی قەبوڵ کرد، ئەو یەکەم خەلیفە بوو لە کوردستان، وەك مەلا عبداللەی حەیدەری موفتی (بەغدا) یەکەم خەلیفە بوو لە عەرەبستان، لە کۆتایی ساڵی ١٢٢٨ك لەگەل مەولانا گەڕاوە (بەغدا)، ساڵی ١٢٣١ك لەگەڵ مەولانا چووە (سلێمانی)، دوایی لەگەڵ ئەو چووە (هەورامان)، ساڵی ١٢٣٦ك مەولانا چووە (شام) شێخ عوسمانی کردە جێگری خۆی لە خانەقای مەولانا لە (سلێمانی)، دوایی چووە (بیارە)، گەڕاوە (سلیمانی)، دووبارە گەڕاوە (بیارە)، ئەمجا چووە (تەوێڵە)، لەو هەموو شوێنانە داب و دەستووری تەریقەتی جێبەجێ دەکرد، زانایان مردیدان، لە عێراق لە کوردستان لە تورکیا لە ئێران دەهاتنە لای، هەریەك گۆلێك یا قومێك لە دەریای زانستیان وەردەگرت، لە کاتی گەڕانەوەیان بۆ وڵاتەکانیان، دەیان پرژاندە سەر دۆست و برادەران، لە پاش ساڵی ١٢٥٠ك – ١٨٣٤ز کوڕەکانی شێخ شان بە شانی باوکیان دەستیان کرد بە (ئیرشاد): شێخ محەمەد لە (تەوێڵە)، شێخ عبدالرحمان لە (بەغدا)، شێخ عومەر لە (بیارە)، شێخ ئەحمەد لە (ئەحمەدئاوا)، بۆیە جەنابی شێخ فەرمانی دروست کردنی خانەقای دا لەو هەموو شوێنانە.

لە دەوری ساڵی ١٢٧٠ك – ١٨٥٣ز (شێخ) بە یەکجاری (بیارە)ی بە جێ هێشت باری کرد بۆ (تەوێڵە)، خۆی و کوڕەکانی خەریکی ئیرشاد بوون، خەڵکان بە یەکجار ڕوویان تێ کردن، (شێخ) چەند مەلای چاکی هێنان، وەکو: مەلا حامیدی کاتب،

مەلا ئەحمەدی نۆدشەیی، مەلا سەید عبدالرحیمی مەولەوی، مەلا مەحمودی دشەی، ئەوانە زانیاری ئاینیان بە کوڕەکانی شێخ و صۆفی و مریدەکان نیشان دەدا، بە ڕاستی ئەو خانەقایە (زانکۆ)یەکی فراوان بوو، بۆ پەروەردەی قوتابی، بۆ دڵپاکی، بۆ تەسەووف، بۆ سەرکەوتن و دەستکەوتنی پلە و پایەی خواپەرستی و خواناسی، سوپاس بۆ خودا ئەو مەڵبەندە پیرۆزە بووە زار میفتاحی جۆگەلە و ڕوباری زانستی، هاشەی هاڕەی لە بن گوێی مرۆڤی موسوڵمان دەزرینگێتەوە هەتا هەتایی.

سیقەتەکانی: شێخ سیراجەدین زاتەکی خواناس و خواپەرست بوو، بە پێی شەریعەت دەڕۆیشت، دواکەوتووی ئارەزوی نەفس نەبوو، دنیاداری نەدەکرد، لە دەنگوباسی دنیا خۆی لادەدا، خەریکی یادی خودا بوو، دریغی نەدەکرد: شەوان ڕۆژان، لە ئامۆژگاری: خەڵکان، فەقێیان، سۆفیان، مریدان.

سەفەرەکانی:

١. چووە (سنە) بۆ سەردانی دۆستانی.
٢. دووبارە بۆ (سنە) بۆ پێکهێنانەوەی سەرکردە و ڕیش سپییەکان.
٣. بۆ (کۆیە) سەردانی ئەحمەد پاشای بابان.
٤. بۆ (سلێمانی) سەردانی محەممەد مونیب (متصرف)ی شارەکە.
٥. بۆ (ڕواندز) سەردانی محەممەد صادق خان ئەردەلانی.
٦. بۆ (دەکا شێخان) سەردانی غولام شاخان.
٧. بۆ سەرچاوەی (کەیەنە) و (حەوش و بەوران) لە ئێران.

کۆچی دوایی: شەوی سێ شەممە ١٣ی مانگی شەووال ساڵی ١٢٨٣ك – ١٨٦٧ز لە تەمەنی هەشتاو هەشت ساڵی دا کۆچی دوایی کرد، لە ناو باغەکەی خۆی لە دامەنی گوندی (تەوێڵە) سەر بە شارۆچکەی (هەڵەبجە) بە خاك سپێردرا، شێخ محەممەد بەهائەددینی کوڕە گەورەی بووە جێگری، چەند شاعیر بەو بۆنەیە هۆنراوەی کوردی و

عەرەبی و فارسییان نووسیوە، لەوانە: مەلا حامیدی کاتب بە (فارسی)، مەلا سەید عبدالرحیمی مەولەوی هەورامی بە عەرەبی، لە سەرەتاوە دەڵێ:

ألا ترى إلى التي بنُهيَتي ومُهجتي من غمّة البليّة

لونزلت منها على الثوابت أو السما لانتثرت وانشقّت

لە کۆتایی دا دەڵێ:

نهر صلاة وسلام جاريا من عين رحمة الى أن تمّت

کورەکانی:

١. عبدالحکیم: بە منداڵی کۆچی دوایی کرد.

٢. مەعروف: ساڵی ١٢٧٧ك – ١٨٦٠ز لە تەمەنی بیست وشەش ساڵیدا جوانەمەرگ بوو.

٣. شێخ محەممەد بەهائەدین: کورە گەورەی بوو، جێگری بوو.

٤. شێخ عبدالرحمان ئەبولوەفا: ساڵی ١٢٨٥ك – ١٨٦٨ز لە تەمەنی سی ودوو ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

٥. شێخ عومەر (ضیاء الدین): ساڵی ١٣١٨ك – ١٩٠٠ز لە تەمەنی شێست و سێ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

٦. شێخ ئەحمەد شەمسەدین: ساڵی ١٣٠٧ك – ١٨٨٩ز لە تەمەنی چل و سێ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

بەشێك لە خەلیفەکانی: مەلا حامیدی کاتب، شێخ حوسێنی هەورامی، شێخ ئیسماعیلی هەجیجی، مەلا ئەحمەدی نۆدشەی، مەلا مەحمودی دشەی، سەید شەهابەدین طالشی، مەلا فتح الله جوانرۆی، سەید عبدالرحیمی مەولەوی، شێخ محەممەد باقری سنەی، شێخ مصطەفای سەقزی، سەید عبدالکریم موکریانی، مەلا محەممەدی بانەی، مەلا عبدالکریمی هەڵەبجەی، شێخ سولەیمانی چنارەی، شێخ ئیسماعیلی بەرزنجی، شێخ عبداللەی قوطب، شێخ عبدالرحمانی قەرەداغی، مەلا عوسمانی باڵەخی، مەلا عومەری جلەموردی،

شێخ حەسەنی کەرکوکی، مەلا عومەری ئۆمەر گومبەتی، شێخ نەبی ماویلی، مەلا طاهای بالەکی، مەلا مەحمودی ڕواندزی، مەلا عەلی بێتواتەی، شێخ عەلی بالیسانی، شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی، شێخ محەممەد شێخی چۆلی، سەید حەسەنی ئەستەمبۆلی، عومەر ئەفەندی ئەنطاکی، مەلا محەممەدی سعێرتی، مەلا محەممەدی دیاربەکری.

سەرچاوەکان:


١. یادی مەردان ١/٨٧ – ٨٨ /٢/٧ – ٣٦.

٢. بنەماڵەی زانیاران ٣٩٦ – ٤٠٣.

٣. تأريخ السليمانية ٢٢٩ – ٢٣٠.

٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٧٦ – ٣٨٠.

٥. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢٠٢/٥ – ٢٠٥.

٦. خۆری ئیسلام ١٨/ ٢٠٠٢ز، ٣٥ – ٤٢.


## عثمان خضر دۆڵەزەیی (٩٧٤)

ناوی عوسمانە، کوڕی خضری کوڕی عبداللّٰەی کوڕی ئاریە، عەشیرەتی (سیان)ە ساڵی ١٩٠٣ز لە گوندی (دۆڵەزە) هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، لە چەند شوێنان قۆناغی سوختەیی تەواوکرد، لە قۆناغی موستەعیدی چووە (بەحرکە) لای مەلا عوسمانی شەوەکی، چووە (کەسنەزان)لای مەلا سەید خضر، چووە (بالیسان) لای مەلا شێخ طاها، پاشان چووە (کۆیە) لای جەنابی مەلا محەممەدی جەلی زادە، ماوە لەوێ تا ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: بووە مەلا، لە گوندی (هێبان)، پاشان گەڕاوە (دۆڵەزە) لەوێ دەستی کرد بە مەلایەتی و دەرسدانەوەی فەقێیان.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبدالمجیدی گراوی، مەلا صەدیقی گرمکی، مەلا محەممەدئەمینی سوێری، مەلا عەلی گۆمەگڕوی، مەلا سەیدی محەممەدی پیرداودی، مەلا

ئەحمەدی حاجی عەلی، مەلا صادقی فەرهادی، مەلا سەعیدی فەرهادی، مەلا عوسمانی بیرەعارەبان، مەلا عبدالرحمانی هەمزەکۆری.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٧٣ز کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی مەلای هەبوو ناو محەمەدئەمین: ئیجازەی لە مەلا صالحی کۆزەپانکەیی وەرگرت، بە داخەوە پێش باوکی کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماء ومدارس في أربيل ١٢٠.

٢. دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عثمان دارەقوتە (٩٧٥)

مامۆستا عوسمان، خەڵکی گوندی (دارەقوتە)ی سەرەوەیە، سەر بە پارێزگای (کەرکوك)، ئەو زانایە لە زانستی (ئەقڵی) شارەزابووە. چەند دانراوی هەیە:

١. الملتقط: مەنتیقە، سەرەتایەکەی (أما بعد: فان أول ما يجب على المكلف معرفة ذات الله و صفاته، والإستدلال بآياته) دەست پێ دەکا.

٢. نامیلکەی (الوضع)

٣. ئیستیعارە: سەرەتاکەی بە(والمجاز المفرد) دەست پێ دەکا، نوسخەکی کۆپیمان هەیە.

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٣/٤٠ – ٤٥.

## عثمان سولەیمان ئورمەوی (٩٧٦)

ناوی عوسمانە، کوڕی سولەیمانی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی خەلیلە، خەڵکی جزیرەی بۆتانە، مەزهەبی شافیعی بووە، ناسراوە بە عوسمانی کوردی ساڵی ٨٢٩ك – ١٤٢٥ز لە شاری (ئورمییە – ورمێ) هاتووتەدنیا.

لە منداڵییەوە چووە (جزیرە)، قورئانی پیرۆزی لەبەر کرد، شەریعەت و عەرەبی و مەنتیقی خوێند، کتێبانی: (الإيجاز) و (منهاج) و (محرر) و (حاوي) و (مغني) و (مراح)ی لەبەر کردن، پاش حەوت ساڵان چووە (شام)، لەوێ (منهاج) و (بوخاری) و (مسلم) و

(مەصابیح) و فەلسەفە و حیکمەتی لە شاری (حەلەب) خوێند، هەروەها (منهاج العابدین) و (إحیاء العلوم) و (مطول) و (شرح العقائد)، چووە (قودس) صەرفی خوێند، ساڵی ٨٨٣ك چووە سەفەری حەج، لە ٨٩٣ك دووبارە چۆوە حەج، مامۆستا زاتەکی پڕ خێر و دیمەن ڕێك و ڕیش سپی و جوان بوو، دەرسی ئوصول و تەفسیری (کشاف)ی دەداوە، ساڵە ٨٩٨ك – ١٤٩٢ز کتوپڕ گیانی لە دەستدا.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ٥/١١٥ – ١١٦.
٢. معجم أعلام الكورد ٤٥٦.
٣. مشاهير الكورد ٣٠١.

## عثمان شەمس دیاربەکری (٩٧٧)

ناوی عوسمانە، کوڕی شەمسی دیاربەکرییە، نازناوی فەخرەددینە، مەزهەبی حەنەفی بووە، چوویتە (دیمشق) شارەزای زانستەکان بووە، بە تایبەت لە (ئەقلی)، زمان ڕەوان و وتارخوێن بووە، لە مزگەوتی (ئومەوی) دەرسی داوە، خەتی خۆشبوو، لە مۆسیقا و مەقاماتی دەنگەکان شارەزا بوو، لە ڕۆژی دووشەمە ١٢ی مانگی مەولود، ساڵی ٩٤٤ك – ١٥٣٧ز لە تەمەنی حەفتا ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٨/٢٥٨.

## عثمان صالح موفتی (٩٧٨)

ناوی عوسمانە، کوڕی مەلا صاڵحی کوڕی مەلا عوسمانە، نازناوی (موفتی)یە، ساڵی ١٨٩٥ز لە (شەقڵاوە) هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (هیران) لای مەلا ئەحمەدی کۆیی نەحو و صەرف و بەلاغەی خوێند، پاشان ئاودیوی ئێران بوو چووە (سابلاغ) لای مەلا عبداللەی باڵەکی، دوایی چووە لای مەلا عبداللەی بورهانی (ئوصول) و (مەنتیق) و (کەلام)ی خوێند، گەڕاوە (هەولێر) لە مزگەوتی قەڵات لای مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی (ریازیات)ی خوێند ئیجازەی وەرگرت، بووە مەلا لە

(کەپەنك ڕەش)، دوایی چووە (سیساوە)، ماوەکی زۆر لەوێ دەرسیداوە، دوا عەمری گەڕاوە (شەقڵاوە)، ساڵی ١٩٧٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عثمان عبدالرحمان (ابن الصلاح‌ی شارەزوری) (٩٧٩)

مامۆستای پسپۆڕ و فەرمووودەناس، مامۆستای مامۆستایان، ناوی عوسمانە، کوڕی مەلا عبدالرحمان (صلاح الدین)ی کوڕی عوسمانی کوڕی موسای کوڕی تەقیەددینە، مەزهەبی شافیعی بووە، ساڵی ٥٧٧ك - ١١٨١ز لە گوندی (شەرەخان) کە ئێستا ناودەبردرێ بە (شیلەخان) چاوی خۆی هەڵێناوە لە دنیا.

خوێندنی: لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان لەسەر فەرمووودەی باوکی چووە (موصل) لای عیمادەدینی کوڕی یونس، دوایی چووە (خوراسان)، ماوەکی زۆر لەوێ لە لای زانایە چاکەکان ماوە، تا لە زانیارییەکانی فەرمووودەی پێغەمبەر (د.خ) شارەزابوو، چەند بەرگی لەسەر نووسی دوایی چووە (قودس) لە قوتابخانەی (ناصریە) کرا (مدرس) ساڵی ١٢٣٢ز چووە (دیمەشق)، لەو شوێنانە دەرسی دەداوە: (الرواحیة)، (دارالحدیث)، (ست زمرد خاتون).

پلەی زانیاری: ئیبن خەلەکان لە کتێبی (وفیات الأعیان) دەڵێ: {مامۆستای شارەزوری گەورەترینی خەڵکی سەردەمی خۆی بوو، لەو بابەتانە: تەفسیر، حەدیس، فیقە، زمانەوانی، ناوی پیاوانی حەدیس، یەك بووە لە مامۆستایانی خۆم}.

ئەسنەوی لە کتێبی (طبقات الشافعیة) دەڵێ: مامۆستایەکی بەرز بووە لە حەدیس و ئوصول و نەحو و تەفسیر، زۆر بە دین بووە، لەسەر ڕێگای پیاو چاکەکانی پێشی ڕۆیشتیە.

دانراوەکانی: (الأحادیث الکلیة) و (أدب المفتي والمستفي) و (حاشیة علی رسائل الغزالي) و (حاشیة علی وسیط الغزالي) و (الرحلة الشرقیة) و (فوائد الرحلة) و (نکت في علوم الحدیث) و (طبقات الشافعیة) و (صلة الناسك في صفة المناسك) و (الفتاوي): ساڵی

١٩٢٩ز لە میصر چاپ کرا) و (علوم الحديث): ناسراوە بە (مقدمة ابن الصلاح)، لە (هیند) چاپ کرا، ساڵی ١٩٧٢ز لە (مەدینە)ی پیرۆز چاپ کرا، وە لەبەر گرنگیەکەی لە زۆر شوێنی تر چاپ و بلاو کراوەتەوە.

کۆچی دوایی: کاتی بەیانی ڕۆژی چوارشەمە، مانگی ڕەبیعی دووەم، ساڵی ٦٤٣ك – ١٢٤٥ز ماڵئاوایی یەکجاری لە دنیا کرد، بەرەو بارەگای خودای گەورە هەوراز چوو.

سەرچاوەکان:


١. طبقات المفسرين ١/٣٧٧.

٢. معجم المؤلفين ٦/٢٥٧.

٣. وفيات الأعيان ٢/٤٠٨.

٤. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٤٢٨.

٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٧١ – ٣٧٣.

٦. طبقات الفقهاء ٨٤.

٧. البداية والنهاية ١٣/١٧١.

٨. هدية العارفين ٥/٦٥٤.

٩. طبقات الشافيعية / ئەسنەوی ٢/١٣٣.

١٠. كشف الظنون ١/٤٨.

١١. الأعلام ٣/٢٩٨ /٤/٣٦٩ /١٠/١٤١.

١٢. الأكراد في بهدينان ٨٣.

١٣. مشاهير الكورد ١/٧١ /٢/١٠ ، ١١ ، ٥٧ ، ٥٨.

١٤. المجموع ٨/٤٣٣ – ٤٣٤.

١٥. معجم أعلام الكورد ٤٢٦ – ٤٥٧ – ٤٦٠.

١٦. شەرەفنامە / پەراوێز ١٩٨.

١٧. شذرات الذهب ٥/٢٢١ – ٢٢٢.
١٨. التقييد والإيضاح ١/٥ – ٨.

## عثمان عبدالله خەطیب (٩٨٠)

ناوی عوسمانە، کوڕی عبداللّٰهی کوڕی محەممەدی کوڕی محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی غییاسە، نازناوی ئەبوعەمرە، ساڵی ٥٣٢ك – ١١٣٧ز هاتووتەدنیا، زانایەکی ئەخلاق چاك و مەجلیس خۆش بووە، لە زۆر وڵاتان گەڕاوە، گۆیا: لە سەرەتاوە پیاوەکی باش نەبووە، دوایی پەشێمان بوویتەوە تۆبەی کردووە، لە مزگەوتی گەورەی قەڵات لە جێگای مەلا محەممەدی برای وتارخوێن بووە، لە ٦٠٨ك – ١٢١١ز کۆچی کردیە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/١٦١.
٢. سير أعلام النبلاء ١٣ / ٢١١.
٣. تأريخ أربيل ١/ ٢١٤، ٢ / ٣٦٦.
٤. أربيل في مختلف العصور ٧٥.
٥. معجم أعلام الكورد ٥٩٢.

## عثمان عبدالله یابە (٩٨١)

ناوی عوسمانە، کوڕی عبداللّٰهی کوڕی حاجی عەزیزی کوڕی ئەحمەدی کوڕی خضری کوڕی عومەری کوڕی مصطەفای کوڕی ئەحمەدی کوڕی ڕەسولە، باب و باپیرانی کوێخا دێ بووینە، عەشیرەتی (ئورمزیار)ە، ساڵی ١٩١١ز لە گوندی (سمایلاوە)ی کەندێناوە، هاتووتەدنیا.

لە لای مەلا طاهیری قوشاغلوو دەستی کرد بە خوێندن، ساڵی ١٩٣٥ز کۆتایی پێ هینا، بووە مەلای (دۆغان)، دوایی چووە (میلی هۆرتێ)، دوایی چووە (سمایلاوە)، ناوبراو تەریقەتی قادری لە شێخ طاهیری بریفکانی وەرگرتبوو، زمانی فارسی و تورکی دەزانی، هەموو شەوان قورئانی پیرۆزی دەخوێند، زۆربەی کاتان خەریکی صەلاوەت

لێدان بوو، لە ٩/١٢/١٩٦٨ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی سەید عوبێد بە خاك سپێردرا، ئەحمەدی کوڕی فەرمانبەرە لە وەزارەتی تەندروستی، نامیلکەی حەج و ئامۆژگاری حاجیانی نووسیوە، چەند شیعری بابی لە لایە، بە نازناوی (مذنب).

سەرچاوە: نامەی حاجی ئەحمەد بابە.

## عثمان عبدالعزیز نەوڕۆلی (٩٨٢)

ناوی عوسمانە، کوڕی عبدالعزیزی کوڕی محەممەدی کوڕی مصطفایە، عەشیرەتی (نەوڕۆلی)یە، ساڵی ١٣٤١ك - ١٩٢٢ز لە گوندی (پڕێس) سەر بە (سلێمانی) هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، هەر لە لای ئەو ئیجازەی وەرگرت، دەستی کرد بە ئەنجامدانی کاری مەلایەتی، دەرسدانەوەی فەقێیان، ئامۆژگاری خەڵکان، سۆزی نەتەوایەتی لە دڵدا هەڵدەقولا، یەکگرتنی خەڵك و زانایەکانی ئیسلامی مەبەست بوو، بۆیە سەفەری دەردەوەی دەکرد، ساڵی ١٩٥٤ز چووە ڕیزی (إخوان المسلمین)، ساڵی ١٩٥٩ز، بەرگری شوعیەکانی کرد، بۆیە لە لایەن ڕژێمی (عبدالکریم قاسم) دەستگیرکرا، لەگەڵ مەلا صاڵحی ئامۆزای و مەلا عومەری برای دوور خرانەوە بۆ شاری (ناصریە)، پاشان بەهۆی لێبوردنی گشتی گەڕانەوە کوردستان، ساڵی ١٩٦٠ز بەشداری لە کۆنگرەی ئیسلامی (بەغدا) کرد بە سەرۆکایەتی مامۆستا محەممەد صەواف، ساڵی ١٩٧٤ز سەردانی (سعودیە)ی کرد، لەوێ چاوی بە مەلیك (فەیصەل) کەوت، ساڵی ١٩٧٧ز لە لایەن ڕژێمی بەعس دەستگیرکرا، ماوەك لە (سەماوە) و (رمیشە) دەستبەسەر بوو، لە ١٩٧٩ز دەستی کرد بە هەڵگیرساندنی کاری ئیسلامی، لە ١٩٨٦ز کرا ڕابەری کاری ئیسلامی لە کوردستان، تا ساڵی ١٩٨٧ کۆمەڵەکی چەکداری بەناوی (بزووتنەوەی ئیسلامی) پێکهێنا.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عەلی برای، مەلا صەدیقی برای، مەلا مصطەفای پێنجوێنی، شێخ عبدالعەزیز پارەزانی، شێخ باباعەلی قەرەداغی، شێخ خالیدی موفتی، مەلا عومەری یشاری، ئەحمەد کاکە مەحمود، مەلا عبداللطیف بامۆکی.

نووسینەکانی: مامۆستا هەرچەندە خەریك بوو بە ئیش و کاری ڕابەرایـەتی، بـەڵام نووسین و کتێبی هەمیشـە لـە یـاد بـوو، لـە بـیری نـەکردن، وەلای نـەنان، بانگـەوازی ئەندامەکانی دەکرد: {ئێمە بڕوایمان ئەشعەرییە، مەزهەبمان شـافیعی یـە}، بـەڵام لـە نـاو بزووتنەوە هەبوو گوێی بەو قسانە نەدا، وابزانم لەبەر ئەوەبوو دوایی وازی هێنا.

دانراوەکانی: مامۆستا چەند کتێبـی داناون، لەوانە:

١. الأسئلة والأجوبه في أصول الفقه: ساڵی ١٩٧٧ز لە هەولێر چاپ کرا.

٢. تەرجومەی (شبهات حول الاسلام)ی سەید قوطب.

٣. تەفسیری قورئانی پیرۆز بە کوردی، بەشێکی لە (سلێمانی) ساڵی ١٩٨٣ز چاپ کرا، پاشان نووسینگەی تەفسیر لە (هەولێر) دووبـارە چـاپی کـردەوە لـە پـازدە بەرگدا.

٤. شەرحی (بوخاری) بە کوردی.

٥. نامیلکەی (علوم القرآن).

لە ١٥/٥/١٩٩٩ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کرد، لـە گۆڕسـتانی گـوڵان لـە هەڵەبجە بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: إسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الإسلامية.

## عثمان عبدالکریم رەنگەڕێژانی (٩٨٣)

ناوی عوسمانە، کوڕی مەلا عبدالکریمە، خەڵکی گونـدی (رەنگەڕێـژانی) ئێرانـە، ئەوەش هەروەکو باوکی مەلایەکی باش و لێهاتوو بووە، دەرسـی لـەلای مـەلا ئیسـماعیل محەممەد داودا ئاغا خوێندووە، مەلا بووە لە گوندەکانی دەشتی (هەولێر)، پاشـان هاتووتـە (یەدیقزلـەر) لەوێ دەرسی فـەقێیانی داوە، تـا سـاڵی ١٩٣٤ز کۆچـی دوایـی کـردووە، کوڕێکی زانای هەبوو، ناو (مەلا شەریف): ساڵی ١٩٢٥ز لە دایك بوو، زانا و ڕۆشـنبیر بوو، بەڵام مەلایەتی نەکرد، دنیاش بە کەیفی ئەو نەهات، ساڵی ١٩٤٣ز تووشی بەندیخانـە

هات، دوای ماوەك خەریکی بازرگانی بوو، لەبەر دەستکورتی لەویش سەرکەوتوو نەبوو، لە ٢٨/٤/١٩٧٦ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: چەند دانراوی هەیە، لەوانە: (الاخوة العربیة الکردیة) و (چەند پارچە شیعر بە کوردی) و (لمحة عن الأکراد): تەرجومەیە لە فەڕەنسی بۆ عەرەبی و (ڕێزمانی کوردی): ئەویش تەرجومەیە لە فەڕەنسی بۆعەرەبی.

سەرچاوەکان:

١. إسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الإسلامیة ٢٦٥.
٢. علماء ومدارس في کوردستان ٩٤.

## عثمان عبدالکریم ماراني (٩٨٤)

ناوی عوسمانە، کوڕی عبدالکریمی کوڕی عیسای کوڕی درباسە، لە (میصر) نیشتەجێ بووە، زانایەکی مەزنی سەردەمی خۆی بووە، لە شیعر دەستی باڵا بووە، دیوانی هەیە، لە دەوروبەری ساڵی ٧٢٠ك – ١٣٢٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الکامنة ٢/٤٤١.
٢. معجم المؤلفین ٦/٢٥٧ – ٢٥٨.

## عثمان عبدالملك کوردي (٩٨٥)

ناوی عوسمانە، کوڕی عبدالملیکی کوڕی میصری شافعي یە، زانایەکی فەرموودەناس و شەریعەت و ئوصول زان بووە، دانراوی زۆرن، لەوانە: (شرح الحاوي الصغیر للقزویني) و (شرح بدیع النظام) و (شرح منتهی السول والأمل في علمي الأصول والجدل) و (شرح مختصر عبدالعظیم المنذري لصحیح مسلم)، لە ساڵی ٧٣٨ك – ١٣٣٧ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. کشف الظنون ١/٢٣٥ – ٥٥٨ – ٦٢٦ /٢/١٠٢٥ – ١٨٥٦.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٦٩ – ٣٧٠.

٣. معجم المؤلفين ٦/٢٦١.

٤. معجم أعلام الكورد ٤٥٦.

## عثمان علاءالدين بيارەيی (دووروو) (٩٨٦)

سیراجەدین شێخ عوسمان، کوڕی شێخ عەلائەددینی کوڕی شێخ عومەری کوڕی شێخ عوسمان سیراجەدینی گەورەیە، مورشیدی تەریقەتی نەقشبەندیە لە: (عێراق) و (ئێران) و (تورکیا) و (ئوردن)، ئەو زاتە ساڵی ١٣١٤ك – ١٨٩٦ز لە گوندی (سەف ئاباد) هاتووتەدنیا.

خوێندنی: دەستی کرد بە قورئانی پیرۆز و خەتمی کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، بەشێکی لە فارسی خوێند، زانستی عەرەبی لە لایەن مەلا سەید حوسێنی سابلاغی و مەلا عبدالکریمی خانەشووری لە قوتابخانەی (بیارە) و (دوو روو) بردەسەر، بۆ زانیاری تەسەووف لەژێر چاودێری باوکی بوو، هەر لە منداڵییەوە، پەروەردەی ویرد و زیکر و تەریقەت بوو.

پۆست نشینی: ساڵی ١٣٧٣ك – ١٩٥٣ز باوکی کۆچی دوایی کرد، لەسەر وەصیەتی باوکی و بڕیاری ئەو مرید و زانایانەی هاتبوونە سەرەخۆشی، شێخ عوسمان لە جێی باوکی دانیشت، دوای چەند مانگ پاش تاقی کردنەوەی ئەنجومەنی زانستی (سلێمانی)، بە ڕەسمی لە لایەن حکومەت، فەرمانی پۆست نشینی بۆ دەرچوو.

ڕۆیشتنی بۆ دەرەوە: شێخ عوسمان ساڵی ١٣٧٨ك – ١٩٥٨ز دڵتەنگ و ناڕەحەت بوو، لە (بیارە) باری کرد بۆ (دوو روو) لە ئێران، خانەقا و مزگەوت و قوتابخانەی دانا، باخێکی گەورەی دامەزراند، بەرووبوومەکەی تێرای میوانان و فەقێیان و مریدانی دەکرد، پاشان لە ناوچەکە ئاڵۆزی پەیدا بوو، گەڕاوە کوردستانی عێراق، ساڵی ١٩٧٩ز لە (بیارە) نیشتەجێ بۆوە، ساڵی ١٩٨٠ز شەڕی ئێران و عێراق دەستی پێ کرد، شێخ باری کرد بۆ (بەغدا) لەوێ مزگەوت و خانەقای دانان، ماوەك چووە (تورکیا)

ئەویش مزگەوت و خانەقای دروست کردن، چەند مریدی هەبوون لە هاولاتیان و کاربەدەستانی حکومەت ڕێزیان دەگرت ماوەك چووە (ئوردن) لەویش خەریکی ئیرشاد و ڕێ نیشاندان بوو.

سیفەتەکانی: (شێخ عوسمان) لە زانستی سەرەوە و ئاشکرا ئاگادار بوو، لە زانستی نهێنی تەسەووف دەستی بالا بوو، چەند کەسانی هینا سەر ڕێگەی شەرع و ئاین، بەو ئامۆژگاریانەی کە بریتی بوون لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) و باسە دڵتەزێنەکانی پیرانی نەقشبەند، چارەسەری دەردی نەزانی دەکرد، بە نشتەرگەری شەریعەت، چارەسەری دەردە پیسەکانی دووڕواتی و فیز و دەعیە و خۆهەڵکێشان و دووبەرەکی دووزمانی حەسوودی و چاوپیسی دەکرد، بە یادی خوا و زیکر و خواپەرستی و دڵپاکی.

شێخ عوسمان هەروەکو پسپۆڕی دەردە بزرەکان بوو، پسپۆڕی دەردەکانی ئەندام بوو، چەند نەخۆشی کوشندە دەهاتنە لای، بە داودەرمانی گیایەکانی چیای (هەورامان) چارەی بۆ دەدۆزینەوە.

شێخ عوسمان سەرەڕای ئەو زانیاریە بەهێزانە، زمان ڕەوان و نووسەر و شاعیر بوو، چەند شیعری پڕ تام و بۆی هەیە، بۆ نمونە:

یارەسولە الله زەلیلم، سا بە قوربان هیمەتێ

شەرمەزار و دڵبریندارم، بە قوربان هیمەتێ

تینوی دڵ ئاوەرینی، قەترەیێکی ڕەحمی تۆم

ڕێزە خوار و کەلبی دەرگاتم، بە قوربان هیمەتێ

بەحری زەخخاری (فَتَرْضَی) تۆی دوری یەکتایی حەق

موستەحەققی زەررەیێ لوتفم، بە قوربان هیمەتێ

نیمە توێشە و زادی ڕێ، بێ تاعەت و بێ توێشە خۆم

ناسزایە تۆشە بۆ دەرگای کەریمان هیمەتێ

مووی سپی رویی ڕەش و زەردم، ئەوا هێنا حوزور

قۆچی قوربانم، ئەوا قوربانە، قوربان هیممەتێ

تاجی شاهی و گەورەییتە، ئایەتی (ن والقلم)

مادیحی تۆیە سەراسەر، سیرڕی قورئان هیممەتێ

خۆ لە سینەی سینەتا، سیرڕی (ألم نشرح لك

صدرك) شەرحی دڵی تۆیە، بە قوربان هیممەتێ

(ربك يعطي فترضى)، تۆی ڕموزی کەنزی حەق

ئەی سوپا سالاری ڕەحمەت، تۆ و قورئان هیممەتێ

(ورفعنا لك ذكرك)، بۆ بلندی قەدری تۆ

زیکری تۆ ویردی دڵی زارم، بە قوربان هیممەتێ

ئەی شەهی (لولاك لولاك)، قابە قەوسەینت مەقام

تۆ و (سبحان الذي أسرى)، بە قوربان هیممەتێ

من سەگی کوێم نیمە قابیل وەسف و مەدحی تۆ بکەم

مادیحی تۆ جوبرەئیلە، پەیکی قورئان هیممەتێ

شاسواری عەرصەیی مەیدانی حەق ڕۆژی جەزا

تۆ مەبە غافیل لە (عوسمان)، سا بە قوربان هیممەتێ

{سرودی مەولود}:

ئەی خاتەمی پێغەمبەران، ئەی ڕێنومای کۆڵنە دەران

ئەی سەروەری گشت سەروەران، درودی زۆری خوات لەسەر

پێغەمبەریت و ڕەهبەری، تاجی سەریت و سەروەری

تۆ ئەنوەر و مونەووەری، واتە و کەلامی تۆ شەکەر

بە قەد وەکو شمشادی تۆ، بە ڕوومەت و دڵشادی تۆ

ئازادی خواو ئازادی تۆ، عالەم فیدات بێ سەر بە سەر

بە زاتی خوا قەسەمتدەدەم، لە تۆ قوربان تکا ئەکەم

خۆشکە موسولمانان بەجەم، کە زۆر بڵاون و دەربەدەر

دانراوەکانی: (تفسیر سورة والتین) و (سراج القلوب) و (الشهاب الثاقب) و (الإعتقاد الرصین والیقین بالله) و (رسالة الرابطة).

کۆچی دوایی: جەنابی شێخ عوسمان دەیفەرموو: {بە خەیاڵم دانایێ خەم و خەفەت لەسەر سەروەت و سامانی دنیا بخۆم، بەلام خەم و خەفەتم ئەوەیە: لە نەتەوەی ئەو بنەماڵە کەسێك نیە خەریکی تەسەووف بی و بشێ ببیتە جێگر، تاکو خێری باب و باپیران نەبڕێ}، لە بەرواری شەوی پێنج شەمە ٢١ مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، ساڵی ١٤١٧ك – ١٩٩٧ز لە شاری (ئەستەمبۆڵ) ماڵئاوایی یەکجاری لە دۆستان و مریدان کرد، باروبارگەی خۆی تێکنا و بەرەو بارەگای پەروەردیگار، سەلاوی خوای لەسەر بی.

سەرچاوەکان:

١. یادی مەردان / پەراوێز/ ٢/٣١٥.

٢. بنەماڵەی زانیاران ٤١٩.

٣. عقد الجوهر ٢٠٩١ – ٢٠٩٥.

٤. گوڵزاری کوردستان ٦٦ – ٢٧٨.

٥. ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خواچوون / پەراوێز/ ٢٠٤.

٦. دەنگی زانا ٩٧ – ١٠٨/ ١٩٩٨ز.

## عثمان عەلی هوزبانی (٩٨٧)

ناوی عوسمانە، کوڕی عەلی کوڕی عوسمانە، نازناوی (نورەدینە) عەشیرەتی (هۆزبانی)یە، زانای شەریعەت بووە، زاتەکی چاك و چاکەخواز و دۆستی پیاوچاکان بووە، لە ٣ ی مانگی (محرم)ی ساڵی ٧٠١ك – ١٣٠١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الکامنة ٢/٢٦٩.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٧٥.

## عثمان عومەر ( ابن الحاجب ) ( ٩٨٨ )

مامۆستای نەحوزان، پسپۆر لە زانستی صەرف و ئوصول: ناوی عوسمانە، کوڕی عومەری کوڕی ئەبوبەکری کوڕی یونسە، نازناوی جەمالەدینە، مەزهەبی مالیکی یە، بابی سەرۆکی دیوانی ئەمیر عیزەدین موسەکی خالی صەلاحەدینی ئەیوبی بووە، بۆیە مامۆستا ناوبراوە بە: (ابن الحاجب)، باب و باپیرانی خەلکی (دەوین)ن، یاقوتی حەمەوی لە کتێبی (معجم البلدان) دەلێ: {دەوین: شارێکە لە کۆتایی سنووری (ئازربێجان) نزیك شاری (تەفلیس)، مەلیکە ئەیوبییەکان خەلکی ئەو جێگەیەنە}.

منیش دەلێم: {دیوین: گوندێکە لە ناحیەی (حەریر) پارێزگای (هەولێر)، دەکەوێتە دامەنی چیای (بێرەك) لەلای ڕۆژهەلات، دەکەوێتە سەر ڕێگایە کۆنەکەی سەردەمی حکومەتی عوسمانی کە لە (هەولێر) دەچوو بۆ (ڕواندز)، کە ئەو کاتە (رواندز) پایتەختی میری سۆران بووە، سەردەمی میر سولەیمان بەگی هەریری، ئێستاش قەلاتی میر محەممەد پاشای میری گەورەی لێ ماوە، لە دەوروبەری چەند بناغە و خرابە هەیە، دەلێن لە پێشدا شارەکی گەورەبووە، لەوێوە بۆ ڕۆژئاوا سنووری عەشیرەتی (زراری) دەست پێ دەکا، گۆڕی پیر ئەبوبەکری لێیە، جا نازانم ئەو دوو دیوینانە - دیوین ی ئازربێجان و دیوین ی هەولێر - کامیان لە کامیان کەونترە، وەکامیان بەناو ئەویتر کرایە، هەر چۆنێ بی مامۆستا (ابن الحاجب) زانایەکی مەزنی کوردە} عومەری باوکی لەگەل پاشایەکانی ئەیوبی چووە (شام)، دوایی هەر لەگەل ئەوان چووە (میصر) لەوێ لە شاری (ئیسنا) لە دەو نیلی (میصر) سالی ٥٧٠ك - ١١٧٤ز ئەو کوڕە لە دایك بوو.

خوێندنی: لە منداڵییەوە دەستی کرد بە خوێندن، لە شاری (قاهیرە) قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، دوایی خەریکی شەریعەت بوو لەسەر مەزهەبی ئیمامی (مالیك)، پاشان زانستەکانی عەرەبی تەواوکرد، لە زانیارییەکانی قورئانی پیرۆز باش شارەزابوو.

بەشێك لە مامۆستایەکانی: شێخ قاسمی شاطیبی، شێخ ئیبن بەننا، شێخ هبەالله ی بوصیری، شێخ ئەحمەدی غەزنەوی، شێخ غیاسی ئەبوجود، شێخ عەلی ئەبیاری، شێخ قاسمی عەلی دیمشقی، شێخ عەلی شازەلی.

مەلایەتی: لە شاری (دیمشق) کرا (مدرس)، دەرسی شەریعەتی مەزهەبی ئیمامی مالیکی دەداوە، هەروەها هاتووچووی: (قودس) و (غەززە) و (کەرك)ی دەکرد، پاشان گەڕاوە (قاهیرە)، لە قوتابخانەی (فاضلیة) دەرسی نەحوی دەداوە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: ئەبوبەکری رەضی، محەممەد بن مالیکی ئەندەلسی، ناصیرەدین بن مونیر، عبدالعظیم مونزیری فەرموودەناس، داودی مەلیك عیسا.

کۆچی دوایی: دوای (قاهیرە) چووە (ئەسکەندەریە) ماوەکی کەم لەوێ ماوە، رۆژی پێنج شەمە ٢٦ی مانگی شەووالی، ساڵی ٦٤٦ك – ١٢٤٩ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: (منتهى الوصول والأمل في علمي الأصول والجدل) و (مختصر المنتهى) و (جمال العرب في علم الأدب) و (عقيدة ابن الحاجب) و (المقصد الجليل في علم الخليل) و (المسائل الدمشقية) و (الكافية) و (شرح الكافية) و (الوافية في نظم الكافية) و (الإيضاح شرح المفصل) و (المكتفى للمبتدي شرح إيضاح أبي علي الفارسي) و (شرح المقدمة الجزولية) و (إعراب بعض الآيات) و (الشافية) و (شرح الشافية) و (جامع الأمهات في الفقه) و (قصيدة المؤنثات السماعية) و (رسالة العشر) و (رسالة في مذهب الإمام مالك) و (الأمالي النحوية) و (شرح كتاب سيبويه) و(معجم الشيوخ) و (ذيل تأريخ ابن عساكر) و (شرح الوافية في نظم الكافية) و (كافية ذوي الأرب في معرفة كلام العرب).

سەرچاوەکان:


١. وفيات الأعيان ٢/٤١٣.
٢. الإيضاح في شرح المفصل ١/٥.
٣. البداية والنهاية ١٣/١٧٨.
٤. شرح الوافية نظم الكافية ٨/٢٢.

٥. سير أعلام النبلاء ١٣/٣٤٩.
٦. بغية الوعاة ٢/٣٤ – ١٣٥.
٧. الأعلام ٢/١٥٣ /٤/٣٧٤ /١٠/١٤٢.
٨. شذرات الذهب ٥/٢٣٤.
٩. هدية العارفين ٥/٦٥٤ – ٦٥٥.
١٠. كشف الظنون ١/١٦٢.
١١. إيضاح المكنون ٣/٣٥١.
١٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٧٣ – ٣٧٤.
١٣. معجم المؤلفين ٦/٢٥١ – ٢٦٥ – ٢٦٦.
١٤. معجم أعلام الكورد ٤٥٦ – ٤٥٨.
١٥. محمد بن عبدالله الجلي ٢٤٧.
١٦. الأكراد في بهدينان ٩٠.
١٧. شەرەفنامە/ پەراوێز ٢٠٤.
١٨. مشاهير الكورد ٧٥ – ٢٩٩ – ٣٠٠.
١٩. ژیناوەری زانایانی کورد ٤٢٢ – ٤٢٥.

## عثمان عومەر حەڕانی (٩٨٩)

ناوی عوسمانە، کوڕی عومەری کوڕی عەلی کوڕی (ئەروان)ی کوڕی (ئەر)ی کوڕی سەعدی، کوڕی وەهبانی کوڕی عبداللەی، کوڕی نومەیری (حەڕانی)یە، لە مانگی ذي القعدەی ساڵی ٥٦٠ك – ١١٦٥ز لە حەڕان هاتووتەدنیا، زانایەکی ئەخلاق چاك و مەجلیس ئاوەدان و قسەخۆش بووە، زانیاری لە نەحو هەبووە، شاعیر بووە، چەند جار هاتووتە (هەولێر)، دوای ساڵی ٦١٨ك – ١٢٢١ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: تأريخ أربيل ١/٣٢٤.

## عثمان عیسا ماراني (٩٩٠)

ناوی عوسمانە، کوڕی عیسای کوڕی درباسی کوڕی فیری کوڕی جەهمی کوڕی عەبدوسی (هوزبانی)یە، نازناوی (ضیاءالدین)ە، لە دەوری ساڵی ٥١٥ك – ١١٢١ز هاتووتەدنیا، شارەزاترین کەسانی سەردەمی خۆی بووە لە مەزهەبی ئیمامی شافیعی، ماوەك لە (قاهیرە) حاکم بووە، یەکەم جار لە (هەولێر) لەلای مەلا خضری کوڕی عەقیلی دەخوێند، دوایی چووە (دیمشق) لای عبداللهی کوڕی عەصرون، پاش شارەزا بوونی لە زانستەکان، شەرحی (المذهب)ی کرد لە بیست بەرگ، ناوینا: (الإستقصاء لمذاهب الفقهاء) ئیبن خەلەکان لە کتێبی (وفیات الأعیان) دەڵێ: {شەرحی ئەوها قەت دانەندراوە}، هەروەها شەرحی (اللمع)ی کردووە، بەپێی نووسینی (یاقووت) حەمەوی لە کتێبی (معجم البلدان): {ئەو زانایە خەڵکی دەشتی (ناوکورە)}. ساڵی ٦٠٢ك – ١٢٠٥ز لە (قاهیرە) کۆچی دوایی کرد.


سەرچاوەکان:

١. وفيات الأعيان ٢/٤٠٦.

٢. معجم البلدان٢/٥٥٣٢ /٥/١٠١.

٣. البداية والنهاية ١٣/١١٢.

٤. الأعلام ٤/٣٧٥.

٥. معجم أعلام الكورد ٤٥٨ – ٤٥٩.

٦. أربيل في العهد الأتابكي ٢٤٨.

٧. هدية العارفين ٥/٦٥٤.

٨. كشف الظنون ٢/١٩١٢.

٩. مشاهير الكورد ٢/٦٠.

١٠. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٧٠ – ٣٧١.

١١. معجم المؤلفين ٦/٢٦٦.

١٢. شذرات الذهب ٥/٧.
١٣. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٤٣٥.
١٤. طبقات الشافعية ١/١٢٨.

## عثمان محەممەد حەڕانی (٩٩١)

ناوی عوسمانە، کوری محەممەدی کوڕی ئەبوبەکری کوڕی حەسەنە، خەڵکی حەڕانە ساڵی ٦٩٨ك – ١٢٩٨ز هاتووتەدنیا، خەریکی خوێندنی شەریعەت بوو، پاشان سەفەری حەجی کرد، دوایی دەستی بە خوێندنی فەرمووده کرد تا شارەزا بوو، هەروەها لە زانستەکانی عەرەبی بەهێز بوو، خەڵکان بڕوایان پێ دەهات، مامۆستا لە دیمشق دادەنیشت، ساڵی ٧٧٣ك – ١٣٧١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٢/٤٤٨.

## عثمان محەممەد کوردی (٩٩٢)

ناوی عوسمانە، کوری محەممەدی کوڕی ئەبو عەلی کوردییە، لە (موصل) فێری شەریعەت بوو، دوایی چووە (میصر) کرا قازی لە (دیمیاط)، دوایی لە قاهیرە کرا جێگری قازی عبدالمليك (مارانی) هەروەها (مدرس) لە قوتابخانەی (سەیفییە) و مزگەوتی (ئەقمەر)، چووە سەفەری حەج، گەڕاوە مەدینەی پیرۆز، ماوە لەوێ تا ساڵی ٦٢٦ك – ١٢٢٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:
١. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٤٠٧.
٢. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ٢/٣٥٦.
٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٦٩.
٤. معجم أعلام الكورد ٤٦٠.
٥. مشاهير الكورد ٢/٥٩.

## عثمان مەعروف خورمەلەیی (٩٩٣)

ناوی عوسمانە، کوڕی مەعروفی کوڕی عوسمانە، عەشیرەتی گەدری یە ساڵی ١٨٨٢ز لە گوندی (خورمەلە) هاتووتەدنیا، لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوای تەواوکردنی قۆناغی سوختەیی چووە (مەخمور) لای مەلا عبدالفتاحی شوان، ساڵی ١٣٢٦ك - ١٩٠٨ز چووە (کەرکوك) لای مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی قازی لاری خوێند، پاشان هاتە (هەولێر) مزگەوتی قەڵات لای مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

دەستنووسەکانی:

١. ساڵی ١٣١١ك شەرحی موغنی نووسییەوە.
٢. ساڵی ١٣١٢ك لە (هەولێر) تەصریفی مەلا عەلی نووسییەوە.
٣. ساڵی ١٣١٥ك سعداللهی گەورەی نووسییەوە.
٤. ساڵی ١٣١٦ك لە (خورمەلە) ئیستیعارە و شەرحی شێخ مەموندی نووسییەوە.
٥. ساڵی ١٣١٧ك لە (کۆزەپانکە) عیصامەدین و سەید شەریفی نووسییەوە.
٦. ساڵی ١٣٢٠ك عیصامەدینی (وەضع)ی نووسییەوە

مەلایەتی: مامۆستا لەو شوێنانە، مەلایەتی کرد، قوتابخانەی فەقێیانی هەبوو: ماجیداوە، شۆڕەزەرتکە، قازیخانە، کەسنەزان، عەوێنە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عوسمان دۆلەزەی، مەلا شەریفی دووشیوانی، مەلا ئیسماعیلی جدیدەی، مەلا محەممەدی باشوری، مەلا عبدالرحمانی بەگزادە، مەلا عەلی بندیان، مەلا عومەری تەرجانی، مەلا محەممەدئەمینی سەقزی، مەلا ئەحمەد خەلیفە، مەلا یەحیای ماجیداوەی، مەلا عبدالقادری ماجیداوەی، مەلا عبداللهی کوڕی.

دانراوەکانی:

١. خلاصة في علم الكلام.

٢. الفوائد والعوائد في الحكمة والعقائد.

٣. شرح العقد الجوهري لمولانا خالد الشارەزوری.

٤. موضوعات العلوم وتعريفاتها.

٥. رسالة في المنطق: بۆ مەلا عبداللهی کوڕی داناوە.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٥٠ز کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی: دوو کوڕی هەبوو:

١. مەلا ڕەئوف: ساڵی ١٩٦٩ز کۆچی دوایی کرد.

٢. مەلا عبدالله: ئەوە جێگری باوکی بوو، ماوەك لە دەشت مەلا بوو، دوایی هاتە (هەولێر)، کرا ئەندامی لیژنەی فەتوا، پێش نوێژ لە مزگەوتی (خديجة الكبرى)، لەبەر نەخۆشی ساڵی ٢٠٠٥ز سەفەری ئێرانی کرد، گەڕاوە (هەولێر) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٢٠ ٢٩ – ١١٧.

٢. خۆری ئیسلام، ژمارە ٢٠/ ٢٠٠٣ز، ٧٠ – ٧٩.

## عەدی صەخر لالشی (٩٩٤)

ناوی عەدییە، کوڕی صەخری کوڕی موسافیرە، نازناوی (أبوالبركات)ە، برازای شێخ عەدی گەورەیە، ساڵی ٥٥٥ك – ١١٦٠ز لە گوندی (لالش) سەر بە (موصل) هاتووتەدنیا، زۆرجار بۆ ئامۆژگاری کردن دەهاتە هەولێر، خەڵکان زیارەتیان دەکرد، ساڵی ٦١١ك – ١٢١٤ز چووە (حەج) گەڕاوە (شام)، چووە (حەلەب)، لەوێ شا زاهیر دابەزی بۆ زیارەتی، ساڵی ٦٢٥ك – ١٢٢٨ز لە ڕێگەی (مەککە)ی پیرۆز، کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. تأريخ أربيل ١/١١٦ /٢/١٦٩.

٢. جامع كرامات الأولياء ١/٤٢١ – ٤٢٣.

٣. معجم أعلام الكورد ٤٦٥.

## عەدی موسافیر هەکاری (٩٩٥)

ناوی عەدییە، کوڕی موسافیری کوڕی ئیسماعیلی کوڕی موسای کوڕی مەروانی کوڕی حەسەنی کوڕی مەروانی کوڕی حەکەمی کوڕی مەڕوانە ساڵی ٤٦٥ك – ١٠٧٢ز لە (شوف الأكراد)ی شام هاتووتەدنیا، زانایەکی ئایین پەروەر و خواناس بووە، شتی خەڵکی نەدەخوارد، بە ڕۆژ بە ڕۆژی دەبوو، بە شەو شەونوێژی دەکرد، زۆربەی کاتەکانی بە خوا پەرستی دەبردە سەر، ئامۆژگاری خەڵکانی دەکرد، قسەکانی جێگیربوون سەفەری بۆ (هەولێر) و (کەرکوك) کردووە، سوڵتان (مظفر)ی هەولێر دەڵێ: {بە منداڵی چوومە (موصل) بە خزمەت ئەو زاتە گەیشتم}، مامۆستا لە ناوچەی (هەکاری) کوردستانی تورکیا نیشتەجێ بوو، ساڵی ٥٥٥ك – ١١٦٠ز لە (لالش) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. وفيات الأعيان ٢/٤١٧.
٢. البداية والنهاية ١٢/٢٦٠.
٣. شذرات الذهب ٤/١٧٩.
٤. غاية المرام ١٠٠ – ١٠١.
٥. منهل الأولياء ٢/١٤٥ – ١٥٠.
٦. الأعلام ٥/١١.
٧. جامع كرامات الأولياء ٢/٢٩٥ – ٢٩٩.
٨. أربيل في العهد الأتابكي ١١٧.
٩. هدية العارفين ٥/٦٦٢.
١٠. مشاهير الكورد ٢/٢١ – ٢٢.
١١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٨١ – ٣٨٢.

١٢. معجم المؤلفين ٦/٢٧٥.
١٣. كشف الظنون ٢/١١٥٨.
١٤. مێژووی ئەدەبی کوردی ١/٢٣.
١٥. معجم أعلام الكورد ٤٦٥ – ٤٦٦.
١٦. شەرەفنامە / پەراوێز / ٥٢.

## عەرەفە عەلی بەندەنیجی (٩٩٦)

ناوی عەرەفەیە، کوڕی عەلی کوڕی حەسەنی (بەندەنیجی – مەندەلی)یە، لە قوتابخانەی (النظامیە)ی بەغدا، فێری شەریعەت بووە، زاتەکی زۆر بە دین بووە، ماوەی دوو ساڵان، نانی نەخواردووە، تەنیا بە شیر ژیاوە، ساڵی ٦٠٢ك – ١٢٠٥ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: طبقات الشافعية الكبرى ٤/٤٠٧ – ٤٠٨.

## عەرەفە محەممەد ئورمەوی (٩٩٧)

ناوی عەرەفەیە، کوڕی محەممەدە، نازناوی (زەینەددینە) مەزهەبی شافیعی بووە، خەڵکی (ورمێ)یە، دوایی چوویتە (دیمشق) لە فەرائیز و بیرکاری ئازابووە، حاشیەی لەسەر (نزهة النظار) هەیە، شەرحی (منظومة الوهاب)ی کردووە لە ١١ی شەووالی ساڵی ٩٣١ك – ١٥٢٥ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٦/٢٧٩.
٢. هدية العارفين ١/٦٦٣.
٣. شذرات الذهب ٨/١٧٤.

## عیزالدین عەلی سەرانی (٩٩٨)

ناوی عیزەدینە، کوڕی مەلا عەلی کوڕی مەلا شێخ عبدالصمدە، نەتەوەی پیری کۆسەیە تەریقەتی نەقشبەندییە، ساڵی ١٩٣١ز لە گوندی (سەران) هاتە دنیا، هەر لەوێ

دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە گوندی قەڵات لای مەلا عبداللە، گەڕاوە (سەران) لای مەلا شێخ ئەحمەدی (ئامۆزای)، چووە (باداوە) لای مەلا عبداللە، چووە (گەرەوان) لای مەلا ئەبوبەکری شەرکان، چووە (توتمە) لای مەلا ئەحمەد، چووە (مەران) لای مەلا عەلی شێخ وەتمانی، چووە (هەرتەل) لای مەلا محەممەد مەلا قادر، چووە (ڕواندز) لای مەلا مەحمود، چووە (زینوە) لای مەلا نصراللە، چووە (ئاکۆیان) لای مەلا عبداللەی قەڵات، ماوە لەوێ تا ساڵی ١٩٦٨ز ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: گەڕاوە (سەران) لەوێ کرا پێش نوێژ و وتارخوێن، ساڵی ١٩٨٨ز ئاوارە بوو بۆ (هەرتەل)، پاشان چووە (بێتواتە)، دوایی لەسەر داوای مامۆستا عبدالمجیدی گراوی هاتە (شەقڵاوە)، لەگەڵ چەند مامۆستایەك کە مامۆستا عبدالمجید دایناون بۆ دەرسی فەقێیان، پاشان مامۆستا عبدالمجید مەدرەسەی گراوی لە (سەربەن - مەصیف) دروست کرد، شێخ عیزەدین و مەلایەکان لە خزمەت مامۆستا هاتنە (مەصیف)، ماوەکیش لەوێ دەرسی دەدا، دوایی باری کرد هاتە مزگەوتی حاجی یونس لە گەڕەکی مەلایان لە (هەولێر).

کۆچی دوایی: شەوی ٤ی ڕەمەزان، ١/٢/٢٠٠١ز کاتی سەجدەی شەو نوێژ کۆچی دوایی کرد، مەلا ئیسماعیلی کوڕی لەو شوێنە کاروباری مەلایەتی ئەنجام دەدا، خوای گەورە تەمەن درێژی بکا.

سەرچاوە: ژیاننامەی زانایە ئاینیە کۆچ کردووەکان ٤٠٧ - ٤١٠.

## عەسکەر ئوسامە نەصیبی (٩٩٩)

ناوی عەسکەرە، نازناوی (ئەبو عبدالرحمانە)، کوڕی ئوسامەی کوڕی جامیعی کوڕی موسلیمە، خەڵکی شاری (نوسەیبین)ە، مامۆستا سەمعانی دەڵێ: {لە (مەککە)ی پیرۆز و لە (بەغدا) و لە (کوفە)م دیت، چەند زانیاریم لێ وەرگرت، ئەویش چەند شتی لە من وەرگرت}، پیاوەکی بە دین و ڕووخۆش بوو، ساڵی ٥٣٦ك - ١١٤١ز گەڕاوە (نوسەیبین).

سەرچاوە: الأنساب ٥/٣٩٤.

### عەسکەر عبدالرحیم نەصیبی (١٠٠٠)

ناوی عەسکەرە، کوڕی عبدالرحیمی کوڕی عەسکەری کوڕی ئوسامەی کوڕی جامیعی کوڕی موسلیمی کوڕی عبداللهی کوڕی عبدالکبیری کوڕی بیشرە، خەڵکی شاری (نوسەیبین)ە، ساڵی ٥٦٥ك - ١١٦٩ز هاتەدنیا، مامۆستایەکی فەرموودەناس و زیرەك بوو، لە (بەغدا) و (میصر) و (دیمشق) و (نوسەیبین)ی خوێند، زۆرجاران هاتیتە (هەولێر)، ساڵی ٦١٤ك لەگەڵ ئیبن مستەوفی کۆبۆوە، چەند دانراوی خۆی هەیە، ساڵی ٦٣٦ك - ١٢٣٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. تأریخ أربیل ١/٢١٦ - ٢١٨.
٢. شذرات الذهب ٥/١٨١.
٣. معجم أعلام الکورد ٤٧٧.

### عیصامەدین عبدالکریم قازی (١٠٠١)

ناوی عیصامەدینە، کوڕی قازی عبدالکریم ماجیدە، ساڵی ١٣٢٣ك - ١٩٠٥ز لە گوندی (درگا سلێمانی) هاتووتەدنیا، لەوێ دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە (سەقز) لای مەلا عبدالقادر خەلیفە زادە، دوایی چووە (هیجانان) لای مەلا عبدالرحیم، دوایی چووە (ئالکەکۆ) لای مەلا صادق، هاتە (پریسی) عێراق لای مەلا عبدالعزیز، چووە (ڕەشەوی) مەریوان لای مەلا محەممەدئەمین، چووە (تورجان) لای مەلا عەلی حەفید ئیجازەی وەرگرت، بە داخەوە تەمەنی کورت بوو، لە ١٣٦٦ك - ١٩٤٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تأریخ مشاهیر کورد ٢/٣٠٧ - ٣٠٨.

## عیصامەدین محەممەد شەفیعی (١٠٠٢)

ناوی عیصامەدینە، کوڕی حاجی محەممەد شەفیعی کوڕی مەلا محەممەدئەمینی ئەنباری سەر بە (بۆکان)ە، بە ڕەچەڵەك دەچێتەوە سەر شێخ ئەیوبی کوردی، ساڵی ١٣٠٠ك – ١٨٨٢ز لە گوندی (ئەنبار)ی بۆکان هاتوەتەدنیا.

خوێندنی: لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، لەبەر زیرەکی لە تەمەنی نۆزدە ساڵیدا کۆتایی پێ هینا ئیجازەی وەرگرت، دەستی کرد بە دەرسدانەوە، مامۆستا شیعری فارسی و کوردی هەیە، نازناوی (کامی)یە، نمونەی کوردی:

لەو عەقدی ئەم برۆیەت لێم یەقین بوو نەقضی پەیمانت
بە غەمزە کەوتە غەممازی ئیشارەی چاوی فەتتانت

لە دەوری قوطبی دەم خەتێ عیزارت دائیرەی کێشا
ئوفوق بووتە موعەددیل، پێم غەریبە هەیئەتی جوانت

بە سوغرای ئەو دەمە و کوبرایی چاوت مەتڵەبێکم بوو
بە صەد دەور و تەسەلسول هاتە پێش زولفی پەرێشانت

لە وەصل و فەصلێ من ئیجاز و ئیطنابت مورەتتەب کرد
لەف و نەشرت موشەووەش بێ ئەدی کوا مەیلی جارانت

لە شەرحی ڕەوضەی ڕووت دیومە بۆ توحفە مەلا چاکە
لەسەر ئەنواری ڕوخسارت کومەسرایی زەنەخدانت

شەهیدی عیشقم و جائیز نیە نوێژم لەسەر بکرێ
لە میحرابی برۆتا بۆ بە صەف وێستاوە موژگانت

کۆچی دوایی: ساڵی ١٣٧٤ك – ١٩٥٤ز کۆچی دوایی کرد، دوای خۆی مەلا ئەبوبەکری کوڕی لە جێی دانیشت، کتێبی (عائیشەی موبەڕڕەئە)ی هەیە بە فارسی.

سەرچاوەکان:

١. ژیناوەری زانایانی کورد ٥٧١ – ٥٧٦.

٢. تأریخ مشاهیر کورد ٢/٣٥٤.
٣. تأریخ فرهنگ وأدب مکریان ٣٦٠ – ٣٧٠.

## عەفیفە ئەحمەد فاریقی (١٠٠٣)

عەفیفە خان، کچی ئەحمەدی کوڕی عبداللهی کوڕی محەممەدی کـوڕی هـانی یـە. خەڵکی (میافارقین)ە، ساڵی ٥١٦ك – ١١٢٢ز هاتووتەدنیا، لـە (ئەصـفەهان) نیشـتەجێ بووە، فەرموودەکانی (المعجم الکبیر) و (المعجم الصغیر)ی طەبەرانی، لە لای فاطیمـە خـان خوێندوو، ئیجازەی لە چەند زانایان وەرگرتووە، لە مانگی ڕەبیعی دووەم، سـاڵی ٦٠٦ك – ١٢٠٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٥/١٩ – ٢٠.

## عەلائەدین عومەر بیارەیی (شێخ عەلائەدین) (١٠٠٤)

ناوی عەلائەدینە، کوڕی شێخ عومەری کوڕی شێخ عوسمـانی (تەوێڵە)یـە، سـاڵی ١٢٨٠ك – ١٨٦٣ز لە گوندی (تەوێڵە) هاتووتەدنیا، لـە بنەماڵـەکی خوانـاس و ئـایین پەروەر و ڕەوشت چاك پەروەردە بوو، قورئانی پیرۆزی خەتم کـرد، کتێبـە سـەرەتاییەکانی تەواوکردن، بەشێکی زۆری لە عەرەبی و ئەدەبیات و حیکمەت خوێند، جگە لە تەفسیر و شەریعەت، ئەمجا لە خزمەت شێخ محەممەد بەهائەدینی مامی تەریقەتی نەقشبەندی وەرگرت و شێخ ئیزنی ئیرشادی پێدا، چووە گوندی (دەرەشیش) سەر بە (هەڵەبجە)، خانوو و خانەقای دروست کرد، دوایی چووە گوندی (سەرواباد) ماوەك لەوێ بوو، پاشان ماڵە خاڵـەکانی – کە کاربەدەستی ناوچەکە بوون – گوندی (دوورروو)یـان پـێ بەخشـی، لـەوێ (شـێخ عەلائەدین) خانوو و خانەقا و قوتابخانەی دروست کـرد، چـەند زەوی و زاری دادەچـاند، بەروبومەکەی لە مریدان و فەقێیان خەرج دەکرد، هەروەها مەلا محەمـەد قـادری خـەڵکی (ڕەشەدێی) هێنا کردییە (مدرس)، ناوبانگی شێخ و مەلا و خانەقایەکە ڕۆیشـت، فـەقێیان، زانایان، پیاوانی خوایی لـێ وردن، بـووە مەڵبەنـدێکی خواپەرسـتی و زانیـاری تەفسـیر و شەریعەت و بەلاغە و نەحو و صەرف ... هتـد، وە سـاڵی ١٣٢٨ك – ١٩١٠ز گـەڕاوە

(بیارە)، تاکو ساڵی ١٣٤٠ك – ١٩٢١ز چەند زانای یەك لە دوای یەك دەهینا بۆ دەرسی فەقێیان، تا ڕیز گەیشتە مامۆستا عبدالکریمی (مدرس) (خوا لێی خۆش بی).

شێخ عەلائەدین ماڵەکی زۆری بە هەژاران دەبەخشی، بە تایبەت ساڵی گرانی (١٩١٧ز) بە بێ منەت و بێ خۆهەرکێشان بەخێوی دەکردن، بەڕاستی بە هەشتی بۆ خۆی کڕی.

سەفەرەکانی: شێخ سەفەری (بانە) و (سەقز) و (سنە) و (مەریوان)ی کردووە، هەروەها چوویتە (سلێمانی) و (کەرکوك) و (بەغدا) لەوێوە چوویتە (دێرەزۆر) و (حەلەب).

دانراوی: شێخ نامیلکەی (القول الحقیق في الرد علی من تفسق باسم أهل الطریق)ی هەیە، بە کوردی و عەرەبی و فارسی، ساڵی ١٣٥٤ك لە بەغدا چاپ کرا.

کۆچی دوایی: لە وەرزی بەهاری ساڵی ١٣٧٣ك – ١٩٥٣ز کۆچی دوایی کرد، لە تەك شێخ عومەری باوکی بە خاك سپێردرا، لەسەر وەصیەتی خۆی سیراجەدین شێخ عوسمانی کوڕی لە جێی دانیشت.

سەرچاوەکان:

١. نثر الجواهر والدرر ١٣٦٠ – ١٣٦١.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٠٤ – ٤٠٦.

٣. یادی مەردان ٢/٣٠٨ – ٣١٧.

٤. بنەماڵەی زانیاران ٤١٦ – ٤١٨.

## عەلائەدین نەجمەدین (عەلائەدین سجادی) (١٠٠٥)

ناوی عەلائەدینە، کوڕی نەجمەدینی کوڕی عیصامەدینە، لە بنەماڵەی (سەججادی)یە، لە شاری (سنە)یە، لە گوندی (باراو)ی سەر بە (سلێمانی) ساڵی ١٩٠٧ز هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، چەند کتێبی سەرەتایی تەواوکرد، ساڵی ١٩١٨ز چووە ناوچەی بالەکایەتی، ماوەك لە (ڕواندز) بوو،

ساڵی ١٩٢٧ز چووە مزگەوتی (بن تەبەق)لای مەلا ڕەسولی دیلـژەیی لـە (سلێمانی). پاشان چووە لای مەلا عەلی تەکیەیی، ماوە لەوێ تا ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: چووە (بەغدا) کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی نەعیمە خاتوون لـە مەیـدان. هاتووچووی ئەمجەد ئەفەندی زەهاوی و مەلا محەممەدی قزلجی دەکرد بۆ زێدە شارەزا بـوون لە زانستەکان، ساڵی ١٩٤١ز بـووە بەڕێوەبـەری گۆڤـاری (گەلاوێـژ)، سـاڵی ١٩٤٨ز گۆڤاری نزاری دەرکرد بە کوردی و بـە عـەرەبی، لـە ١٩٥٨ز تـا ١٩٧٤ز مامۆسـتای ئەدەب و مێژووی ئەدەبی کوردی بوو لە کۆلێژی ئادابی زانکۆی (بەغـدا)، لـە ١٩٧٤ز ئەمینداری گشتی ئەوقاف بوو لە (هەولێر) لە ١٩٧٨ز خانەنشین کرا.

خووڕەوشتی: زانایەکی ڕووخۆش و قسەخۆش و نوکتەزان بـوو، دەنگـی خـۆش بوو هێمن و لەسەرەخۆ و بەشەرم بـوو، زیـرەك بـوو، عـەرەبی و فارسـی چـاك دەزانـی. ئەندامی کۆڕی زانیاری کـورد بـوو، خزمـەتێکی دورو درێـژی ڕۆژنامـەوانی و مێـژوو و وێژەی کوردی کرد، نووسینەکانی سەرچاوەنە بۆ نووسەرانی کورد، بە ڕاستی ئـەو زانایـە مەزنە پەرتوکخانەی گەلی کوردی زەنگین کرد، گەلی کـورد هـەر قـەرداری ئـەو زاتەنـە. دانراوە بەنرخەکانی بەڵگەنە بۆ خزمەتگوزرای و چالاکی.

کۆچی دوایی: لە ١٣/١٢/١٩٨٤ز لە بەغدا، کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی شیخ عبـدالقادری گـەیلانی نزیـك گـۆڕی شـێخ عبـدالرحمان ئـەبولوەفا و شـێخ ڕەزای طالەبانی بە خاك سپێردرا.

دانراوەکانی:

١. یادی پیرەمێرد: ساڵی ١٩٥١ز لە بەغدا چاپ کرا.
٢. هەڵبژاردە: ساڵی ١٩٥٣ز لە بەغدا چاپ کرا.
٣. ژیاننامەی مێژوونووس محەممەدئەمین زەکی: ١٩٤٨ز.
٤. مێژووی ئەدەبی کوردی ١٩٥٢ز.
٥. ناوی کوردی: ١٩٥٣ز.

٦. گەشتێك لە کوردستان: ١٩٥٦ز.

٧. شۆڕشەکانی کورد: ١٩٥٩ز.

٨. هەمیشە بەهار: ١٩٦٠ز.

٩. دەستوور و فەرهەنگی زمانی کوردی ١٩٦١ز.

١٠. ئەدەبی کوردی نوێ و لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی ١٩٦١ز.

١١. ڕشتەی مرواری: هەشت بەرگە: یەکەم و دووەم ١٩٥٧ز، سێیەم و چوارەم ١٩٥٨ز، پێنجەم ١٩٧٢ز، شەشەم ١٩٧٩ز، حەوتەم ١٩٨٠ز، هەشتەم ١٩٨٣ز.

١٢. نرخ شناسی ١٩٧٠ز.

١٣. دووچامەی (نالی) و (سالم): ١٩٧٣ز.

١٤. کوردەواری: ١٩٧٤ز.

١٥. دەقەکانی ئەدەبی کوردی: ١٩٧٨ز.

١٦. خۆشخوانی: ١٩٧٨ز.

سەرچاوەکان:


١. تأريخ مشاهير كورد ٢/٥١٦.

٢. یادی (سجادی).

٣. إسهام علماء كوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢٦٤.

٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٤/٢٦٤ – ٢٧٠.

٥. مێژووی ئەدەبی کوردی ٧/٥٥ – ٦٠.

٦. معجم أعلام الكورد ٤٧٨ – ٤٧٩.

٧. أعلام كورد العراق ٥١٠ – ٥١٤.

## عەلی ئیبراهیم ئامێدی (١٠٠٦)

ناوی عەلییە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عبدالرحمانی کوڕی محەممەدی کوڕی عیمادەددینی حەنەفی ئامێدییە، ساڵی ١٠٤٨ك - ١٦٣٨ز هاتووتەدنیا، لە (دیمشق خوێندیتی لە لایەن شێخ مەحمودی کوردی و چەند زانایانی ئەو سەردەمی، کرایتە (مدرس) لە قوتابخانەی (سلیمانیة)، ماوەك موفتی حەنەفییەکان بووە، دوایی لادرا، مامۆستا شاعیریش بووە، لە شەوی هەینی ١٥ی ذوالحجە، ساڵی ١١١٧ك - ١٧٠٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. سلك الدرر ٣/١٩٦ - ٢٠١.
٢. الأعلام ٥/٥٥ - ١٩٠.
٣. معجم أعلام الكورد ٤٨٠.

## عەلی ئیبراهیم جزیری (١٠٠٧)

ناوی عەلییە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی محەممەدی کوڕی ئەبوبەکری کوڕی ئیبراهیمی کوڕی عبدالعزیزی جزیرییە، ساڵی ٧٤٨ك - ١٣٤٧ز هاتووتەدنیا، لە (دیمشق) دانیشتووە، یەك ساڵان بوو باوکی کۆچی دوایی کرد، نەصیرەدینی مامی بەخێوی کرد و لەبەر خوێندنی دانا، بووە مەلا و دەرسی داوە، زانایەکی بێ فیز و بارقۆر و دڵنەرم بوو، مەزهەبی شافیعی بوو، زۆر شارەزا بوو لە شەریعەت، چەند جاران چووە (حەج) ساڵی ٨١٣ك - ١٤١٠ز لە دیمشق کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٧/١٠٢.
٢. مشاهير الكورد ٣١١.
٣. معجم أعلام الكورد ٤٩١.

## عەلی ئیبراهیم خۆشنام (١٠٠٨)

ناوی عەلییە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی خۆشنامی کوڕی ئەحمەدی حەمیدییە، مەزهەبی حەنەفی بووە، زانایەکی شەرع زان و کردەوە ڕێك بووە، دەرسی داوە، موفتی بووە، ساڵی ٦٥٨ك – ١٢٦٠ز لە (حەلەب) شەهیدکرا.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٣١٦ – ٣١٧.

٢. معجم أعلام الكورد ٤٨٠.

## عەلی ئەبوبەکر حەڕانی (١٠٠٩)

ناوی عەلییە، کوڕی ئەبوبەکری کوڕی عومەری کوڕی سالمە، خەڵکی (حەڕان)ە، زانایەکی زیرەك و بەڕێز و ڕووخۆش بوو، بازرگانیشی دەکرد، بۆ خوێندنی فەرموودە چووە (ئەسکەندەرییە)، ساڵی ٦١٧ك – ١٢٢٠ز لە شاری (خلاط)ی ئەرمەنستان کۆچی دوایی کرد، پاش ساڵەك گواستیانەوە (حەڕان).

سەرچاوە: تأريخ أربيل ١/٢٩٧ /٢/٤٩٥.

## عەلی ئەبوبەکر کچك مەلا (١٠١٠)

ناوی عەلییە، کوڕی ئەبوبەکر ئەفەندی کچك مەلای کوڕی عوسمان ئەفەندییە، ساڵی ١٢٤١ك – ١٨٢٥ز هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، زانستەکانی تەواوکرد، ئیجازەی لە حاجی مەلا عومەر ئەفەندی برای وەرگرت، دوایی حەزی لە تەسەووف کرد، تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عوسمان سیراجەدین وەرگرت، پاشان بووە مریدی شێخ عەلی حوسامەدینی نەوەی شێخ عوسمان، بۆیە نازناوی خۆی دەنوسی (الحسامي)، ساڵی ١٢٨٤ك – ١٨٦٨ز کتێبی (حزب البحر)ی شازەلی و شەرحی ئیبن حەجەری نووسییەوە، دانراوی خۆی هەیە بەناوی (کەشکۆل)، دانراوێکی تری هەیە: (سراج الطالبين في مناقب الشيخ حسام الدين)، ساڵی ١٩١٢ز لە (کەرکوك) چاپ کرا، ساڵی ١٣٠٧ك

– ١٨٨٩ز کۆچی دوایی کرد، لە (تەوێڵە) بە خاك سپێردرا، شێخ جەمیلی کوڕی جێگری بوو: ئەویش ساڵی ١٩١٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. أربيل في مختلف العصور ١٤٨.

٢. علماء ومدارس في أربيل ٣١.

٣. تأريخ مشاهير كورد ٢/١٣٦ – ١٣٧.

٤. خۆری ئیسلام ٢٣/٢٠٠٤ز، ٣٦ – ٤١.

## عەلی ئەحمەد ئەخلاطی (١٠١١)

ناوی عەلییە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەدی کوڕی نەجیی کوڕی سەعیدە، خەڵکی (ئەخلاط)ە، لە مانگی مەولودی ساڵی ٦٦٨ك – ١٢٦٩ز هاتووتەدنیا، فەرموودەی خوێندووە، تەواوی کردووە، دەرسی داوە، زاتەکی پاك و بە دیمەن جوان بووە، لە مانگی صەفەری ساڵی ٧٤٢ك – ١٣٤١ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٩٠.

## عەلی ئەحمەد ئورمەوی (١٠١٢)

ناوی عەلییە نازناوی زەینەدینە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەلی کوڕی ئەحمەدە خەڵکی شاری (ورمێ)یە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، کتێبی (جواهر التبصرة)ی لە باسی خەونان داناوە، ساڵی ٨٣٥ك – ١٤٣١ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. هدية العارفين ١/٤٤٨.

٢. معجم المؤلفين ٦/١٥٩.

## عەلی ئەحمەد دیاربەکری حەنبەلی (١٠١٣)

ناوی عەلییە، کوڕی ئەحمەد عەلائەدینی کوڕی یوسفی کوڕی خضری دیاربەکرییە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، لە شەریعەت و خەون لێدانەوە زانیاری بەهێز بووە،

هەرچەندە نابینا بوو بەڵام زیرەك و زمان زان بوو، عەرەبی و تورکی و فارسی و مەغۆلی و چەند زمانی بیانی دەزانی، کتێبی (البصيرة في تعبير الرؤيا) و (كشاف القلوب)ی داناوە، ساڵی ٧٦٢ك – ١٣٦٠ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٣/ ٢١ – ٢٢.
٢. الأعلام ٥/٦٣.
٣. كشف الظنون ٢/١٤٨٤.
٤. هدية العارفين ٥/٧٢٤.
٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٩١.
٦. معجم أعلام الكورد ٤٨١ – ٤٨٢.
٧. معجم المؤلفين ٧/٣٢ بەڵام لەوێ مێژووی کۆچی دوایی بە ساڵی: ٧١٠ك – ١٣١٠ز داناوە.

## عەلی ئەحمەد دیاربەکری حەنەفی (١٠١٤)

ناوی عەلییە، کوڕی ئەحمەد حەنەفییە، نازناوی (ڕەضا)یە، خەڵکی دیاربەکرە، ساڵی ١١٧٦ك – ١٧٦٢ز هاتووتەدنیا، دیوانی شیعری هەیە، بریتییە لە (٢٠٢٧٧) بەیت، لەگەڵ باوکی چووە شاری (یەکی شەهر)، لەوێ ساڵی ١٢٧١ك – ١٨٥٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: هدية العارفين ٥/٧٧٦.

## عەلی ئەحمەد ڕواندزی (١٠١٥)

ناوی عەلییە، کوڕی ئەحمەد عەتارە، ساڵی ١٨٩٨ز لە (ڕواندز) هاتووتەدنیا، هەر لەوێ دەستی کرد بە خوێندن، وەکو دەستووری فەقێیان قۆناغی سوختەیی تێپەڕی، چووە (سەران) لای مەلا عبداللە مەنتیق و ئادابی خوێند، گەڕاوە (ڕواندز) لای مەلا ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی بەلاغە و ئوصول و کەلامی خوێند، چووە (هەولێر) مزگەوتی قەڵات،

لای مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی، هەر لەوێ ساڵی ١٣٣١ك حاشیەی عبداللّٰه‌ی کوڕی حەیدەر لەسەر لاری حیکمەت‌ی نووسییەوە، دوایی چووە (کەرکوك) لای مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی، حیکمەت و ڕیازییات و فەلەکیاتی خوێند، ماوە لەوێ تا ئیجازەی وەرگرت، بووە مەلا لە گوندی (قەرەدەرە)، دوایی چووە (قازیخانە)، پاشان چووە پردێ، لە ١٩٣٨ز کۆچی دوایی کرد.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عومەر ئۆمەرگومبەتی، مەلا عوبێد سەربیری، مەلا مصطەفای هیرانی، مەلا طەییبی دووشیوانی.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/٢٢٧.
٢. دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عەلی ئەحمەد سەردەشتی (١٠١٦)

ناوی عەلییە، کوڕی ئەحمەدە، ساڵی ١٩٠٥ز لە شاری (سەردەشت) هاتووتەدنیا، هەر لەوێ دەستی کرد بە خوێندن، ساڵی ١٩١٧ز چووە (دۆلکان)ی ئالان، گەڕاوە (سەردەشت) کتێبی (سەعدینی) تەواوکرد، لەوێ چووە (میراوە) لەوێ چووە (واشامەزین)، لەوێ چووە (بێژوە)، لەوێ چووە (قەڵاتە)، پاشان چووە (کۆیە) ماوە لەوێ تا ساڵی ١٩٢٨ز ئیجازەی وەرگرت، بووە مەلا لە (سەردەشت) زۆر پێنەچوو باری کرد بۆ (سیسێر)، گەڕاوە (سەردەشت) کرا قازی، لە ١٩٦٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٣٠٨.

## عەلی ئەحمەد قرمیسینی (١٠١٧)

ناوی عەلییە نازناوی ئەبولحەسەنە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی فەضلی کوڕی شوکری کوڕی بەکرانی خەیاتە، خەڵکی (قرمیسین – کەرمانشا)یە، لە (بەغدا) دانیشتووە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، زانایەکی شەرع زان و ڕاستگۆ بووە، دەرسی فەرموودەی لە چەند مامۆستایان وەرگرتووە، خۆشی چەند کەسانی پێگەیاندووە، لەوانە کوڕەکەی خۆیتی.

سەرچاوە: الأنساب ٤/٤٥٩.

## عەلی ئەحمەد گۆمەگڕویی (١٠١٨)

ناوی عەلییە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی شێخەیە، ساڵی ١٩١٧ز لە گوندی (دۆڕەبەکرە) هاتووتەدنیا، لەو گوندە لەلای مەلا عبداللە دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (جلبەسەر) لای مەلا شێخ مەعروف، دوایی چووە (بانەمورد) لای مەلا عومەر، دوایی چووە (بەردەسپی) لای مەلا سەعید، دوایی چووە (دیبەگە) لای مەلا ئیسماعیلی جدیدەی، دوایی چووە (هێلەوە) لای مەلا ئەبوبەکری کۆیی، پاشان چووە (هەولێر) مزگەوتی شێخ مصطەفای نەقشبەندی، ماوە لەوێ تا ساڵی ١٩٤٣ز جەنابی شێخ ئیجازەی پێدا، بووە مەلا لە (گردمەلا)، دوایی چووە (جاستان) پاشان چووە (گۆمەگڕوو) دوایی چووە گوندی (کەردز)، پاشان هاتە (هەولێر) ساڵی ١٩٧٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عەلی ئەحمەد ماردینی (١٠١٩)

ناوی عەلییە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی عەلییە، خەڵکی (حصن کیفا)یە، دوایی چوویتە (ماردین)، لە (دیمشق) دابەزیوە، صەحیحی ئیمامی موسلیمی خوێندووە، پاشان دەرسی داوە، زاتەکی بە دین و ڕوو لە خوا و پشت لە دنیا بووە، بەردەوام خەریکی خواپەرستی بووە، بە ڕۆژی بووە، چاو لە دەست نەبووە، شتی خەڵکی نەخواردووە، بە هەژاری ڕابواردووە، ساڵی ٨٢٥ك - ١٤٢٢ز لە (مەککە)ی پیرۆز کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ٥/١٥٦.

٢. شذرات الذهب ٧/١٧١.

## عەلی ئەحمەد هەکاری (١٠٢٠)

ناوی عەلییە، نازناوی ئەبولحەسەنە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی یوسفی خاوەنی قەڵای هەکارییە، ساڵی ٤٠٩ك - ١٠١٨ز هاتووتەدنیا، دەستی کرد بە خوێندن، پاشان بۆ

خوێندنی فەرموودە چووە (بەغدا) ماوە لەوێ تا تەواوی کرد، ماوەك لەوێ دەرسی دەدا، چەند زانای پێگەیاند، یەك لـە فـەقێیانی ئـەو، مامۆسـتا شـێخ عبـدالقادری گـەیلانی یـە، هەروەها لە گوندی (دێرەڕەش)ی نزیك (ئامێدی) دەرسی داوە، مامۆسـتا زۆر بـە دیـن و خێرخواز بووە، لە زۆر ولاّتان گەڕاوە بۆ فێربوونی فەرموودەی پێغەمبـەر (د.خ)، لـە نـاو خەلّکان ناسرابوو، بە (شیخ الاسلام) بەلاّم خۆی حەزی لەوناوە نـەدەکرد، جـارەك یـەك پرسیاری لێ کرد: مامۆستا ئەتو (شێخ الاسلامی)؟ فەرمووی: نا شێخ الاسـلام نیمـە، بـەلاّم شێخەکی ئیسلامم، واتە منیش هەروەکو ئێوەم گەورەتر نیمە.

خۆی دەلّێ: {چوومە زیارەتی مەدینەی پیرۆز، کەمەك لە (رەوضـە) نوسـتم، لـە خەودا بە خزمەت پێغەمبەر (د.خ) گەیشتم، فەرمووی: لەسەر بیروبـڕوای ئیمـامی ئەحمـەد بە، لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافیعی برۆ، خۆت بپارێزە لە هامشۆ و برادەرایەتی گومڕایان، ئەو کەسانەی لە ڕێگایان لاداوە لەگەلّیان دامەنیشە}.

کۆچی دوایی: لە مانگی (محرم)ی سالّی ٤٨٦ك – ١٠٩٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:


١. البداية والنهاية ١٢/١٥٨.

٢. وفيات الأعيان ٣/٣١ /٦/١٥٣.

٣. مشاهير الكورد ٢/٧٦.

٤. شذرات الذهب ٣/ ٣٧٨ – ٣٧٩.

٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٨٦ – ٣٨٧.

٦. المنتظم ٩/٦٦٠.

٧. الأنساب ٥/٥٥٨.

٨. تأريخ مشاهير كورد ١/٣٢ – ٣٣.

٩. الأكراد في بهدينان ٧٥.

## عەلی ئیسماعیل بیرەعارەبانی (١٠٢١)

ناوی عەلییە، کوڕی ئیسماعیلی کوڕی مەولودە، ساڵی ١٩٢٥ز لە گوندی (سۆربەش) هاتووتەدنیا، لەو گوندە دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (شێخانان) لای مەلا عەزیز، دوایی چووە (یەدیقزلەر) لای مەلا ئیسماعیلی ناقیص، چووە (قەشقە) لای مەلا عومەر، چووە (گردەمەلا) کتێبی (خەیالی) لەلای مەلا شەریفی دووشیوانی خوێند، چووە (گردەسۆر) (شەمسییە)ی لای مەلا طەیبی دووشیوانی خوێند، چووە (عەلیاوە) (مطول)ی لای مەلا محەممەدئەمینی سوێری خوێند، چووە (دۆلەزە) (بورهانی گەلەنبەوی) لەلای مامۆستا عوسمان خوێند، چووە (دووگرتکان) (رسالة الحساب) و (ربع المجیب)ی لەلای مەلا ئەبوبەکری کۆیی خوێند، هەر لە خزمەت ئەو کۆتایی بە خوێندن هێنا، بووە مەلا لە (بیرەعارەبان)، چەند ساڵان لەوێ ماوە، پاشان هاتە مزگەوتی شێخ محەممەد (شێخەڕەشکە) لە (هەولێر)، مامۆستا ناسرابووە بە زانایەکی شەریعەت زان ڕۆژانە مەلایان هاتووچۆیان دەکرد بۆ پرسیارانی شەریعەت، ماوەیەکی زۆر لە ماڵەوە لەسەر جێ کەت لە بەر نەخۆشی، پاش تەمەنێکی درێژ بە خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، لە بەرواری ٢٠٠٩/١١/١٣ز دوای نوێژی هەینی کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عەلی ئیسماعیل هەولێری (١٠٢٢)

ناوی عەلییە، کوڕی ئیسماعیلی کوڕی موسەللەمی کوڕی سەلمانی هەولێرییە، ساڵی ٥٥٩ك – ١١٦٣ز لە (بەغدا) هاتووتەدنیا، لەوێ خوێندووە، ماوەکیش لە (هەولێر) لەلای (شوهدە)خانی خوێندیە، پاشان خۆی چەند ئیجازەی داوە، مامۆستا ئەهلی تەسەووف بووە، شیعری هەیە، لە ڕۆژی شەممەی ٥ی مانگی ڕەبیعی دووەم، ساڵی ٦١٨ك – ١٢٢١ز لە هەولێر کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (مشهدالکف) بە خاك سپێردرا، لەوانەیە ئەو شوێنە بێ کە ئێستا ناودەبەن بە (پەنجە عەلی) نزیك مزگەوتی شێخ مصطەفای نەقشبەندی.

سەرچاوەکان:

١. تأریخ أربیل ١/٢١٣ – ٢١٤ /٢/٣٦٥.

٢. معجم أعلام الکورد ٤٨٣ – ٤٨٤.

## عەلی ئەفەندی کوردی (١٠٢٣)

مامۆستا عەلی ئەفەندی ساڵی ١٢٢٦ك – ١٨١١ز هاتووتەدنیا، لە (بەغدا) پەروەردە بووە، دەرسی لەلای مەلا عبدالسلام ئەفەندی و سەید ئیسماعیل ئەفەندی خوێندیە، زاتەکی بە دین و دوور لە دنیا بووە، خەڵکان خۆشیان ویستووە لە قوتابخانەی حەسەن پاشا کرا (مدرس)، پاشان کرا ئەمین فەتوای (بەغدا) لە ١٣١٦ك – ١٨٩٨ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: نثر الجواهر والدرر ١/٩٠٩.

## عەلی بانەی بەرزنجی (١٠٢٤)

مامۆستا سەید عەلی زانایەکی بەرز بووە، یەك بووە لە فەقێیەکانی مەلا صبغةالله‌ی حەیدەری ماوەرانی، مامۆستا ساڵی ١٢٢٥ك – ١٨١٠ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (الإعراب المحلي) داناوە بۆ شێخ ئیبراهیم نیزامەددین موهاجیر، نوسخەکی دەستنووسی محەممەد رەسولی بێژەویمان لەلایە، ساڵی ١٢٠٧ك – ١٧٩٢ز نووسیتیەوە، لەو کاتە دانەرەکە لە ژیاندا بووە.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٣/٢٩٦ – ٦٩٩.

٢. إسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الإسلامیة ٨٢

## عەلی بەندەنیجی (١٠٢٥)

مامۆستا عەلی (بەندەنیجی – مەندەلی)، یەکە لە زانایە مەزنەکانی سەدەی یازدەی کۆچی، بیرتیژ و رۆشنبیر و زمان پاراو و شاعیر بووە، شیعری کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی هەیە.

چەند دانراوی خۆی هەیە، لەوانە:

١. قەصیدەی (عینیة).

٢. الرسالة اللدنیة: شەرحی قەصیدەی (عینیة)یە، ساڵی ١١٦٤ك - ١٧٥٤ز تەواوی کردیە.

٣. رسالة في تحلیل بعض الألفاظ والرموز الصوفیة.

٤. النظم البهیج: ناوی یارانی پێغەمبەرە (د.خ) بە عەرەبی و فارسی.

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/٣٥٨ /٦/١٧١.

## عەلی تاجەدین ژەنگاری (١٠٢٦)

ناوی عەلییە، کوڕی تاجەدین تەقیەدین ژەنگارییە، مەزهەبی حەنەفی بووە، شەرع زان و ووتارخوێن بووە، لە بەیتی خوا کرایتە پێش نوێژ، هەر لەوێ ساڵی ١١٠٩ك کتێبی (القربة بکشف الکربة)ی دانا، هەروەها شاعیر و نووسەر بووە، ساڵی ١١٢٥ك - ١٧١٣ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ٧/٤٩.

٢. إیضاح المکنون ٢/٢٢٢.

٣. معجم أعلام الکورد ٤٨٤.

## عەلی تەڕەماخی (١٠٢٧)

ئەو زاتە عەلییە، خەڵکی گوندی (تەڕەماخ - تەڕەمووك)ە، ڕۆژئاوای شاری (مەکسی) پشت چیای (ئام غوس)، ساڵی ١٠٠٠ك - ١٥٩١ز هاتووتەدنیا، یەکەم کەسە بە کوردی ڕێزمانی نووسیوە، شەرحی تەصریفی زەنجانی کردووە بە (بادینی)، سەرەتایەکەی دەڵێ: {اعلم! تو بزانە.....) لەبەر ئەوەی ئەو وشەیە زۆرجاران دووبارە دەکاتەوە، کتێبەکە لەناو فەقێیانی ناوچەی (سۆران) ناودەبردرا بە (تو بزانە)، وە بەپێی نووسینی شێخ محەممەد مەردۆخی کوردستانی کتێبێکی دیش هەیە تەرکیبی عەوامیلی

جورجانییە، مەلا یونسی هەلکاتینی لە صەدەی دوازدە دایناوە، سەرەتای (توبزانە)یە لەبەر ئەو هۆیە ئەویش ناوبردراوە بە: (تو بزانە).

مامۆستا تەرەماخی ساڵی ١٠٦٥ك – ١٦٥٤ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: ژیناوەری زانایانی کورد ٣٠٧ – ٣٠٨.

## عەلی جلەموردی (١٠٢٨)

مامۆستا مەلا عەلی لە قوتابخانەکانی دەوروبەری گوندی (جلەمورد) خوێندنی تەواوکرد، بووە مەلا لە مزگەوتی فەرهاد لە (کەرکوك)، پاشان چووە (تەوێڵە) تەریقەتی لە سیراجەدین شێخ عوسمان وەرگرت، کرا خەلیفە، گەڕاوە (کەرکوك)، دەستی کرد بە خواپەرستی و ئامۆژگاری خەڵکان، لە دەوروبەری ساڵی ١٢٧٠ك – ١٨٥٣ز، یەك لە مریدەکانی خۆی – کە تازە ئەقڵی تێکچوو بوو – هێرشی کردەسەر، مامۆستای شەهید کرد، هەر لە قوتابخانەکەی خۆی بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدین ٤٠٢ – ٤٠٣.

## عەلی حامید شنۆیی (١٠٢٩)

ناوی عەلییە، کوڕی شێخ حامیدی کوڕی (فتح الدین)ە، خەڵکی گوندی (شێخان)ە، نزیك شاری (شنۆ).

دانراوەکانی: چەند دانراوی هەیە، لەوانە:

١. تصریف الزنجاني: ناسراوە بە تەصریفی مەلا عەلی، نووسخەی دەستخەتی زۆرە، لەبەر ئەوەی یەکە لە زنجیرەی کتێبی خوێندنی فەقێیان تاکو ئێستاش، زۆر بایەخی پێدراوە، شەرح و حاشیەی لەسەر نووسراوە، فەرەج الله زەکی کوردی ساڵی ١٩٣٥ز لە میصر چاپی کرد، لەگەڵ حاشیەی قزلجی و قەرەداغی، حاشیەی سەید حەسەنی چۆڕی لەسەرە بەڵام چاپ نەکراوە، مەلا پیرۆتی کۆیی شەرحی کردووە، پێشکەشی بە بابەکر ئاغای حەویزی کردووە، لە ئێران چاپ کراوە، بەڵام بەهەڵە

بەناوی شەرحی جەلیزادە ناوبراوە، وە مەلا خەلیل موخلیصیش شەرحی کردووە، لە هەولێر و سنە چاپ کراوە.

٢. حاشیەکی کورت لەسەر کتێبێك لە زانستی (الوضع).

٣. نامیلکەی (طەلاق) سەرەتایەکەی بە: (أعلم أن قول الأكراد: طەلاقم کەوتبی) دەست پی دەکات.

٤. تفصیل الجرجاني: شەرح و تەرکیبی عەوامیلی جورجانیە، محەممەد صالح جاف دوای لێکۆڵینەوە، وەك ماستەر نامە پێشکەشی زانکۆی بەغدای کردووە.

کۆچی دوایی: ساڵی ١١٥٢ك – ١٧٣٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/١٦٩ – ١٧٤ /٣/٣٧٨.

٢. تفصيل الجرجاني دانراوي عەلی حامد الاشنوي، ماستەرنامەی محەممەد صالح هوريني.

### عەلی حەسەن ئەرضرۆمی (١٠٣٠)

مامۆستا حاجی عەلی ئەفەندی، کوڕی حاجی حەسەنە، خەڵکی (ئەرزەرۆمە)، لە شارەکەی خۆی پێگەیشتووە، ساڵی ١٠٩٤ك – ١٦٨٨ز لە (ئاستانە) کرا (مدرس)، دوایی کرا پشکێنەری ئەوقاف گشتی، پاشان لە (مەککە)ی پیرۆز کرا قازی، لەو کارەی پێی سپێردرا سەرکەوتوو بوو، لە کۆتایی ساڵی ١١٩٨ك – ١٧٨٤ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٣١٧.

٢. معجم أعلام الكورد ٤٩٧.

### عەلی حەسەن بەرزنجی (١٠٣١)

ناوی عەلییە، کوڕی سەید حەسەنی بەرزنجییە، مەزهەبی شافیعی بووە، ساڵی ١٠٣٣ك – ١٧٢٠ز لە (مەدینە)ی پیرۆز هاتووتەدنیا، دەرسی لەلای سەید جەعفەری برای و چەند زانایان خویندووە، حەزی لە تەنیایی بووە، تێکەڵاتی خەڵکانی پێ خۆش

نەبوو، شاعیر بوو، لە دەوری ساڵی ١٢٠٠ك – ١٧٨٥ز لـە (مەدینـە)ی پیرۆز کۆچـی دوایی کرد.

چەند دانراوی هەیـە، لەوانـە: (نظـم أسمـاء البـدر) و (نظـم المولـد): هـۆنراوەی مەولودنامەی جەعفەری برایتی.

سەرچاوەکان:

١. سلك الدرر ٣/٢١٣.

٢. معجم المؤلفين ٧/٦١.

٣. هدية العارفين ٥/٧٧٠.

٤. معجم أعلام الكورد ٤٨٦ – ٤٨٧.

## عەلی حەسەن ثەمانینی (١٠٣٢)

ناوی عەلییە، کوڕی حەسەنی کوڕی عومەرە، نازنـاوی (ئەبولحەسـەنە)، خـەڵکی گوندی (ثەمانین)ە، بن چیای جـودی، پـاش تۆفانەکـەی حـەزرەتی (نـوح) (د.خ) یەکـەم گوندە ئاوەدانکرایەوە، ئەوانەی لە کەشتییەکە دابەزین هەشتا کەس بوون، بۆیە ئەو شوێنە ناوبراوە بە (ثەمانین) واتە: هەشتا، ئەو زانایـە لـە (صـور)ی شـام دەرسـی داوە، مامۆسـتا ئەبوبەکری خەطیب (٣٩٢ك – ٤٦٣ك) لە لای خوێندووە.

سەرچاوەکان:

١. اللباب ١/٢٤٣.

٢. الأنساب ٢/١٦ – ١٧.

## عەلی حەسەن هەولێری (١٠٣٣)

ناوی عەلییـە، کـوڕی حەسـەنی کـوڕی محەممـەدە، خـەڵکی هـەولێرە، نازنـاوی (ئەبولحەسەنە)، زانایەکی شەرع زان بووە، ئیبن مستەفی دەڵـێ: {دیتومـە حەسـەن ئەحمـەد عەتتاری هەمەدانی ساڵی ٥٦٣ك – ١١٦٧ز ئیجازەی بەو مەلا عەلی یە داوە بە تایبـەت،

ئیجازەی تریشم دیتووە بە چەند کەسانی بەخشیوە ناوی ئەو مەلایە لە پێش هەموویان تۆمارکراوە}.

سەرچاوە: تأريخ أربيل ١/٢٧٦.

## عەلی حوسێن ئورمەوی (١٠٣٤)

ناوی عەلییە، نازناوی (ئەبولحەسەنە) کوڕی حوسێنی کوڕی عەلی کوڕی حوسێنی کوڕی خەلەف کوڕی محەممەدە، ناسراوە بە (قازی عەسکەر) خەڵکی شاری (ورمێ)یە، مەزهەبی شافیعییە، ساڵی ٦٩١ك – ١٢٩١ز هاتووتەدنیا، شەرع زان و ئوصول زان بووە، کتێبی (معالم)ی فەخری ڕازی لە بابەت ئوصول شەرح کردووە، ساڵی ٧٥٧ك – ١٣٥٦ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. هدية العارفين ١/٧٢٢.
٢. معجم المؤلفين ٧/٧٥.
٣. شذرات الذهب ٦/١٨٣.
٤. كشف الظنون ٢/١٧٢٧.

## عەلی حوسێن حەڕانی (١٠٣٥)

ناوی عەلییە، کوڕی حوسێنی کوڕی عەلی کوڕی عەلانی کوڕی عبدالرحمانی فەرموودەناسە، نازناوی ئەبولحەسەنە، زانایەکی فەرموودەناس و پسپۆڕی زانیاریەکانی فەرموودەی پێغەمبەر بوو (د.خ)، کتێبی (تأريخ الجزيرة)ی داناوە، مامۆستا زەهەبی ناوی باوکی بە (حەسەن) تۆمار کردووە، ساڵی ٣٥٥ك – ٩٦٦ز لە (خوڕاسان) کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الأنساب ٤/٤٢٦.
٢. معجم المؤلفين ٧/٧٦.
٣. سير أعلام النبلاء ١٠/١٠.

٤. هدیة العارفین ٥/٦٨١.

٥. شذرات الذهب ٣/١٧.

٦. معجم أعلام الکورد ٤٨٥.

## عەلی حوسێن دیاربەکری (١٠٣٦)

ناوی عەلییە، نازناوی (ئەبولحەسەنە)، کوڕی حوسێنی دیاربەکرییە، لە (میصر) دانیشتووە، لە زانیاری نەحو شارەزا بووە، عبدالسلامی کوڕی حوسێنی بەصری لەلای ئەوی خوێندووە، کتێبی (الموازنة)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. بغیة الوعاة ٢/١٦٢.

٢. معجم أعلام الکورد ٤٨٥.

## عەلی حوسێن کەرماشانی (١٠٣٧)

ناوی عەلییە، نازناوی ئەبو محەممەدە، کوڕی حوسێنی کەرماشانی یە، زانایەکی شەرع زان بووە، فەرموودەی خوێندووە و دەرسی دایتەوە، لە (جورجان) کرایتە قازی، شەوی یەك شەممەی ٢٤ی ڕەبیعی دووەم، ساڵی ٣٧٧ك – ٩٨٧ز لە تەمەنی نۆهەت و هەشت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدین.

## عەلی حیکمەت سیاه مەنصوری (١٠٣٨)

ناوی عەلییە، کوڕی حاجی عبدالوهابە، خەڵکی گوندی (سیاه مەنصور)ی، ناوچەی قەرەحەسەنی (کەرکوك)ە، دەروبەری ساڵی ١٢٧٥ك – ١٨٥٨ز هاتووتەدنیا، یەك بووە لە مەلایە چاکەکانی سەردەمی خۆی، شان بە شان لەگەڵ مەلا مەحمودی مەزناوەی لە (کەرکوك) دەرسی دەدا، لە مزگەوت و قوتابخانەی سەید ئەحمەدی خانەقا، لە زیج و فەلەك و مەنیتق و حیکمەت بە ناوبانگ بوو، حاشیەی لەسەر شەرحی (تهذیب)

و (کەمالی صەرف) هەبە جگە لە کاتی نوێژ و جەمی خواردن سەرتاسەری ڕۆژ تا ئێوارە خەریکی دەرسدانەوە بوو.

بەشێك لە فەقێیەکانی: چەند مەلای چاك و ناودار لەسەر دەستی ئەو دەرچوینە، لەوانە: شێخ مصطەفای نەقشبەندی، مەلا عوسمانی خورمەلەی، مەلا مەحمودی جوانڕۆی، مەلا ئەسعەدی بوریدەری، مەلا عبداللّٰهی سەران.

نووسینەوەکانی: ساڵی ١٢٩٤ك کتێبی (عەروزی شێخ مەعروف) نووسیەوە، ساڵی ١٣٢١ك (رسالة الحساب)ی بەهائەدینی عامیلی لەگەڵ حاشیەکانی مەلا عبداللّٰهی پیرەبابی نووسیەوە.

دانراوەکانی:

١. النسب بين القضايا الموجهة: لەبەر خاتری سولەیمانی قەرەبەگی دایناوە، پێشکەشی بە شێخ عەلی شێخ عبدالرحمانی طالەبانی کردووە، سەرەتایەکەی دەڵێ: {وبعد فيقول الفقير الى الله الغني، على بن عبدالوهاب السياه منصوري، حفهما بالعفو والمغفرة يوم ينفخ في الصور....)

٢. شەرحی (مختصر البيان)ی مەلا ئەبوبەکری میرڕۆستەمەی.

کوڕەکانی:

١. صبغةالله: ساڵی ١٣٠٥ك هاتەدنیا.

٢. محەممەد فەیزی: ساڵی ١٣٠٩ك هاتەدنیا.

٣. ئەدیب ئەفەندی: ساڵی ١٣١٤ك - ١٨٩٦ز هاتە دنیا، لەم دوایە لە هەولێر دادەنیشت.

کۆچی دوایی: لە دەورووبەری ساڵی ١٣٤٨ك - ١٩٢٩ز لە کەرکوك کۆچی دوایی کرد، پاش مردن، برادەرەکی لە خەودا دیتی، پرسیاری وەزعی قەبری لێ کرد، وەڵامی داوە: {سوپاس بۆ خودا دەرچووم، برام زەحمەتە، بەڵام واشنیە کە ئێمە لە دنیا باسمان دەکرد}.

منیش دەڵێم:

| | |
|---|---|
| ئەو کەسەی لەسەر ڕێگای خودایە | لە پێشدا ڕێگەی بۆ خۆش کرایە |
| وەك سواری چاك دەڕوا بە ئاسان | سەر پردی (صراط) بە قۆشمە و غاردان |
| پێشوازی دەکەن فریشتەی تایبەت: | تەشریف بفەرموو جێگەتە بەهەشت |
| بێبەشمان نەکەی خوایە ئیسلامین | ببورە (طاهیر)، ئامین صەد ئامین |

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٠٣.
٢. علماء ومدارس في أربيل ٧٦ – ١٢٠.
٣. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٦/١٣ – ١١٣ – ١٢٣.
٤. نامەی ئەحمەد عبدالرحمان سیاە مەنصوری ١٢/٣/٢٠٠٠ز.
٥. النجم الزاهر ٥٢ – ٦٧.

## عەلی ڕەسولی سوسنی (١٠٣٩)

ناوی عەلییە، کوڕی ڕەسولی کوردییە، ناسراوە بە (سوسنی)، لای زانایە کوردەکانی وڵاتی خۆی خوێندنی تەواوکرد، چووە (موصل) لەوێ کرا (مدرس)، لە قوتابخانەی مزگەوتی (ئاغەوات) دەرسی دەدا، زانایەکانی شارەکە زۆر سوودیان لێوەرگرت مامۆستا محەممەدئەمین عومەری دەڵێ: {منیش وەضع و ئاداب و ئیستیعارەم لە خزمەت خوێند}.

سەرچاوە: منهل الأولياء ١/٢٧٥ – ٢٧٦.

## عەلی روستی (١٠٤٠)

مامۆستا عەلی خەڵکی گوندی (روستێ)یە، سەر بە قەزای (چۆمان)، ساڵی ١٢٤٥ك – ١٨٢٩ز لە گوندی (ڕوستە) دەرسی فەقێیانی داوە، شێخ ئیبراهیم فەسیح دەڵێ: {ئەوە مامۆستای منە}.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٣٩.

٢. علماء ومدارس في أربيل ١٠١.

## عەلی سعداللە کاوانی (١٠٤١)

ناوی عەلییە، کوڕی سعداللەی کوڕی مەلا ئادەمی کوڕی مەلا عەلی کوڕی مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی مەلا ئەبوبەکری کوڕی حاجی شێخەی کوڕی پیرخدری کوڕی مەلا عومەری کوڕی مەلا عێزەدینی کوڕی مەلا سەیفەدینی کوڕی عوبیداللەی کوڕی شێخ موسای زرارییە، خەڵکی گوندی (کاوانیان)ە، ساڵی ١٨٥٦ز لە گوندی (دێرە) لای قازی داود خوێندیتی، دوایی چووە (شەقڵاوە)، لەوێ ساڵی ١٨٧٥ز حاشیەی محەممەد حوسێنی لەسەر (میر ئەبولفەتح) نووسییەوە، ماوەکیش لە (بەحرکە)ی خوێندووە، لە کۆتایی کتێبەك دەڵێ: لە گۆڕستانی شێخ وەیس لە بەحرکە تەواوم کرد، کاتی دەستگیرکردنی شێخ محەممەد ئاغای سەرۆك عەشیرەتی گەردی، بە دەستی ئەمین بەگ حاکمی (هەولێر)، هەروەها ماوەکیش لە (ڕواندز) لای مەلا عومەر ئەفەندی خەیلانی بووە، پاشان هاتە (هەولێر) مزگەوتی قەڵات لای مەلا عومەر ئەفەندی، ماوە تا ساڵی ١٨٧٦ز ئیجازەی وەرگرت.

دوای کۆچی دوایی قازی داودی دێری مەلا عەلی کە فەقێی ئەو بوو کرا جێگری، ماوەك مەلا بوو لە (پانکان)، ماوەك لە (کاوانیان)، تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی وەرگرت، ساڵی ١٩١٧ز لە (پانکان) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (کاوانیان) بە خاك سپێردرا، مەلا جەمیلی کوڕی لە شوێنی دانیشت.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/٤٣ /٦/٢٤٦.

٢. دەستنووسەکانی ناوبراو.

## عەلی طەها بالیسانی (١٠٤٢)

ناوی عەلییە، کوڕی شێخ طاهای کوڕی عەلی کوڕی عیسای کوڕی ئەحمەدی کوڕی مصطەفای کوڕی عیسایە، ساڵی ١٨٩٣ز لە گوندی (بالیسان) هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، ماوەك لە لای موستەعیدەکانی باوکی خوێند، دوایی چووە (دیبەگە) لای مەلا عبدالفتاحی خەتێ، دوایی گەڕاوە (بالیسان) خزمەت باوکی، چووە (سلێمانی) لای شێخ عومەری قەرەداغی، چووە (کەرکوك) لای مەلا ڕەزای واعیز، گەڕاوە (بالیسان) خزمەت باوکی، ساڵی ١٩٢٩ز باوکی کۆچی دوایی کرد، ئەویش چووە (هەولێر) لای مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی لە مزگەوتی قەڵات، ماوە تا ئیجازەی وەرگرت.

گەڕاوە (بالیسان)، دەستی کرد بە مەلایەتی، ساڵی ١٩٦١ز هاتە (هەولێر)، بووە مەلا لە مزگەوتی (سێتاقان)، ساڵی ١٩٧٣ز کۆچی دوایی کرد، مەلا ئیبراهیمی کوڕی پێش نوێژ و وتارخوێنە لە مزگەوتی جەمال خەلیل لە هەولێر.

سەرچاوە: دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عەلی عبدالرحمان حەڕانی (١٠٤٣)

ناوی عەلییە، کوڕی عبدالرحمانی کوڕی شەبیبی کوڕی حەمدانی کوڕی شەبیبە نازناوی (نورەدینە)، مەزهەبی حەنبەلییە، یەکە لە زانایەکانی سەدەی هەشتی کۆچی، نووسەر و ڕۆشنبیر بووە، لە دکتۆری ئاشنایی هەبووە، کتێبی (جامع الفنون)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ٧/١٢٠.

٢. معجم اعلام الکورد ٤٨٨.

## عەلی عبدالرحمان طاڵەبانی (١٠٤٤)

ناوی عەلییە، کوڕی شێخ عبدالرحمانی کوڕی شێخ ئەحمەدی کوڕی مەلا مەحمودی طاڵەبانی یە، زانایەکی بەرز بووە، قورئانی پیرۆزی بە تەفسیرەوە هەموو لەبەر

بووه، شێخ مصطەفای نەقشبەندی (خوا لێی خۆش بی) دەیفەرموو، شێخ عەلی دەیگۆ: {هەرچەندە من موجتەهید نیم، بەڵام مورەججیحم}، دوای ئەو شێخ محەممەدی کوڕی جێگری بوو، ئەویش لە ١٩٣٣ز کۆچی دوایی کرد، شێخ جەمیلی کوڕی جێگری بوو، ئەویش لە ١٩٦١ز کۆچی دوایی کرد، دوای ئەو شێخ عەلی کوڕی جێگری بوو، کە ناسراوە بە (ثانی) دوای ئەو شێخ یوسفی کوڕی ئێستا سەرپەرشتی تەکیەکە دەکا، خوای گەورە ئەو شوێنی خواپەرستییە، ئاوەدان بکا، وەئەو بنەماڵە یارمەتی بدا بۆ خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام.

سەرچاوەکان:

١. الشیخ عبدالرحمان الطالباني / مکرم الطالباني ٢٠٠٣ز.
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٣٩٨ - ٤٠٠.

## عەلی عبدالرحمان قەرەداغی (١٠٤٥)

ناوی عەلییە، کوڕی شێخ عبدالرحمانی (ابن الخیاط)ی کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی مەحمودی کوڕی طاهایە، عەشیرەتی (شکاك)ە، ساڵی ١٢٩٢ك - ١٨٧٥ز لە گوندی (قەرەداغ) سەر بە (سلێمانی) هاتووتەدنیا.

لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، هەروەها ماوەك لە لای شێخ محەممەد (خیاط) و ماوەك لای شێخ عبداللطیف و ماوەك لەلای شێخ مەعروف بوو، ساڵی ١٣٠٢ك - ١٨٨٤ز لەگەڵ باوکی چووە (بەغدا)، ماوەکیش لە خزمەت باوکی خوێند، دوایی چووە لای شێخ عبدالوەهابی نائیب.

- ساڵی ١٩٠١ز کرا (مدرس) لە قوتابخانەی (الرشدیة) لە (بەغدا)
- ساڵی ١٩٠٧ز کرا (مدرس) لە قوتابخانەی دواناوەندی مەلەکی.
- ساڵی ١٩٠٩ز کرا (موفتی) قەزای (عەزیزییە).
- ساڵی ١٩١٠ز کرا (مدرس) لە جێگای باوکی لە قوتابخانەی (ئەبو یوسف).
- دوایی کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی (باباگوڕگوڕ) لە گەڕەکی (ڕەصافە).

- ساڵی ١٩٢٢ز شێخ مەحمودی حەفید، لە کابینەی حکومەتی کوردستان هەڵیبـژارد بۆ وەزیری شەرع و عەدالـەت، بەڵام لەبەر چەند هۆیەك نەیتوانی ئـەم کـارە ئـەنجام بدا، هەر لە بەغدا ماوە.
- ساڵی ١٩٢٣ز کرا مەلا لە مزگەوتی (حەیدەرخانە) لە بەغدا.
- ساڵی ١٩٢٦ز کرا یاریدەدەری (مدرس) لە مزگەوتی ئیمام ئەعزەم.

لە ٢/١١/١٩٣٣ز لە بەغدا کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕسـتانی ئیمـامی ئـەعزەم بە خاك سپێردرا، مامۆستا حاشیەی لەسەر (تنبیة الاصدقاء)ی باوکی هەیە.

سەرچاوەکان:


١. لب الألباب ٢/٣٩٠.
٢. ستاندەر ١٩ – ٢٠/ ٢٠٠٧ز.


## عەلی عبدالعزیز هەڵەبجەیی (١٠٤٦)

ناوی عەلییە، کوڕی مەلا عبدالعزیزی کوڕی محەممەدی کوڕی مصطەفای کـوڕی حەسەنە، ساڵی ١٩٢٩ز لە گوندی (پریس)ی سەرەوە نزیك (هەڵەبجە) هاتووتـەدنیا، لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد ماوەك چووە لای مەلا عبدالقادری مەلا موئمین، دوایی چووە لای مـەلا عوسمـانی بـرای، ساڵی ١٩٥٢ز چووە لای مەلا صالح عبدالکریمی ئامۆزای، لـەوێ کۆتـایی بـە خوێنـدن هینا.

ئەمجا لە جێگای باوکی بووە مەلا، دەستی کـرد بـە جێبـەجێ کردنـی کاروبـاری مەلایەتی و ئامۆژگاری خەڵکان، ساڵی ١٩٥٣ز کرا (مدرس)، ساڵی ١٩٥٩ز کرا پـێش نوێژ و وتارخوێن لە مزگەوتی عازەبانی لە (سلێمانی)، سـاڵی ١٩٦١ز چـووە مزگـەوتی محەممەد پاشای گەورە لە (هەڵەبجە)، ساڵی ١٩٧١ز کرا بەڕێوەبەری قوتابخانـەی ئـاینی لـە (هەڵەبجە)، مامۆستا لەبەر ئەوەی بەشداری کرد لـە شۆڕشـی ئـازادی کـورد، لـە لایـەن ڕژێمی (بەعس) دورخراوە لە کوردستان، جارەك بۆ (ئەنبار) دوایی بۆ (فەللوجـە) پاشـان

بۆ (زیقار) ئەمجارە بۆ مزگەوتی (صلیخ) لە بەغدا، ساڵی ١٩٧٨ز گەڕاوە (هەڵەبجە)، پاشان لە گەڵ مامۆستا مەلا عوسمانی برای (بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستانی عێراق)یان پێکهێنا، کە تاقمەکی چەکدار بوون، پاش ئەوەی مامۆستا مەلا عوسمان بێ هێز بوو بووە سەرۆکی بزووتنەوە لە جێگەی ئەو، لەو کاتەوە زۆربەی دانیشتنی لە دەرەوەی وڵات بوو.

کۆچی دوایی: ساڵی ٢٠٠٧ز لە نەخۆشخانەیەکی (ئەمریکا) کۆچی دوایی کرد، لە (هەڵەبجە) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: تأريخ علماء بغداد ٥١٨.

## عەلی عبدالله باداوەیی (١٠٤٧)

ناوی عەلییە، کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی مەلا حەسەنە، ساڵی ١٨٧٥ز لە گوندی (باداوە) نزیك خەلەکان هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (کۆیە) لای مەلا حەسەن، پاشان چووە لای جەنابی مەلا محەممەدی جەلی زادە، ماوە لەوێ تا ئیجازەی وەرگرت، بووە مەلا لە (باداوە) دوایی چووە (هیران)، پاشان گەڕاوە (کۆیە) بووە مەلای مزگەوتی (منارە) لە گەڕەکی قەلعە، ساڵی ١٩٤٣ز کۆچی دوایی کرد، مەلا محەممەدی کوڕی: لە ١٩٠٠ز لە دایك بوو لای مەلا طاهای شەقلاوە و مەلا شێخ طاهای بالیسانی خوێند، ئیجازەی لە مەلا محەممەدی جەلی زادە وەرگرت، بووە مەلا لە مزگەوتی (منارە) دوایی هاتە مزگەوتی (فاطمە خان) لە (هەولێر) لە ١٩٧٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. محمد بن عبدالله الجلي ١٢٨.

٢. دەستنووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عەلی عبدالله بەدلیسی (١٠٤٨)

ناوی عەلییە، کوڕی عبداللەیە، خەڵکی (بەدلیس)ە، مەزهەبی حەنەفی بووە، زانایەکی دەست باڵا بووە لە تەفسیری قورئانی پیرۆز و تەسەووف، لە ٩٠٠ك – ١٤٩٤ز کۆچی دوایی کردووە.

دانراوەکانی:

١. جامع التنزیل والتأویل: پێنج بەرگی گەورەیە، تەفسیرە.

٢. شرح اصطلاحات الصوفیة.

٣. الکنز الخفي في بیان مقامات الصوفي.

سەرچاوەکان:

١. کشف الظنون ٢/١٥١٤.

٢. هدیة العارفین ١/٧٣٨.

٣. معجم المؤلفین ٧/١٣١.

## عەلی عبدالله بەندەنیجی (١٠٤٩)

ناوی عەلییە، نازناوی (ئەبولحەسەنە) کوڕی عبداللەیە، خەڵکی (بەندەنیج – مەندەلی)یە، دەرسی لەلای ئەبو حامیدی ئەسفەرائینی خوێندیە، زانایەکی مەزنی مەزهەبی شافیعی بووە، لە بابەتەکان شارەزا بووە، چەند ساڵان لە (بەغدا) دەرسی داوە ماوەك کرا قازی شەرعی، پاشان گەڕاوە (بەندەنیج) هەر لەوێ ساڵی ٤٢٥ك – ١٠٣٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. طبقات الفقهاء ١٠٨.

٢. تأریخ أربیل ٢/٤٣٨.

٣. معجم المؤلفین ٨/٣٤.

## عەلی عبدالله بێتواتەیی (١٠٥٠)

ناوی عەلییە، کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی مەلا محەممەدئەمینی کونەفلوسەیە، نازناوی (ئال مدرس)ە، ساڵی ١٩٢١ز هاتووتەدنیا، لە خزمەت باپیری دەستی کرد بە خوێندن، لە کتێبی (جامی) چووە لای مەلا عبدالقادری سوریژەی لە مزگەوتی خۆیان لە (هەولێر)، دوایی چووە (بێلینگە) لای خاڵی مەلا عبدالمجید، ماوەك چووە (دارەبەن) لای مەلا خدری دەشتی، گەڕاوە (هەولێر) ماوەك چووە لای مەلا صالحی کۆزەپانکەی، هاتەوە خزمەت باوکی کۆتایی بە خوێندن هێنا، ساڵی ١٩٥٣ز ئیجازەی وەرگرت، کرا واعیز لە (مەندەلی)، دوایی گەڕاوە مزگەوتی حاجی قادر لە (هەولێر)، دوایی کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی موفتی و ووتارخوێن لە مزگەوتی (شێخی چۆلی).

مامۆستا بەشداری کرد، لە شۆڕشی ئازادی کورد، لەسەر فەرمانی سەرۆك مەلا مصطەفای بارزانی کرا سەرۆکی یەکیەتی زانایانی کوردستان، دوایی گەڕاوە (هەولێر)، ڕژێمی بەعس دووری خستەوە لە کوردستان، ناردرا بۆ مزگەوتێك لە ناو (دیفاع)، دوایی گەڕاوە (هەولێر)، لە ٨/٤/٢٠٠٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. نادي الإسلام ٢ – ٤.
٢. أربيل في مختلف العصور ١٣٤.
٣. علماء ومدارس في أربيل ٩٧.
٤. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٣/١٠٥ – ١٠٨.
٥. محمد بن عبدالله الجلي ١٣١.

## عەلی عبدالله سروجی (١٠٥١)

ناوی عەلییە کوڕی عبداللەی کوڕی محەممەدی کوڕی ئەبوسرورە، خەڵکی (سروج)ی جزیرەیە، شەرع زان و مێژووناس بووە، کتێبی (بلغة الظرفاء في ذكر تواريخ الخلفاء)ی داناوە، پاش ساڵی ٦٤٨ك – ١٢٥٠ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: معجم المؤلفين ٧/١٤٠.

## عەلی عبدالله عەبدالانی (١٠٥٢)

ناوی عەلییە کوڕی عبداللەی کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئیسماعیلە، ساڵی ١٠٧٤ك – ١٦٦٣ز لە گوندی (عەبدالان) نزیك (کۆیە) هاتووتەدنیا، هەر لەوێ خوێندی، دوایی تەریقەتی قادری لە شێخ ئیسماعیلی عەبدالانی وەرگرت چەند جاران سەفەری کرد، بۆ (حەلەب)، دوایی لە (دیمشق) نیشتەجێ بوو، پاشان چووە (مەککە)ی پیرۆز لەوێ لە خزمەت زانایەکانی خوێند، هەروەها بە خزمەت شێخ عبدالعزیزی هیندی نەقشبەندی گەیشت، سەفەری بۆ (ئێران) و (میصر) کرد، ماوەی سێ ساڵان خەریکی ئامۆژگاری خەڵکان بوو.

مامۆستا زاتەکی بە دین و دڵپاك بوو، فەقێیەکانی دەڵێن کە بە سەفەر دەچوو خوای گەورە ڕێی دووری بۆ نزیك دەکردەوە، محەممەد خەلیل مرادی خاوەنی کتێبی (سلك الدرر) دەڵێ: {شا مصطەفا خان لە دووی نارد، ساڵانە مووچەی (٢٥٠٠) قرۆشی بۆ بڕییەوە، مامۆستا نەیویست، شا جەختی لەسەر کرد وەربگری، ئەمجا وەری گرت، بەڵام هەر هەمووی لەسەر ڕەفیقەکانی دابەش کرد، تەنیا یەك قرۆشی بۆ خۆی گێڕاوە، پاشان شا داوای دوعای لێ کرد، کە لە جەنگی دژی (طەهماسب)ی ئێران سەربکەوی، مامۆستا دوعای بۆ کرد، طەهماسب تەفر و توونا بوو شکا}.

کۆچی دوایی: لە ١٠ی مانگی صەفەر، ساڵی ١١٧٩ك – ١٧٦٥ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی خوار کێوی (قاسیون) بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. سلك الدرر ٣/٢١٨ – ٢١٩.
٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٩٥.
٣. علماء ومدارس في أربيل ٨٨.
٤. مشاهير الكورد ٢/٨٠.

٥. تأريخ السليمانية ٢٧٦.

٦. معجم أعلام الكورد ٤٨٩ – ٤٩٧.

## عەلی عبدالله قوچە برباسی (١٠٥٣)

ناوی عەلییە، کوڕی عبداللّەی کوڕی بایزە، عەشیرەتی (پەرچەم)ە، ساڵی ١٩٢٠ز لە گوندی (گردمەلا) هاتووتەدنیا، هەر لەو گوندە لای مەلا طەیب دەستی کرد بە خوێندن، دوای ماوەك لە لای مەلا سەید محەممەدی پیرداودی بوو، ماوەك چووە لای مەلا عومەری تەرجانی، ماوەك لای مەلا مەعصومی هەورامی، ماوەك لای مەلا محەممەد نەبی، ماوەك لای مەلا عبدالعزیزی شیلەخانی، لە ١٨/١١/١٩٥٠ز چووە (بەغدا) لای محەممەدی قزلجی کۆتایی بە خوێندن هینا، لە ٢١/٤/١٩٥٢ز کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی شێخ مەعروفی کەرخی، لە ١٩٥٣ز چووە مزگەوتی (قەنبەر عەلی)، لە ١٩٥٤ز چووە مزگەوتی خضر بەگ، لە ١٩٧٦ز چووە مزگەوتی (ئوزبەگ)، هەروەها (مدرس) بوو لە مزگەوتی ئەمین پاچەچی و لە پەیمانگای ئیسلامی لە بەغدا، لە ٩/٥/١٩٨٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تأريخ علماء بغداد ٥٠٩.

## عەلی عبدالله وەلزی (١٠٥٤)

ناوی عەلییە، کوڕی مەلا عبداللّەی کوڕی مەلا عبدالقادری کوڕی مەلا فەوزییە، خەڵکی گوندی (وەلزێ)یە، لە ناوچەی بالەکان، ساڵی ١٣١٠ك – ١٨٩٢ز لە گوندی (پەسوێ) هاتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، زانستەکانی تەواوکرد، هەر لەلای ئەو ئیجازەی وەرگرت.

مەلایەتی: کۆتایی بە خوێندن هینا، دەستی کرد بە کاروباری مەلایەتی، دەرسدانەوەی فەقێیان، خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، مامۆستا زانایەکی ئاگاداربوو، لە مەلایە چاکەکانی سەردەمی خۆی بوو.

کۆچی دوایی: شەوی هەینی، لە گوندی (حەمامیان)ی ناوچەی (بۆکان) ساڵی ١٩٧٤ز لە تەمەنی هەشتاو دوو ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. ژیناوەری زانایانی کورد ٢٣٧.

٢. تأریخ فرهنگ وأدب مکریان ٢٩٢ – ٢٩٣.

## عەلی عبدالملك بەندەنیجی (١٠٥٥)

ناوی عەلییە نازناوی عیمادەدینە، کوڕی عبدالملیکە، خەڵکی (مەندەلی – بەندەنیجە)، زانایەکی مێژووناس و شەرع زان و ڕێزمان زان و نووسەر و ڕۆشنبیر بووە، لە قوتابخانەی (النظامیة)ی (بەغدا) دەرسی داوە، کتێبی (بغیة المستعجل في نسب النبي صلی الله علیه وسلم وتواریخ الخلفاء)ی داناوە، لە ٦٥٦ك – ١٢٥٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: معجم المؤلفین ٧/١٤٢ – ١٤٣.

## عەلی عبدالواحد دینەوەری (١٠٥٦)

ناوی عەلییە، نازناوی (ئەبولحەسەنە) کوڕی عبدالواحیدە، خەڵکی (دینەوەر)ە، مامۆستای (ابن الجوزی)یە، لە زانیاری قورئانی پیرۆز شارەزا بووە، لە مانگی جیمادی دووەم، ساڵی ٥٢١ك – ١١٢٧ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٤/٦٤.

٢. معجم المؤلفین ٧/١٤٣.

## عەلی عبدالوەهاب عێراقی (١٠٥٧)

ناوی عەلییە کوڕی عبدالوەهابی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عبدالرحیمی کوڕی حوسێنی حافیزی عێراقییە، مەزهەبی شافیعی بووە، لە (قاهیرە) دانیشتووە، دەوری ساڵی ٨١٠ك – ١٤٠٧ز هاتووتەدنیا، قورئانی پیرۆز و چەند کتێبی لەبەر کرد، ماوەك لە

خزمەت باپیری خوێند، کە باپیری کۆچی دوایی کرد ئـەویان لـە شـوێنی دانـا، خـەریکی کاروباری ئاینی و دەرسدانەوە بوو، لە ٨٣٣ك – ١٤٣٠ز ١٦ی ڕەمەزان، شەوی شەمە، کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الضوء اللامع ٥/٢٢٩.

## عەلی عثمان هەولێری (١٠٥٨)

ناوی عەلییە، کوڕی عوسمانی کـوڕی عـەلی کـوڕی سـولەیمانی صـوفی یـە، بـە (هەولێر)ی ناسراوە، جاریش وابوو ناویان دەبـرد بـە (سـلێمانی)، (القصـیدة الفـاخرة)ی داناوە لـە هەر بەیتەك جۆرە جوانکاریەکی تێدایـە، سـاڵی ٦٧٠ك – ١٢٧١ز لـە شـاری (ئەلفیوم) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. فوات الوفیات ٣/٣٩.
٢. مشاهیر الکورد ٢/٧٢.
٣. هدیة العارفین ١/٧١٢.
٤. معجم المؤلفین ٧/١٤٧.
٥. الأعلام ١/٢٧٥ /٥/١٢٥ /١٠/١٥٢.
٦. معجم أعلام الکورد ٤٨٩.

## عەلی عەلی ئەخلاتی (١٠٥٩)

ناوی عەلیە کوڕی عـەلی کـوڕی محەمـەدی کـوڕی حەسـەنە، خـەڵکی شـاری (ئەخلاتە) نزیك دەریای (وان)، نازناوی عەلائەدینە، مەزهەبی حەنەفی بووە، لـە ٧٥٨ك – ١٣٥٦ز کۆچی دوایی کردووە، (کتاب السیرة) و (شـەرحی (هدایـە)ی مـەرغینانی) لـە فیقهی حەنەفی داناوە.

سەرچاوە: هدیة العارفین ١/٧٢٣.

## عەلی عەلی پەرپیتانی (١٠٦٠)

ناوی عەلییە کوڕی عەلی کوڕی محەممەدئەمینە، ساڵی ١٨٩٢ز هاتووتەدنیا، بابی کۆچی دوایی کرد، نادریانە خانەقای شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی لە (هەولێر)، لەوێ شێخ لەگەڵ منداڵە بێ باوکەکانی دی بەخێوی کرد و لەبەر خوێندنی دانا، بە کوڕەکانی دەرسی پێدا، دوایی چووە گوندی (بنەسراوە)ی گەورە لای مەلا ئەحمەدی ئاشوکانی. دوایی چووە (پەرپیتان) لای مەلا حوسێنی ئاشۆکانی، هەروەها ماوەك لە (ترپەسپیان) بوو لای مەلا شێخ جەلال، ماوەکیش چووە (مورتکە) ماوەکیش لە (گردمەلا)ی خوێند، کۆتایی بە خوێندن هینا.

مەلایەتی: بووە مەلا لە (پەرپیتان)، دوایی چووە (سەرسوول)، گەڕاوە (پەرپیتان)، چووە (هەرشەم)، گەڕاوە (پەرپیتان)، چووە (گردجۆتیار)، لەوێ باری کرد بۆ (گردارەق)، لەوێ چووە (قەپەکیان)، گەڕاوە (پەرپیتان)، لە ١٣/١٠/١٩٨١ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی نزیك (بەستۆرە) بە خاك سپێردرا.

خووڕەوشتی: مەلایەکی بە دین و ئەخلاق چاك بوو، بێ نەفس و بێ فیز بوو، قسەخۆش و مەجلیس ئاوەدان بوو، بە زەوق و سوحبەتچی بوو، بەشێکی لە قورئانی پیرۆز لەبەر بوو، لە کۆبوونەوانی ئایینی دەیخوێندەوە، جەنگنامەی (بەهنەسا)ی زۆر بە سۆز دەخوێندەوە، زۆرجاران لەگەڵی دەگریا، دوا عمری چووە (حەج)، ئەو بەیتە عەرەبییەی زۆر لە زمانی خۆش بوو، پاش نوێژان دەیگۆت:

إلهي لست للفردوس أهلا ولا أقوى على نار الجحيم

فهب لي توبة واغفر ذنوبي فإنك غافر الذنب العظيم

کوڕەکانی: مامۆستا پێنج کوڕی هەبوو:

١. مەلا عبدالحمید: لە کاتی فەقێیەتی جوانەمەرگ بوو.
٢. مەلا محەممەد: لە گوندی (شەوزار) مەلا بوو، لە پێش باوکی کۆچی دوایی کرد.

٣. مەلا جەمیل: لە بەحرکە لای کاکم مەلا طەییب خوێندنی بردەسەر، لە شوێنی باوکی مەلایە لە (پەرپیتان)، کورانی ویش (عبدالباسط) و (عبدالسلام) مەلانە خوای گەورە ئەو زنجیرەیە نەبڕێنتەوە بۆ خزمەتی ئایین.

٤. مەلا ئیسماعیل: لە مزگەوتی (سپی) لە هەولێر (بانگبێژ)ە.

٥. حاجی ئەحمەد.

سەرچاوە: چەند چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا و مەلا جەمیلی کوڕی.

## عەلی عەلی شێخ وەتمانی (١٠٦١)

ناوی عەلییە، کوڕی مەلا عەلی کوڕی مەلا محەممەدی، کوڕی مەلا کاك عبدالله ی، کوڕی مەلا مەحمودە، ساڵی ١٨٦٥ز لە گوندی (شێخ وەتمان) هاتووتەدنیا، کاتی ئەو مەلۆتکە بوو، لە باوکیان پرسی: چ ناوەك باشە بۆ ئەو کوڕەت دابنێ، مەلا عەلی وەڵامی داوە، {خۆی ناوی بۆ پەیدا دەبێ} چەند ڕۆژ بە سەرچوون مامۆستا کۆچی دوایی کرد، کوڕەکەیان ناولێنا (عەلی) بە ناوی بابی، لە گوندەکەی خۆیان دەستی کرد بە خوێندن، لەلای مەلایە چاکەکان خوێندنەکەی بردەسەر، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، لە شێخ وەتمان بووە مەلا، دەستی کرد بە دەرسدانەوەی فەقێیان، مەدرەسەی ئاوەدان بوو، لە مەلا عبدالقادری ناوبەرگەی دەگێڕنەوە دەڵێ: من و مەلا کاك ئەحمەدی ناوبەرگە لەو کاتە دیتمان دەوری پەنجا فەقێ لەوێ بوون.

بەشێك لەو فەقێیانە: مەلا ئەحمەد ناوبەرگەی، مەلا محەممەدی پەرچەم، مەلا محەممەدی یەکدەست، مەلا شێخ سەعیدی زینوێ، مەلا محەممەدی کوڕی خۆی: دەورووبەری ساڵی ١٩٣٠ز لە شێخ وەتمان مەلابوو، دەرسی دەداوە.

مامۆستا چەند کورتە حاشیەی لەسەر کتێبانی خوێندن هەیە، لە کۆتاییدا دەینووسی (علي علي).

مامۆستا کاتی ڕوسیا هێرشی هێنا بۆسەر کوردستان، لەگەڵ مەلا و فەقێیان دەستی دا چەك، بەرگریان کرد لەشکری موسوڵمان ڕوسیان شکاند، مامۆستا لەگەڵ

چەند چەکداران لە دوویان نەبونەوە تا (ڕەزائییە)، ساڵی ١٩٢٤ز لە شێخ وەتمان کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندز ١٠٥ – ١٠٦.

٢. نامەی مەلا محەمەد عبدالرحمان شێخ وەتمانی.

## عەلی عومەر جزیری (١٠٦٢)

ناوی عەلی‌یە کوڕی عومەری کوڕی عبدالرحیمی کوڕی بەدری (جزیری)یە، لە (دیمشق) دانیشتووە، خەریکی خوێندنی فەرموودە بووە، لەو بابەتە دەرسی داوە، زانایەکی دەست ڕەنگین بووە، نەخش و چنینی چاك زانیوە، دوا عـەمری گـوێی زۆر گـران بـوون. ساڵی ٧٨٩ك – ١٣٨٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/٣٠٨.

٢. معجم أعلام الكورد ٤٩٠.

٣. الدرر الكامنة ٣/٨٨ – ٨٩ ، بەڵام ساڵی ٧٧٩ك – ١٣٧٧ز بۆ کۆچی دوایی داناوە.

## عەلی عومەر حەڕانی (١٠٦٣)

ناوی عەلییە کوڕی عومەری کوڕی ئەحمەدی کـوڕی عـەماری کـوڕی ئەحـمەدی کوڕی عەبدوسی حەڕانیە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، زانایەکی شەرع زان و بە دین بووە، لە (بەغدا) دەرسی داوە، ئامۆژگاری خەڵکانی کردووە، لە ٥٠١ك – ١١٠٧ز هاتەدنیا، لە ٥٥٦ك – ١١٦٠ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکـانی: (تفســير القـرآن الكـريم) و (مجـالس في الـوعظ) و (المـذهب في المذهب).

سەرچاوەکان:

١. الذيل على طبقات الحنابلة ٣/٢٤١ – ٢٤٤.

٢. هدية العارفين ٥/٦٩٨.

٣. شذرات الذهب ٤/١٨٣ – ١٨٤.

٤. معجم المؤلفين ٧/١٥٧.

## عەلی عەمر حەڕانی (١٠٦٤)

ناوی عەلییە کوڕی عەمری کوڕی عەلییە، نازناوی (ئەبولحەسەنە) خەڵکی حەڕانە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، لە (بەغدا) شەریعەتی خوێندووە زانایەکی بە دین بووە، ساڵی ٤٨٨ك – ١٠٩٥ز لە (سروج) کۆچی دوایی کرد، برادەرەکی دەڵێ: {لەو شەوە لە خەودا سێ جار گازیان کردم، هەستە چواریەکی ئیسلام ڕوخاوە، دواجار پێیان گوتم عەلی عەمری حەڕانی کۆچی دوایی کردووە، کە واگا هاتم ڕاست بوو، کۆچی دوایی کردبوو.

سەرچاوەکان:

١. الذيل على طبقات الحنابلة ٣/٨٦ – ٨٧.

٢. طبقات الحنابلة ٢/٢٤٩.

## عەلی عومەروانی (١٠٦٥)

ناوی عەلییە کوڕی عومەری کوڕی ئەبوبەکرە، خەڵکی (وان)ە، ساڵی ٦٣٧ك – ١٢٣٩ز هاتووتەدنیا، چوویتە (ئەخلاط) پاشان لە (میصر) دابەزیوە لە زانیاری فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) شارەزا بووە، ماوەك چاوەکانی تاری بوون، پاشان چابوونەوە، لە مانگی (محرم)ی ساڵی ٧٢٧ك – ١٣٢٦ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٩٣.

## عەلی عیسا هەولێری (١٠٦٦)

ناوی عەلییە کوڕی عیسای کوڕی فەخرەدین ئەبولفەتح ی ئەمیر (هەولێر)ییە. زمان زان و ڕێزمان زان و نووسەر و ڕۆشنبیر بووە، ساڵی ٦٩٢ك - ١٢٩٣ز کۆچی دوایی کردووە.

چەند دانراوی هەیە، لەوانە: (طیف الانشاء): ناسراوە بە (رسالة الطیف) و (التذكرة الفخرية) و (شرح البلاغة للطيبي) و (المقامات الأربع) و (كشف الغمة في معرفة الأئمة): لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی ٦٨٧ك تەواوی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. فوات الوفيات ٣/٥٧.
٢. أربيل في مختلف العصور ٩٤.
٣. هدية العارفين ٥/٧١٤.
٤. مشاهير الكورد ١/٧١ /٢/٧٢ - ٧٣ - ٨٩.
٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٨٦.
٦. معجم المؤلفين ٧/١٦٣.
٧. الأعلام ١/٢٧٥ /٥/١٣٥ /١٠/١٥٣.
٨. معجم أعلام الكورد ٤٩١ - ٤٩٢.

## عەلی فتح الله زەنگەنە (١٠٦٧)

ناوی عەلی یە کوڕی فتح الله یە، ساڵی ١٩١٢ز لە گوندی (زالواو) ناوچەی (زەنگەنە) شارۆچکەی (قادرکەرەم) هاتووتەدنیا، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد کتێبە سەرەتاییەکانی تەواو کرد، قۆناغی سوختەیی و موستەعیدی بڕی، لە قۆناغی کۆتایی چووە (کەرکوك) لای مەلا ناصیح ئەفەندی، ماوە تا تەواوی کرد، ئیجازەی وەرگرت، ساڵی ١٩٣٩ز کرا پێش نوێژ و وتارخوێن لە مزگەوتی حەسەن مەکی لە (قەڵا)، ساڵی ١٩٤٨ز بووە مەلای مزگەوتی نائیب لە گەڕەکی (ئەخی حوسێن)، ساڵی ١٩٥٣ز چووە

مزگەوتی عەلی بەگ، ساڵی ١٩٧٢ز لەگەڵ مامۆستا عبدالمجيد قوطب و عەلی طاڵەبانی چوونە سەردانی سەرۆك مەلا مصطەفای (بارزانی).

مامۆستا هەستی کوردایەتی و نیشتمان پەروەری لە دڵدا هەبوو، بۆیە چەند جاران لەلایەن ڕژێمی (بەعس) تووشی بەندیخانە دەهات. مامۆستا لە قوتابخانەی پەیمانگای ئیسلامی دەرسی دەدا، واعیز بوو ئامۆژگاری خەڵکانی دەکرد، سەرۆکی لیژنەی فەتوای شەرعی کەرکوك بوو.

بەشێك لە فەقێیەکانی: محەممەد سەعید باغەنجیری، مەلا مەحمود شێخ بزێنی، محەممەد مصطەفا سەعید، د. موحسین عبدالحميد، د. محەممەد ڕەمەزان، د. عیرفان عبدالحميد.

برادەرەکانی: شێخ مەحمودی حەفید، شێخ عبدالكريم قادرکەرەم، شێخ کاکەی (هەولێر)، سەید ئەحمەدی خانەقا، شێخ جەمیلی طاڵەبانی، عەلی ئەفەندی (خادم السجادة).

مامۆستا زاتەکی خێرخواز و پڕ سوودبوو، خەریکی ئامۆژگاری بوو، خەریکی پێکهێنانەوە بوو، ساڵی ١٩٨٥ز پارچە زەویەکی لە حکومەت وەرگرت، بە خێرخوازان لە گەڕەکی (ڕەحیماوە) مزگەوتی لەسەر دروست کرد، قوتابی خۆی مەلا مەحمود شێخ بزێنی لەسەر دانا، ئێستا دەناسرێ بە مزگەوتی (عەلی کوڕی ئەبو طاليب) (خوا لێی ڕازی بێ).

کۆچی دوایی: لە ٥/١/٢٠٠١ز لە (بەغدا) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی شێخ محیەدین، نزیك تەکیەی طاڵەبانی لە کەرکوك بە خاك سپێردرا.

کوڕەکانی: نورەدین و عیزەدین و عبدالمجيد، وە مەلا محەممەد: پێش نوێژ و وتارخوێنە، لە مزگەوتی (العطا) لە (بەغدا).

سەرچاوەکان:

١. بنەماڵەی زانیاران ٦١١.
٢. نامەی مەلا مەحمود شێخ بزێنی.

## عەلی فەضل الله مەرعەشی (١٠٦٨)

ناوی عەلییە، کوڕی فەضل اللّٰەی کوڕی محەممەدی (مەرعەشی)یە، مەزهەبی شافیعی بووە، زانایەکی شەرع زان بووە، شەرحی لە سەر کتێبی ئیمامی غەزالی کردووە بە ناوی: (مواهب العزیز في شرح الوجیز)، ساڵی ١١٣٤ك – ١٧٢١ز کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ٧/١٦٦.

٢. هدیة العارفین ١/٧٦٥.

٣. إیضاح المکنون ٢/٦٠٢.

## عەلی قاسم سابلاغی (١٠٦٩)

ناوی عەلییە کوڕی قازی میرزا ئەبوقاسمی کوڕی میرزا ئەحمەدی سابلاغی یە ساڵی ١٢٧٩ك – ١٨٦٢ز لە (سابلاغ – مەهاباد) هاتووتەدنیا.

لە بنەماڵەکی ئایین پەروەر پەروەردە بووە، زیرەك و هوشیار و وریابووە، لەناو ئاوقەرانی سەرکەوتووبوو، دڵفراوان و چاوبڵند بوو، چل ساڵ خەریکی دەرسدانەوە و ئامۆژگاری بوو، یەك بوو لە پیاوماقوڵانی کوردستانی ئێران، لەبەر لێوەشانەوە کرا بە قازی، (قازی) حەزی لە مێوانداری بوو، سفرە و خوانی هەر لە گۆڕێ بوو، دەورەکی سەرەکی هەبوو، بۆ شۆڕشی کورد، بۆیە چوار جار لە بەندیخانەگیرا.

قازی یەك بوو لە فەقێیەکانی زانای بەناوبانگ (مەلا عبداللّٰەی پیرەبابی)، قازی تەریقەتی لە شێخ مەلا حەسەنی بورهانی وەرگرت، لە مزگەوتی قازی لە (مەهاباد)، قازی دانراوی خۆی زۆربوون، بەڵام هەموویان لەگەڵ پەرتوکخانە گەورەکەی مەهاباد، لە جەنگی جیهانی یەکەم فەوتان، تەنیا شەرحە فارسییەکەی نەبێ، کە لەسەر قەسیدەی (بانت سعاد)ە، لە مەدحی پێغەمبەر (د.خ)

کۆچی دوایی: بەردەوام بوو، لەسەر خزمەتی ئاینی پیرۆز، تا ساڵی ١٣٥٠ك – ١٩٣١ز کۆچی دوایی کرد، بەم بۆنەیە مەلا مارف کۆکەیی هۆنراوەکی داناوە، دەڵێ:

جەنابی موستەطاب فاضیل مەولانا عەلی قازی

رِەئیسی ئەهلی عیلم و مەرکەزی ئەفرادی رِوحانی

ز، مینایی شەرابی (کلُّ شیء هالك إلاّ)[1]

نە بۆشیدەند ئۆرا شەربەتی تەفریقی جیسمانی

ز، دیوانی قەضا فەرمانی (کلُّ مَن علیها فان)[2]

بە نامەش ئامەد ئەز دەربار رەحمەتگاهی رەحمانی

ئیجابەت کەرد روحی پاکی ئۆ (لبیك) دەعوەترا

(بدار الموت) چۆن کردەش سروشی غەیبی میهمانی

چو تەئریخی وەفاتەشرا طەلەب کەردەند نیدا ئامەد بگۆ

(هب وهو مغفور) ز، فەیضی فەضلی رِەحمانی

٧+١٧+١٣٢٦ = ١٣٥٠ ك

کورِەکانی: قازی عەلی دوو کورِی هەبوو:

١. ئەبو قاسم: صەدری قاسم، نائیبی پەرلەمانی ئێرانی و ئەندامی کۆرِی رِۆشنبیرانی (تاران) بوو.

٢. محەممەد: قازی محەممەد، سەرۆکی شۆرِش و کۆماری مەهاباد، لە مەودوا باسی دەکەین – بەئیزنی خودا –.

سەرچاوەکان:

١. مشاهیر الکورد ٣٢٠ – ٣٢٢.

٢. تأریخ مشاهیر کورد ٣/٥٨٨ – ٥٩٧.

٣. معجم أعلام الکورد ٤٩٩ – ٥٠٠.

---

[1] نیشانەیە بۆ ئایەتی: (کل شیء هالك الا وجهه)، سورەتی/ القصص ٨٨.

[2] سورەتی الرحمن ٢٦.

## عەلی قاسم شارەزوری (١٠٧٠)

ناوی عەلییە کوڕی قاسمی کوڕی مظفری کوڕی عەلی کوڕی مظفری شارەزورییە، لە (بەغدا) دەرسی لەلای محەممەدی حەسەنی باقلانی خوێندووە، لە (واسیط) کرایتە قازی، دوایی کرایتە قازی (موصل)، پاشان بۆ قازییاتی ڕەوانی (شام) کرا، لە ٥٣٢ك – ١١٣٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٨٨ – ٣٩٠.

٢. طبقات الشافعية الكبرى ٤/١٤٧.

٣. تأريخ مشاهير كورد ١/٣٧.

٤. الإكليل في محاسن أربيل ٩٠ – ٩١.

## عەلی محەممەد ئەخەلاتی (١٠٧١)

ناوی عەلییە، کوڕی محەممەدی کوڕی حەسەنە، خەڵکی شاری ئاخلاتی نزیك دەریای (وان)ە، مەزهەبی حەنەفی بووە، ناسراوە بە (قادوسی) چونکە مەندیلی قۆچ بووە هەروەها ناودەبردرا بە (رکابی)، گۆیا: رکێبی ئەسپی پێغەمبەری (د.خ) لەلا بووە، هەروەها دەڵێن: بەشێك لە (مووە) پیرۆزەکانی پێغەمبەری (د.خ) لەلا بووە، زانایەکی شەرع زان بووە، لە قوتابخانەی (ظاهرية) پێش نوێژ و دەرس بێژ بووە، لە نیوەی مانگی جیمادی یەکەم، ساڵی ٧٠٨ك – ١٣٠٨ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: چەند کتێبی داناون، لەوانە: (شرح الهداية) و (سيرة الرسول).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٧/١٩٠ – ١٩١.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٩٤.

٣. كشف الظنون ٢/٢٠٣٥.

٤. هدية العارفين ١/٧١٦.

## عەلی محەممەد بەندەنیجی (١٠٧٢)

ناوی عەلییە کوڕی محەممەدی کوڕی مەمدودی کوڕی عیسای بەندەنیجی یە، نازناوی شەمسەدینە، ساڵی ٦٤٤ك – ١٢٤٦ز هاتووتەدنیا، بەندەنیج مەندەلی یە، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، زانیارییەکی زۆری لە فەرمووده و زانستەکانی کۆکردەوە، پاشان چووە (بەغدا)، لەوێ چووە (دیمشق)، هەرچەندە پیر و بە تەمەن بوو، بەڵام دریغی نەدەکرد، لە بەلاوکردنەوەی فەرموودە، بە تایبەت صەحیحی موسلیم و تورمزی، لە ٤ ی مانگی (محرم)، ساڵی ٧٣٦ك – ١٣٣٥ز لە (دیمشق) کۆچی کرد.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٤/١٨٢.
٢. تأريخ أربيل ٤٣٨/٢.
٣. شذرات الذهب ٦/١١٣ – ١١٤.
٤. الدرر الكامنة ٣/١٢٠ – ١٢١.

## عەلی محەممەد تەوێڵەیی (١٠٧٣)

شێخ عەلی نازناوی حوسامەدینە، کوڕی شێخ محەممەد بەهائەدینی کوڕی سیراجەدین شێخ عوسمانی (تەوێڵە)یە، ساڵی ١٢٧٨ك – ١٨٦١ز هاتووتەدنیا.

دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، کتێبە سەرەتاییەکانی تەواوکرد، خەریکی خوێندنی شەریعەت و عەرەبی بوو تا شارەزا بوو، فێری زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی بوو بە چاکی، تەریقەتی نەقشبەندی لە باوکی وەرگرت، خەریکی جێبەجێ کردنی داب و دەستووری تەسەووف و دڵپاکی و دەرون پاکی بوو، لەژێر چاودێری شێخ ئەحمەدی مامی، پاشان بابی کۆچی دوایی کرد، شێخ عەلی لە شوێنی دانیشت، دەستی کرد بە ڕێ نیشاندانی خەڵکان، خزمەتی خانەقا و مریدان، چەند باخچە و زەوی و زاری لە بابی بۆ بەجێمابوو، بەروبوومەکەی هەموو خەرج دەکرد لە خانەقا، بەم شێوەیە توانی خانەقا و قوتابخانەکە فراوانتر بکا، لە چەند شوێنانی تر خانەقا دروست

بکا، خانەقای (تەوێڵە)ی گەورە کرد، باغەکانی زیادکرد، خانەقای (باغەکۆنی) ئاوەدان کردەوە، خانەقای (گوڵپی) چاکردەوە، لە (هانە نەوت)ی بیارە مێوانخانەی دروست کرد، لە (کراویە دۆلی) چیای هەورامان هاوینەهەواری ڕێکخست، لە گوندی (تەبەکەلی) سەر ناوی (زەڵم) جێگای سانەوەی مێوانانی دروست کرد، بەو هەموو زەنگینی و دەست درێژیە هەروەکو هەژارێکی بێ دەسەڵات ڕایدەبوارد، تەنیا خەریکی کاروباری سۆفیەتی و ئامۆژگاری موسوڵمانان بوو، زۆر کەراماتی لێ دەگێڕنەوە ئەوەش شایانیتی، هەرکەس بۆ خودا بێ خوداش بۆ ئەو دەبێ، بەردەوام بوو لەسەر ئەو خزمەتە، تا ساڵی ١٣٥٨ك – ١٩٣٩ز کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی هەبوو ناو محەمەد، ئەویش کوڕێکی هەبوو، ناو ئەحمەد ساڵی ١٣٤١ك – ١٩٢٢ز لە گوندی (گوڵپ) هاتەدنیا، پاشان بووە جێگری باوکی، لە ١٩٤٧ز ناوچەکە نالەبار بوو، چووە (ئێران)، دوای ئارامبوون گەڕاوە، دوایی (هەڵەبجە) بۆمباران کرا، ئاوارە بوو هاتە (هەولێر)، لەو کاتە لەگەڵ کاکم مەلا طەیب سەردانمان کرد، دوایی چووە (ئێران)، لە ١٤٠٩ك – ١٩٨٨ز کۆچی دوایی کرد، کوڕێکی هەیە ناو موعتەصەم.

سەرچاوەکان:

١. نثر الجواهر والدرر ١/٩١٦ – ٩١٧.

٢. تأريخ مشاهير كورد ٢/٥٤٤.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٠١ – ٤٠٢.

٤. بنەماڵەی زانیاران ٤١٢ – ٤١٤.

٥. یادی مەردان ٢/٨٣ – ٨٤.

## عەلی محەممەد جزیری (١٠٧٤)

ناوی عەلییە ناناوی (ئەبولحسەنە)، کوڕی محەممەدی کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالکریمی کوڕی عبدالواحیدی جزیرییە، ناسراوە بە: (ابن الأثیر عزالدین) ساڵی ٥٥٥ك – ١١٦٠ز لە جزیرەی بۆتان هاتووتە دنیا، هەر لەوێ پێگەیشتووە، پاشان لە

خزمەت باوکی و مەجدەدینی برا گەورەی و لەگەڵ ضیائەدینی برا گچکەی چووتە موصل، لەوێ خەریکی خوێندن بوو، ناوە ناوەش سەفەری بەغدای دەکرد، دوایی چووە (شـام) و (قودس) گەڕاوە (موصل)، لە ماڵەوە خەریکی نووسین بـوو، دەسـتە دەسـتە خـەڵکان بـۆ فێربوونی زانیاری دەچوونە لای، لە کۆتایی ساڵی ٦٢٧ک چـووە (دیمشـق)، لـە ٦٢٨ک چووە (حەلەب)، ماوەکی کەم لەوێ بوو گەڕاوە (موصل).

ناوبراو لە زانیاری فەرموودەی پێغەمبەر (د.خ) بەهێز بوو، لە مێـژووی کـەون و نوێ ئاگادار بوو، لە ناسینی نەتەوە و ڕەچەڵەك و ڕوداوەکانی ڕۆژگار دەستی باڵا بوو.

دانراوەکانی: چەند دانراوی بەنرخی هەیە، لەوانە:

١. الکامل: لە چاترین نووسراوەکانی مێژووە، تا ساڵی ٦٢٨ک باس دەکا.
٢. أسد الغابة في معرفة الصحابة.
٣. اللباب في تهذیب الأنساب.
٤. تأریخ الدولة الأتابکیة.
٥. تحفة العجائب في التأریخ.
٦. الجامع الکبیر.
٧. الجهاد.

کۆچی دوایی: لە مانگی شەعبانی ساڵی ٦٣٠ک - ١٢٣٢ز لە موصـل کۆچـی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الکامل / پێشەکی ٣/١.
٢. أسد الغابة / پێشەکی ١/ ٦ - ٧.
٣. شەرەفنامە / پەراوێز ١٩٤.
٤. هدیة العارفین ٥/٧٠٦.
٥. وفیات الأعیان ٣/٣٣.

٦. كشف الظنون ١/٨٢.
٧. اللباب في تهذيب الأنساب ١/٥ – ٦.
٨. أربيل في العهد الاتابكي ٢٥٩.
٩. معجم أعلام الكورد ٤٩٣ – ٤٩٤.
١٠. مشاهير الكورد ١/٦٦ – ٦٧.
١١. البداية والنهاية ١٣/١٤١.
١٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٨٤ – ٣٨٦.
١٣. شذرات الذهب ٥/١٣٧.
١٤. معجم المؤلفين ٧/٢٢٨ /١٣/٤٠٧.
١٥. منهل الأولياء ١/٢٠٢.
١٦. الأعلام ١/٧٩.
١٧. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٤١١.
١٨. سير أعلام النبلاء ١٣/ ١٨٨ – ١٨٩.
١٩. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ١/١٣٢.
٢٠. إنباه الرواة ٣/٢٦٠.

## عەلی محەممەد حصکەفی (١٠٧٥)

ناوی عەلییە کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالرحیمی کوڕی محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی ئیبراهیمی کوڕی مەسعودی کوڕی محەممەدە، خەڵکی (حصن کیفا)یە، مەزهەبی شافیعی بووە، بۆ خوێندن چوویتە (موصل)، لەوێ چوویتە (دیمشق) لای زانایەکانی وێندەری خوێندووە، بە پێیان چوویتە (حەج)، گەڕایتەوە (حەلەب) لای مەلا عوسمانی کوردی و چەند زانایانی خوێندووە، تەواوی کردووە، دەرسی داوە، دوایی کرایتە (موفتی).

مامۆستا لە نەحو و صەرف و مەنتیق و عەروز و قەوافی شارەزابوو، شاعیرەکی چاك بوو، چەند مەتەڵی هۆنراوەی لە شەریعەت داناوە، لە ڕۆژی سێ شەمەی ٧ی مانگی شەووال ساڵی ٩٢٥ك – ١٥١٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٧/١٣٧ – ١٣٨.

٢. معجم أعلام الكورد ٤٩٤ – ٤٩٥.

## عەلی محەممەد حصکەفی (١٠٧٦)

ناوی عەلییە، کوڕی محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی مەنصوری کوڕی ئەبو لوطفە، خەڵکی (حصن کیفا)یە، مەزهەبی شافیعی بووە، ساڵی ٨٥٧ك – ١٤٥٣ز لە (قودس) هاتەدنیا، لە زووەوە باوکی کۆچی دوایی کرد، لەلای مامۆستا عومەر حەنبەلی ئەشعەری پەروەردە بوو، قورئانی پیرۆزی لەبەرکرد، لەگەڵ (شاطبیة) و (ئەلفیة) و (مینهاج) و (جمع الجوامع)، زانستەکانی قورئانی پیرۆزی تەواوکرد، ماوەی دە ساڵان بوخاری شەریف و چەند کتێبی تری لەلای کەمالی کوڕی ئەبو شەریف خوێند.

ساڵی ٨٧٣ك سەفەری (قاهیرە)ی کرد، ساڵی ٨٧٤ك چووە (شام) تا ساڵی ٨٧٨ك لەوێ خەریکی خوێندن بوو، پاشان لە (دیمشق) کرا مودەرریس، ساڵی ٨٨٠ك – ١٤٧٥ز کرا وتارخوێنی مزگەوتی (بلبغا)، هەروەها ئیجازەی فەتوا و دەرسدانەوەی پێدرا، مامۆستا جگە لە مەلایەتی نووسەر و شاعیرەکی بە توانا بووە، نمونەی شیعرەکانی تێهەڵکێش لەگەڵ قەسیدەی بودرییە، دەڵێ:

قال الرفاق استعدوا، من أجل أهلٍ ومال

فقلت مِن عِظَم مابي: (يا أكرم الخلق مالي)

يا مَن يخاف عِداه، اذا المذاهب أعيت

بالله ثِق وتحصَّن، (وقاية الله أغنت)

سەرچاوە: الضوء اللامع ٥/٢٩٠ – ٢٩١.

## عەلی محەممەد دیاربەکری (١٠٧٧)

ناوی عەلییە کوڕی سەید محەممەدی شافیعی یە چوویتە (قاهیرە)، لەوێ لە قوتابخانەی (ئەحمەدییە) کرایتە (مدرس)، دوایی چوویتە (مەککە)ی پیرۆز لەوێ مایتەوە تا ساڵی ١١٦٦ك – ١٧٥٢ز کۆچی دوایی کردووە، شەرحی (درر الأعلی)ی شێخ محیەدینی عەرەبی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. هدیة العارفین ٥/٧٦٨.

٢. معجم المؤلفین ٧/٢٠٢.

## عەلی محەممەد دیاربەکری (١٠٧٨)

ناوی عەلییە کوڕی محەممەدی کوڕی ساله، ساڵی ٥٥١ك – ١١٥٦ز لە (دیاربەکر) هاتووتەدنیا، زانایەکی بە توانا بووە، بەتایبەت لە ئوصول و لە فیقه دەستی باڵا بووە، لە سەرەتاوە لەسەر مەزهەبی ئیمامی ئەحمەد بوو، پاشان بۆ خوێندن چووە (بەغدا)، لەوێ هاتە سەر مەزهەبی ئیمامی شافیعی، ئەمجا چووە (شام) خەریکی زانیارییەکانی ئەقلی بوو، واشارەزابوو لە چەرخی خۆی کەم وێنە بوو، دوایی چووە (میصر) لە قوتابخانەکەی نزیك گۆڕی ئیمامی شافیعی دەرسی دەدا، دوایی چووە شاری (حەما)، ساڵی ٦٣١ك – ١٢٣٣ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: چەند دانراوی هەیە، لەوانە: (أبکار الأفکار) و (منائح القرائح) و (رموز الکنوز) و (دقائق الحقائق) و (لباب الألباب) و (منتهی السول في الأصول).

سەرچاوەکان:

١. کشف الظنون ٢/١٨٥٧.

٢. طبقات الشافعیة الکبری ٤/٤١٥ – ٤١٦.

٣. شذرات الذهب ٥/١٤٤ – ١٤٥.

٤. البدایة والنهایة ١٣/١٤٣.

٥. مشاهير الكورد ١/٧٤.
٦. الأعلام ١/١٨ /٣/٢١٨ /٥/١٥٣.
٧. معجم أعلام الكورد ٤٨١ - ٤٩٢ - ٤٩٣.
٨. معجم المؤلفين ٧/١٥٥.
٩. وفيات الاعيان ٢/٤٥٥ - ٤٥٦.
١٠. هدية العارفين ١/٧٠٧.
١١. إيضاح المكنون ١/٢٨١.

### عەلی محەممەد دیاربەکری (١٠٧٩)

ناوی عەلییە کوڕی محەممەدە، خەڵکی (دیاربەکر)ە، ناوبراوە بە موفتی شافیعیان، تەفسیری سورەتی (فاتیحە)ی کردووە بە پیتی بێ نوقتە، ئەوەش چالاکیە، کارەکی ئاسان نیە، لە ١٢١٠ک - ١٧٩٥ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:
١. معجم المؤلفين ٧/١٩٠.
٢. إيضاح المكنون ٣/٣٠٧.
٣. هدية العارفين ١/٧٧٢.

### عەلی محەممەد دینەوەری (١٠٨٠)

ناوی عەلییە کوڕی محەممەدی کوڕی موبارەکی (دینەوەر)یە، تەفسیری قورئانی پیرۆزی کردووە، بەناوی (الواضح في تفسير القرآن)، ساڵی ٣٠٨ک - ٩٢٠ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: معجم أعلام الكورد ٤٩٠.

### عەلی محەممەد سورچی (١٠٨١)

ناوی عەلییە کوڕی محەممەد ئەفەندی سورچییە، ساڵی ١٠٧٤ک - ١٦٦٣ز، لە (سەردەشت)ی ئێران مەلا بووە دەرسی فەقێیانی داوە، حاشیەی هەیە لەسەر تەفسیری

بەیزاوی سورەتی (یاسین)، هەروەها حاشیەی تری هەیە، لەسەر حاشیەی عیصامەدین لەسەر تەفسیری بەیزاوی جزووی (عەمە)، ساڵی ١١١٢ك – ١٧٠٠ز تەواوی کردووە، پێشکەشی بە مەلا فەیزواللە ئەفەندی کردووە.

سەرچاوە: بوژاندنەوە ٣/٣٢٥ – ٣٢٨ – ٣٧٧، ٦/١٠٣–١٠٨–١٠٩.

## عەلی محەممەد شنۆیی (١٠٨٢)

ناوی عەلییە کوڕی محەممەدی کوڕی عبدالمليكە، خەڵکی شاری (شنۆ)یە، زانا و دانا بووە، لە ڕێزمانی عەرەبی و زانیاری نەتەوە و ڕەچەڵەك و باسەکانی ڕابردو ئاگاداربوو، لە مانگی ذی الحجەی ساڵی ٥٣٣ك – ١١٣٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: بغية الوعاة ٢/١٩٤.

## عەلی محەممەد شێخ وەتمانی (١٠٨٣)

ناوی عەلییە کوڕی مەلا محەممەدە، ناسراوە بە مەلا عەلی گەورە، ساڵی ١٨٠٧ز لە گوندی شێخ وەتمانی باڵەکایەتی هاتووتەدنیا، پاش تەواوکردنی خوێندنی چووە (ڕواندز)، لە مزگەوتی گەورە کرا (مدرس)، دەستی کرد بە دەرسدانەوە، مامۆستا یەکە لە زانایە بەناوبانگەکان، حاشیەی لەسەر (توحفە) و (بەیزاوی) و (بورهانی گەلەنبەوی) و (سیوطی) و (عبدالله یەزدی) و (جمع الجوامع) و (فتح المعين) هەیە، بەشێکیان لە لایەن مەلا عەلی مەلا محەممەد شێخ وەتمانینە، پێش نوێژی مزگەوتی (دوو برا) لە گەڕەکی ڕۆناکی لە (هەولێر).

کۆچی دوایی: ساڵی ١٨٦٥ز لە (ڕواندز) کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی گەردە گەردە، نزیك گۆڕی مەلا محەممەدی خەتێ بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: بنەماڵانی بەناوبانگی کوردستان ١٠٢ – ١٠٤.

## عەلی محەممەد قزلجی (١٠٨٤)

ناوی عەلییە کوڕی مەلا محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی ئیبراهیمە، دەوری ساڵی ١٢٤٠ك – ١٨٤٤ز لە گوندی (ئیبراهیم ئاوا)، نزیك ناحیەی (قزلجە) هاتووتەدنیا، لە

خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، چەند کتێبی نەحو و صەرف و فیقە و عەقیدەی خوێند، دەڵێ: {لەو کاتە لە خزمەت باوکم دەمخوێند، تەصریفی زەنجانی بۆ دەنووسیمەوە، کاتی زستان بوو، خانووەکە درۆپەی دەکرد، کتێبەکە تەڕ دەبوو، باوکم وشکی دەکردەوە، دیسان دەینووسییەوە، هەر خەریکی ئەو حاڵە بوو، دەیگۆ: کوڕم ئەو ماندووبوونەم بۆ تووە بەفیڕۆی نەدەی ئێمەش لەسەر ئەو ئامۆژگاریە دەڕۆین تا ئێستا}.

مامۆستا قزلجی بۆ خوێندن چووە لای مەلا محەممەدی (یائی)، دوایی چووە لای مەلا محەممەدی (بانە)ی، ساڵی ١٢٥٨ك – ١٨٤٢ز شەرحی (تهذیب المنطق)ی نووسییەوە، پاشان لەگەڵ مەلا عبداللەی پیرەباب چوونە (بەغدا) لای مەلا محەممەد فەیزی زەهاوی، لەوێ لە قوتابخانەی (سلیمانیة) حیکمەت و ڕیازیات و چەند بابەتی خوێند، (زەهاوی) زۆر کەیفی بەو دوو مەلایە کوردە دەهات، لەو بارەیە مامۆستا عبدالکریم (مدرس) دەگێڕێتەوە لە زەهاوی: {ئەگەر زیرەکاتی مەلای قزلجی و سەعی مەلای پیرەبابی، هەردووك کۆبینەوە لە پیاوەك، مەلایەکی وەکو منی لێ دروست دەبی}.

گەڕانەوە کوردستان، بووە مەلا لە (تورجان) لای محەممەدئەمین بەگ، لەوێ ماوە چل و پێنج ساڵ خەریکی کاروباری مەلایەتی و دەرسدانەوە بوو.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبداللەی پیرەبابی (مدرس)ی (مەهاباد)، مەلا عبدالرحمان: (مدرس)ی مەدرەسەی (سوور) لە مەهاباد، مەلا عبداللەی وەلزی، مەلا عبدالرحمان پێنجوێنی، مەلا محەممەد حوسێنی تورجانی زادە، مەلا محەممەد حەسەن تورجانی، مەلا عبدالله داغستانی جەوانشێر، مەلا سەید حوسێن چۆڕی مەریوانی، مەلا سەعید مەلا ڕەحیم.

خووڕەوشتی: مامۆستا تەنیا مەبەستی دەرسدانەوە و نووسینی بابەتەکانی ئاینی بوو، ڕووی خۆی نەدەدا دنیا، بێ نەفس بوو، ڕووخۆش و قسەخۆش بوو، دەگێڕنەوە: لە تورجان ماڵەکی جولکە هەبوو، لە ڕۆیشتن مامۆستا بە پێش خۆی دەدا، خەڵك گلەیان لێکرد: مامۆستا بەخۆو بەو هەموو زانیاریە، چۆن لە دوو ئەو جولەکە دەڕۆی ؟ وەڵامی

داوه، فەرمووی: لەبەر سێ شت، یەکەم: پیرە و ڕیشی سپییە. دووەم: کاتی هاتمە ئێرە. سەردانی کردم. سێ یەم: پرسیاری تەوراتی لێ دەکەم، پێم دەڵێ و وەك مامۆستایە بۆ من. منیش لەبەر ئەو شتانە، ڕێزی دەگرم، بە پێشی ناکەوم.

دانراوەکانی: (هۆنراوەی فەرائیز)، (هۆنراوەی تەجوید): بە عەرەبی، (هۆنراوەی تەجوید): بە فارسی، (مەقولات)، (رسالة في الآداب)، (الظرف المنصوب)، (صيغ المصادر)، (تخفيف الهمزة)، (الرسالة المعرفية)، (أجزاء القضية) و شەرحی (آداب البحث)ی نۆدەیی.

ئەو کتێبانەی حاشیەی لەسەر نووسیون: تەصرفی مەلا عەلی، جامي، سيوطي، مغني اللبيب، مطول، التسهيل، شرح المغني، مختصر، مفتاح العلوم، جمع الجوامع، حكمة العين، عصام الدين وضع، فناری، معلقات السبع، القصيدة البرديه، عبدالله يەزدي، فەرائیزی شەرحی مەنهەج، لامية العرب، لامية العجم، المقامات الحريرية، قانون ابن سينا، نخبة الفكر، الإتقان للسيوطي، شفاء القاضي، شرح التجريد، شرح العقائد، شرح المواقف، تقريب المرام، شرح الشاطبية، شرح الخفايه، رفع الخفا، تشريح الأفلاك، أشكال التأسيس، شرح الجواد، شەرحی جەلی لەسەر (رسالة الحساب)، بخاري، مسلم، ألفية العراقي، عبدالغفور لاری، لاری حیکمەت، قاموس سەیلەکوتی و سەید شەریف، خمریە وتائیەی (ابن الفارض)، تأريخ (ابن الاثير)، وفيات الأعيان.

کۆچی دوایی: ڕۆژی پێنج شەمە (٥)ی مانگی (محرم)ی، ساڵی ١٢٩٦ك – ١٨٧٩ز کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی: عبدالرحيم و کاکە حەمە و مەلا حەسەن و مەلا حوسێن، لەگەڵ کچێکی مەلا ناو (عائيشە) خان.

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوە ٣/٢٦٦ – ٢٦٨ /٤/١٢٦ – ١٢٨ /٥/٧٣ – ٢٩٨ /٧/٣٠.
٢. ژیناوەری زانایانی کورد ٢١٣ – ٢١٤ – ٢٣٨ – ٢٤٣.
٣. الشيخ معروف النودهي ١٤.

٤. تأريخ فرهنگ و ادب مكريان ٢٤٥ – ٢٥٥.
٥. مشاهير الكورد ٢/٧٨.
٦. معجم أعلام الكورد ٥٠٤.
٧. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٩٦ – ٣٩٨.
٨. تأريخ مشاهير كورد ٢/ ١٤٢ – ٣٩٤ – ٣٩٥.

## عەلی محەممەد گۆرانی (١٠٨٥)

ناوی عەلییە کوڕی محەممەدی گۆرانی شافیعی یە، پێش نوێـژ بـووە لـە مزگـەوتی جەرجیس پێغەمبەر (د.خ) لە (موصـل)، حاشـیەی لەسـەر شـەرحی شەمسـیـە و شـەرحی عەقائیدی تەفتازانی هەیە، ساڵی ١٠٩٤ك – ١٦٨٣ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٧/١٧٢.
٢. منهل الأولياء ٢/١٨٨.
٣. مشاهير الكورد ٢/٨٣.
٤. هدية العارفين ٥/٧٦٢.
٥. خلاصة الأثر ٣/٢٠٣.
٦. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٩٤.
٧. معجم أعلام الكورد ٥٠٥.

## عەلی محەممەد نۆدەیی (١٠٨٦)

ناوی عەلییە کوڕی سەید محەممەدی کوڕی شێخ عەلی کوڕی بابارەسولی بـەرزنجی یە، ناسراوە بە شێخ عەلی کۆسـە، دەوری سـاڵی ١٠٩٠ك – ١٦٧٩ز لـە خانـەوادەکی ئایین پەروەر پێگەیشتووە، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، ماوەك خەریکی وەرگـرتنی زانیـاری بوو، دوایی تەریقەتی (قادری) لە شێخ حەسەنی گلەزەردی وەرگرت، چووە (دۆڵ پەمو) دەستی کرد بە ئامۆژگاری، چەند کەسـانی پێگەیانـدن، لەوانـە: شـێخ مـەعروفی نـۆدەیی

باوکی کاك ئەحمەدی شێخ (خوا لێیان خۆش بێ)، مامۆستا کۆچی دوایی کرد، بەروارەکەی لا نیە.

کوڕەکانی: هەشت کوڕی هەبوون، ناوەکانیان ئەوانەن: شێخ عەبدە، شێخ محەممەد، شێخ ئەحمەد، شێخ مصطەفا، شێخ موحسین، شێخ عەزیز، شێخی گوندی داسیران. شێخ مەحمود.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٩٢ – ٣٩٣.
٢. بنەماڵەی زانیاران ٣٣٨ – ٣٣٩.

## عەلی محەممەد هەرشەمی (١٠٨٧)

ناوی عەلی یە، کوڕی مەلا محەممەدە، خەڵکی گوندی (هەرشەم)ە، زانایەکی بەدین و خواپەرست بووە، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، ماوەك لە لای ئەو بوو، ماوەك چووە لای مەلا ئەحمەدی نەوەی مەلا وەیسی (هەرشەمی)، کۆتایی بە خوێندن هینا، بووە مەلا لە گوندی (گردەڕەشە)ی دەوزێی (بادینان)، دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی کاروباری ئاینی، هەر لەوێ وەصیەتی کرد: {کە مردم لە گۆڕستانی (کێلە سپیلك) لە (بەحرکە) بمشارنەوە}، زۆری پێ نەچوو، بە سەردان هاتە (بەحرکە) کۆچی دوایی کرد، لەو جێگایە کە خۆی داینابوو، بە خاك سپێردرا.

کوڕەکانی: مەلا عەلی چوار کوڕی هەبوون:

١. شێخ ئەنوەر: لە (بنەسراوە)ی گەورە، لای مەلا ئەحمەدی ئاشوکانی بوو ماوەك چووە (پیرزین) لای مەلا ئیسماعیل سوسەیی، بە فەقێیەتی کۆچی دوایی کرد.
٢. شێخ عوبێد: لە ئەنجامی (دووپشك) پێوەدان، کۆچی دوایی کرد، منداڵی نەبوو.
٣. شێخ ئەسعەد: منداڵی نەبوو.
٤. مەلا محەممەد: کوڕێکی مەلای هەبوو ناسرابوو بە: (شێخ شاکر)، ئەویش ظاهیر و چەند کوڕی دی هەبوون.

سەرچاوە: دەنگی زانا ٩٤/٥٠ – ٩٥، ٢٠٠١ز.

## عەلی مەحمود حەڕانی (١٠٨٨)

ناوی عەلییە کوڕی مەحمودی کوڕی عەلی کوڕی مەحمودی کوڕی عەلی کوڕی مەحمودە، خەڵکی (حەڕان)ە، دەوری ساڵی ٧٦٠ك – ١٣٥٨ز هاتووتەدنیا، لە شەریعەت بە تایبەت مەزهەبی شافیعی شارەزابووە، لە نەحو و فەرائیز ئازا بووە، زیرەك و زەین تیژ بووە، (٢٥٠) بەیتی ئەلفییەی عێراقی بە یەك ڕۆژ لەبەر کردووە، لە تەمەنی ٣٥ ساڵیدا لە مانگی ڕەمەزانی پیرۆز ساڵی ٧٩٥ك – ١٣٩٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٣/١٢٦ – ١٢٧.

٢. شذرات الذهب ٦/٣٤١.

## عەلی مەحمود دۆلکانی (١٠٨٩)

ناوی عەلییە کوڕی مەحمودە، ساڵی ١٣٣٠ك – ١٩١٢ز لە گوندی (دۆلکان)ی ئالان، هاتووتەدنیا.

خوێندنی: لە تەمەنی پازدە ساڵیدا چووە ناو فەقێیان، لە سەرەتاوە لای مەلا محەممەدی گروێسی لە گوندی (دەروێنە) دەستی بە خوێندن کرد، پاشان خوێندنەکەی لەلای ئەو بەڕێزانە بردەسەر: مەلا سەید عبداللەی پشدەری، مەلا ئەسعەدی مەحوی، مەلا ئەحمەدی دێلژەی، مەلا عبداللەی دێلژەی، مەلا عبداللەی بێژوەی لە (سلێمانی)، مەلا عبداللەی بانەی لە تورجان، مەلا حەسەنی دەشتێوی، کاکە مەلای بێوران، مەلا صالحی گەناوی، مەلا شێخ عومەری واشەمەزین، دوا قۆناغی چووە لای مەلا محەممەدی ڕەئیس لە گەلالە، ماوە لەوێ تا ساڵی ١٣٥٩ك – ١٩٤٠ز ئیجازەی وەرگرت.

بووە مەلا لە (سەفرە)، پاش دوو ساڵ گەڕاوە (دۆلکان) چواردە ساڵان لەوێ بوو، هاتە خانەقای (سەردەشت)، ساڵی ١٩٩٦ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (حەوت پیر)ی (بێژوە) لەسەر وەسیەتی خۆی بە خاك سپێردرا.

سەرچاوە: فەقێ و فەقێیەتی لە کوردستان ٣١١.

## عەلی مەحمود شارەزوری (١٠٩٠)

ناوی عەلییە کوڕی مەحمودی کوڕی عەلی کوڕی عاصمی شارەزورییە، چوویتە (دیمشق) لەوێ کرایتە (مدرس)، بەردەوام بوو لەسەر خزمەتی ئاینی پیرۆز، تا ساڵی ٦٧٥ك - ١٢٧٦ز کۆچی دوایی کرد، دوای ئەو مەلا صلاحەددینی کوڕی هاتە جێی، دوای ویش نەوەکانی.

سەرچاوەکان:

١. طبقات الشافعية الكبرى ٤/٤١٢.
٢. طبقات الشافعية / ئەسنەوی ٢/١٢٠.
٣. البداية والنهاية ١٣/٧٧.
٤. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٨٧ - ٣٨٨.
٥. الدرر الكامنة ١٣/١١٢ - ١١٣.
٦. معجم أعلام الكورد ٤٩٦.

## عەلی مەحمود قابروصی (١٠٩١)

ناوی عەلییە کوڕی مەحمودی کوڕی محەممەدی کوڕی ئەبوبەکری کوڕی جونەیدی کوڕی شیبلی، کوڕی شێخ خضری کوڕی عبدالمليکی کوڕی عوسمانی شەریفی کوردییە، خەڵکی گوندی (قابروصە) نزیك (حەلەب) ساڵی ٨١١ك - ١٤٠٨ز لە گوندی (بابەزیا) هاتووتەدنیا، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، (محرر)ی لەلای مەلا سەید خەلیلی مامی خوێند، ساڵی ٨٣٤ك چووە (قاهیرە)، دوایی چووە (قودس)، لەوێ چووە (مەککە)ی پیرۆز لای چەند زانایانی خوێند، لە ٨٤٣ك چووە (حەج)، لە ٨٤٧ك دووبارە چۆوە (حەج)، لە ٨٥٩ك چووە (مەغریب)، لە ٨٦٠ك گەڕاوە پاشان کرا نائیبی قەراتی (حەلەب).

مامۆستا زەنگین و دەوڵەمەند بوو، لای کاربەدەستان بەڕێز بوو، شەوی هەینی ٤ی جیمادی دووەم، ساڵی ٨٨٢ك - ١٤٧٧ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ٦/٣٤ - ٣٥.

٢. مشاهير الكورد ٣٢٠.

## عەلی موسلیم شارەزوری (١٠٩٢)

ناوی عەلییە کوڕی موسلیمی کوڕی محەممەدی کوڕی عەلی کوڕی فەتحی شارەزوریە، مەزهەبی شافیعی بووە، لە (دیمشق) دانیشتووە، لە تەفسیر و شەریعەت شارەزا بووە، زانیاری تایبەتی لە (فەرائیز) هەبووە، کتێبی (أحكام الخنثى)ی داناوە باسی نێرەموکە، ساڵی ٥٣٣ك - ١١٣٨ز لە نوێژی بەیانی کاتی (سەجدە) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. هدية العارفين ٥/٦٩٦.

٢. تأريخ مشاهير كورد ١/٣٨.

## عەلی مەطهەر دینەوەری (١٠٩٣)

ناوی عەلییە کوڕی مەطهەری کوڕی مەکی کوڕی میقلاصە، نازناوی (ئەبولحەسەنە) خەڵکی (دینەوەر)ە، لە قوتابییەکانی ئیمامی عەزالی یە، دەرسی بە (ابن العساكر) داوە، شەوی ٢٧ی مانگی ڕەمەزانی پیرۆز، ساڵی ٥٣٣ك - ١١٣٩ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: علماؤنا في خدمة العم والدين ٣٨٧.

## عەلی مەلا تەکیەیی (١٠٩٤)

مامۆستا شێخ عەلی مەلا باپیری شێخ باباعەلی بەناوبانگە، لە گوندی (تەکیە) دەرسی داوە، لەگەڵ مەلا عبداللەی خەرپانی (١١٥٩ك - ١٢٥٤ك) و مەلا عبداللەی سەردەشتی هاوچەرخ بووە.

سەرچاوە: بنەماڵەی زانیاران ٢١٣ – ٢١٤.

## عەلی وەرتی (١٠٩٥)

مامۆستا مەلا عەلی یەکە لە مەلایە چاکەکانی سەردەمی خۆی، خەڵکی گوندی (وەرتە)یە، ئەویش کوڕێکی مەلای هەبووە ناسراوە بە: (شێخ مەلا حەسەن): ئەویش دوو کوڕی مەلای هەبووە:

١. مەلا خضر: ساڵی ١٣١٠ك – ١٨٩٢ز دەرسی داوە، حوجرەی فەقێیانی ئاوەدان بووە، کوڕێکی هەبوو ناو (شێخ ئەحمەد)، ساڵی ١٩٣٧ز تەکیەی هەبوو لە گوندی (بەردانگە)ی دۆڵی شاور.

٢. مەلا محەممەدئەمین: ئەویش کوڕێکی هەبوو ناو عبدالله مەلایەکی چاك بوو، ئەویش کوڕێکی مەلای هەبوو ناو عبدالقادر، ئەویش کوڕێکی مەلای هەیە ناو محەممەد، ساڵی ١٩٧٨ز مەلا بوو لە ناوچەی (ڕواندز) دوایی هاتە گوندی (زرگوز) لەوێ دەرسی فەقێیانی دەداوە، کاروباری مەلایەتی ئەنجام دەدا، دوایی باری کرد بۆ (هەولێر) کرا پێش نوێژ و وتارخوێن لە مزگەوتی حاجی ئیبراهیم، ئەندامی لیژنەی فەتوا، لە یەکیەتی زانایانی کوردستان.

سەرچاوە: الإكليل في محاسن أربيل ٤٠٥ – ٤٠٦.

## عەلی وەسانی (١٠٩٦)

مامۆستا مەلا عەلی، خەڵکی گوندی (شێخ وەسانانی) ناوچەی بالیسانە، دەرسی لەلای مەلا محەممەد ئیبن ئادەمی باڵەکی خوێندووە، یەك بووە لە خەلیفەکانی مەولانا خالیدی شارەزوری، حاشیەی سوودبەخشی لەسەر حاشیەی (قەرەباغی) هەیە.

سەرچاوەکان:

١. عنوان المجد ١٤٥.

٢. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٣٩٤ – ٣٩٥.

## عەلی یوسف ماردینی (١٠٩٧)

ناوی عەلییە کوڕی یوسفی کوڕی شیبانە، نازناوی جەلالەدینە، ناسراوە بە (ابن الصفار)، ساڵی ٥٧٥ك – ١١٧٩ز لە (ماردین) هاتووتەدنیا، زانایەکی ڕۆشنبیر و ئەدەب دۆست و شاعیر بووە، چەندان هۆنراوەی نازك و ڕێك و پڕ مانای هەیە، کتێبی (أنس الملوك)ی داناوە لە بابەتی شیعر، ساڵی ٦٥٨ك – ١٢٦٠ز بە دەستی چەپەڵی تاوانبارەکانی (تەتەر) لە شاری (ماردین) شەهیدکرا، کاتی داگیرکردنی شارەکە.

سەرچاوەکان:

١. فوات الوفيات ٣/١١٩.

٢. معجم المؤلفين ٧/٢٦٥.

٣. كشف الظنون ١/١٩٩.

## عمادالدین محەممەد ئامێدی (١٠٩٨)

ناوی عیمادەدینە، کوڕی محەممەدە، خەڵکی (ئامێدی)یە، ساڵی ١٠٠٤ك – ١٥٩٥ز هاتووتەدنیا، دەرسی لە خزمەت باوکی و چەند زانایان خوێندووە، باوکی موفتی (شام) بوو، کە کۆچی دوایی کرد مەلا عیمادیان لە جێ دانا، قازییەکان پێ ڕازی بوون ڕێزیان لێنا، ماوەی هەژدە ساڵان لەو خزمەتە بوو، تاکو ڕۆژی پێنج شەممەی ١٥ی مانگی صەفەر، ساڵی ١٠٦٨ك – ١٦٥٧ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (باب الصغير) لە تەك باب و باپیرانی بە خاك سپێردرا.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٣٢٤.

٢. معجم أعلام الكورد ٥٠٨.

## عومەر ئیبراهیم ئەبوبەکر کوردی (١٠٩٩)

ناوی عومەرە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی ئەبوبەکری کوردییە، قورئانی پیرۆزی لەبەر کرد، پاش ساڵی ٨٤٠ك چووە (قاهیرە) لە خانەقای (سعيد السعداء) دابەزی،

ماوەکی زۆر لەوێ خەریکی خواپەرستی بوو، دوایی چووە مزگەوتی (قیدان)، لەوێ زۆر کەس دەهاتنە زیارەتی، مامۆستا محەممەد سەخاوی لە کتێبی (الضوء اللامع) دەڵێ: {ئێمەش چووینە لای میوانداری کردین، قسەخۆش و زمان ڕەوان بوو، شێخەکی بە حورمەت بوو، ئێمەی بەخێرهینا و ڕێزی گرتین}، ساڵی ٨٦٨ك - ١٤٦٣ز لە مزگەوتەکەی خۆی کۆچی دوایی کرد، خەڵکەکی زۆر نوێژیان لەسەر کرد، زانای بەناوبانگ عەلەمی بەلقینی پێش نوێژ بوو، هەرچەند گۆڕستانەکە دوور بوو، خەڵکان لەسەر شان هەریان گرت، تا بەشداربن لەو خێرە مەزنە.

سەرچاوەکان:

١. مشاهير الكورد ٣٢٤ - ٣٢٥.

٢. معجم أعلام الكورد ٥٠٩.

## عومەر ئیبراهیم خالید کوردی (١١٠٠)

ناوی عومەرە نازناوی (ئەبو حەفص)ە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی خالیدی کوڕی عبدالرحمانی کوردیە، فەرموودەی گێڕایتەوە لە: عبدالملیکی کوڕی عومەیر و سەفیانی (ثەوری) (٩٧ك - ١٦١ك) و (شوعبە) و چەندان زانای تر، پاشان خۆی دەرسی فەرموودەی داوە، چەند کەسی پێگەیاندووە، داخەکەم زۆر زەین تیژ نەبووە.

سەرچاوەکان:

١. الأنساب ٤/٦٠٦.

٢. اللباب ٣/٩٢.

## عومەر ئیبراهیم ڕوهاوی (١١٠١)

ناوی عومەرە، کوڕی ئیبراهیمی کوڕی سولەیمانە، خەڵکی شاری (ڕوها)یە نزیك ئورفە، لە شاری (حەلەب) دانیشتووە، لە (موصل)ی خوێندووە، لە (حەلەب) کرایتە سەر نووسەر، خەت خۆش و شاعیر و زمان ڕەوان بووە، لە مزگەوتی (ئەمەوی) کرایتە ووتارخوێن، ساڵی ٨٠٦ك - ١٤٠٣ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٧/٥٩ – ٦٠.
٢. معجم أعلام الكورد ٥٠٩.

## عومەر ئەبوبەکر کچك مەلا (١١٠٢)

ناوی عومەرە کوڕی مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی کوڕی مەلا عوسمان ئەفەندیە، ساڵی ١٢٣٠ك – ١٨١٥ز لە قەراتی (هەولێر) هاتەدنیا.

لە خزمەت بابی دەستی کرد بە خوێندن، هەر لەلای ئەو نەحو و صەرف و عەقیدە و بەلاغە و ئوصولی خوێند، ماوەکیش چووە لای مەلا ئەسعەد ئەفەندی حەیدەری، پاشان چووە (ڕواندز) لای مەلا عومەر ئەفەندی خەیلانی، ماوە لەوێ تا ئیجازەی وەرگرت، ساڵی ١٨٨٨ز چووە سەفەری (حەج)، لەوێ چووە لای (زەینی دەحلانی) موفتی (مەککە) و (مەدینە)، ئیجازەی (مسلسل)ی فەرموودەی پێغەمبەری (د.خ) لە خزمەت وەرگرت.

مامۆستا لە زانستەکان زۆر شارەزا بوو، لە مەنتیق دەستی باڵا بوو، شەرحی نووسیوە لە سەر جەدوەلی (مختلطات)ی شەرحە شەمسیە، سەرەتایەکەی دەڵێ: وبعد فقد سألني من المشتغلين عندي (الأخ العزيز إسماعيل أفندي): أن اشرح لـه جـداول المختلطات لشرح الرسالة الشمسية...).

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی کوڕی، مەلا ڕەسولی ئەرمەنی سابلاغی ساڵی ١٨٧٧ز، مەلا مەحمودی ئامێدی، مەلا ئیبراهیمی دۆغرەمەچی، مەلا شەریفی ڕەنگرێژانی، مەلا عبدالکریمی ڕەنگرێژانی، مەلا محەممەدی ئەورامی، مەلا محەممەدی دێرەبڕوشەی، مەلا عەلی قازی زراری.

مامۆستا عومەر ئەفەندی خەریکی خزمەتی ئاینی پیرۆز و دەرسدانەوەی فەقێیان بوو، سەدو بیست ئیجازەی مەلایانی دایە، جگە لەوانەی ماوەك لە خزمەتیان دەخوێند،

دوایی دەچوونە شوێنانی تر، ساڵی ١٣٠٩ك – ١٨٩١ز لە (هەولێر) کۆچی دوایی کرد، بە لێکدانەوەی ئەبجەدی: (مدارس العلم بكت على عمر)، بۆی دانراوە.

٣٠٥+١٧١+٤٢٢+١٠١+٣١٠ = ١٣٠٩ك

سەرچاوەکان:

١. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٣/١٩٨ /٦/٥٥.

٢. أربيل في مختلف العصور ١٣٣.

٣. علماء ومدارس في أربيل ٣٢.

## عومەر ئەحمەد خەرپوتی (١١٠٣)

ناوی عومەرە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەد سەعیدە، نازناوی (نعیمی)یە، خەڵکی (خەرپوتە) لە کوردستانی تورکیا، ساڵی ١٢١٦ك – ١٨٠١ز هاتووتەدنیا، مەزهەبی حەنەفی بووە، ڕۆشنبیر و نووسەر بووە، لە مانگی جیمادی یەکەم، ساڵی ١٢٩٩ك – ١٨٨٢ز کۆچی دوایی کردووە.

دانراوەکانی: چەند دانراوی هەیە، لەوانە: (عصيدة الشهدة في شرح قصيدة البردة): لە مانگی ڕەمەزانی ١٢٤٢ك تەواوی کردووە وە (شرح الاظهار في النحو) و (شرح فريدة عصام الدين في البيان).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٧/٢٧٥.

٢. هدية العارفين ١/٨٠١.

٣. إيضاح المكنون ١/٩٦ /٢/٢٢٩.

## عومەر ئەحمەد خەیلانی (١١٠٤)

مامۆستا عومەر ئەفەندی کوڕی ئەحمەدە، عەشیرەتی خەیلانی یە، مەلای مزگەوتی گەورەی ڕواندزە، ئەو بەرەبابە بە حەوت پشت دەچنەوە سەر شێخ جوبرائیل، کە ناسراوە بە (مام سۆفی سەر بە پەڕ): یەك بووە لە شێخە گەورەکانی کوردستان، کاربەدەستانی

(دیوین) لەو سەردەمی ڕێزیان گرتووە، لە گوندی (بابەجیچك) دانیشتووە، هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە، گۆڕەکەی زیارەت دەکرێت.

مامۆستا عومەر ساڵی ١٢٢٠ك – ١٨٠٥ز هاتووتەدنیا، فەقێی مەلا محەممەدی خەتێ بووە، هەر لە خزمەت ئەو ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتووە، مامۆستا محەممەد کچی خۆی پێداوە و لە (ڕواندز) دایناوە بە (مدرس)، دوای دوو ساڵان چووە (شەمزینان) لای شێخ عبیداللەی شۆرشگێڕ، دوایی گەڕاوە (ڕواندز)، مامۆستا هەرچەندە دوا عەمری چاوەکانی نەمان، بەڵام وازی لە دەرسدانەوە نەهێنا، وانەکانی هەموو لەبەربوون، بە نابینایی دەرسی دەدا، چواردە ساڵ بەم شێوەیە لە خزمەت ئایین دا بوو، ساڵی ١٨٨٥ز لە (ڕواندز) کۆچی دوایی کرد، لەسەر وەسیەتی خۆی لە گۆڕستانی (گەردەگەرد) بە خاك سپێردرا، مامۆستا ناوبانگی شەرع زانی دەرکرد بوو، چەند فەتوای هەنە، بەشێکیان لە (جواهر الفتاوی)ی مامۆستا عبدالکریم (مدرس) بەلاوکراینەوە، بەشێکیشیان ماون.

چەند زانا لەسەر دەستی ئەو پێگەیشتوون، لەوانە: مەلا عومەر ئەفەندی هەولێر، شێخ ئەبوبەکری هەرشەمی، مەلا ئەسعەدی کوڕی، مەلا شەریفی ڕەنگرێژانی، مەلا عەلی قازی زراری، دوایی خۆی مەلا محەممەد ئەسعەد ئەفەندی لە جێی دانیشت، مامۆستا مریدی سیراجەدین شێخ عوسمانی (تەوێڵە) بوو.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٠٩ – ٤١٠.
٢. علماء ومدارس في أربيل ٩٧.
٣. بنەماڵانی بەناوبانگی ڕواندز ١١٩ – ١٢٣.
٤. گۆڤاری مەتین ٦٨/٢٠ – ٢٥، ١٩٩٧ز.
٥. دەنگی زانا، ژمارە ٥٧، ٢٠٠٢ز.
٦. دەنگی زانا ٢٣ و ٢٤، ١٩٩٨ز.

## عومەر ئەحمەد مائی (١١٠٥)

ناوی عومەرە، کوڕی ئەحمەدی کوڕی محەممەدە، خەڵکی گوندی (مائێ)یە. ماوەك لە (چەل) مەلا بووە، دوایی گەڕاوە (بەرواری باڵا) لەوێ بە نەخۆشـی (تـاعوون) کۆچـی دوایی کردووە، (چەل) یان (چەللك): گوندێکە سەر بە زاخۆ، لە کۆنەوە پیاوانی خانـەدانْ و مەلای چاکی لێ دانیشتووە.

دانراوەکانی: (شرح رسالة الحساب) و (شرح الرسـالة الحنفيـة) و (شـرح الربـع المجيب) و (حاشية على حاشية مير أبي الفتح في الآداب).

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/١٠١ – ١٠٢.

## عومەر ئەحمەد مەرعەشی (١١٠٦)

ناوی عومەرە کوڕی ئەحمەدی کوڕی ئەبوبـەکرە، خـەڵکی شـاری (مەرعـەش)ە، ڕۆژئاوای (ئۆرفە)، زانایەکی زیرەك و نووسەر بووە، لە سەرەتاوە زۆر دەست کورت بوو، پاشان کرا سەرکردەی (حەلەب)، مـاڵ و سـامانی بـە سـەردا بـاری، زەنگـین بـوو، لـە کاروباری ئاینی دریغی نەکرد، ئامۆژگاری خەڵکانی دەکـرد، بـۆ یـادی خـودا و قورئـان خوێندن، ساڵی ٩٣٨ك – ١٥٣١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٨/٢٢٩.

## عومەر ئیسماعیل فارقی (١١٠٧)

ناوی عومەرە کوڕی ئیـسماعیلی کوڕی نەسطورە، خـەڵکی (میافـارقین)ە، سـاڵی ٥٩٨ك – ١٢٠١ز هاتووتەدنیا، زانایەکی شارەزا بوو لە: فـەرموودەی پێغەمبـەر (د.خ)، نەحو، ڕێزمانی عەرەبی، شیعر، ئەستێرەناسی، ڕەمل، ژمێریاری، لە قوتابخانـەی (الظاهریـة) دەرسی دەدا، لە تەمەنی نۆهەت ساڵیدا لە ماڵی خۆی خنکاندرا، هەموو ماڵەکەشـی دزرا ساڵی ٦٨٩ك – ١٢٩٠ز.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٣/٣٢٢.

٢. طبقات المفسرين ٢/٢.
٣. شذرات الذهب ٥/٤٠٩.
٤. فوات الوفيات ٣/١٢٩ – ١٣١.
٥. هدية العارفين ١/٧٨٧.
٦. معجم المؤلفين ٧/٢٧٧.
٧. كشف الظنون ٢/١٨٠٤.
٨. معجم أعلام الكورد ٥١٠.

## عومەر ئیسماعیل گردلانکەیی (١١٠٨)

ناوی عومەرە کوڕی ئیسماعیلە، خەڵکی گوندی (گردلانکە)یە، مەلایەکی بە دین و سەخی و دڵپاك و خێرخواز بوو، لە دەشتی (هەولێر) مەلا بوو، دەرسی فەقێیانی دەدا، پاشان لەگەڵ فەقێیەکان چووە گوندی (دارەتوو)، مامۆستا مریدی شێخ مصطەفای نەقشبەندی بوو، دوا عەمری دەشتی بەجێ هێشت هاتە مزگەوتی (شێخ)، خەریکی خواپەرستی بوو تا کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی پێش مزگەوت بە خاك سپێردرا، کوڕێکی هەبوو، بەناوی باوکی خۆی (مەلا ئیسماعیل): زۆری پێ نەچوو ئەویش کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: الإكليل في محاسن أربيل ٣٣٨.

## عومەر بەدر کوردی (١١٠٩)

ناوی عومەرە کوڕی بەدری کوڕی سەعیدی کوڕی محەممەدە، لە (موصل) دانیشتووە، مەزهەبی حەنەفی بووە، ساڵی ٥٥٧ك – ١١٦٢ز لە موصل هاتووتەدنیا، لە (بەغدا) خوێندیتی، لە (حەلەب) و (دیمشق) دەرسی داوە، ساڵی ٦٢٢ك – ١٢٢٥ز لە دیمشق کۆچی دوایی کردووە.

دانراوەکانی: (المغني عن الحفظ والكتاب) و (العقيدة الصحيحة في الموضوعات الصريحة) و (استنباط المعين) و (اختيار أخيار الأخبار) و (الإنتصار والتراجيح).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٧/٢٧٨.

٢. كشف الظنون ١/٨٠.

٣. شذرات الذهب ٥/١٠١.

٤. هدية العارفين ١/٧٨٥.

## عومەر بندار تەفلیسی (١١١٠)

ناوی عومەرە نازناوی کەمالەدینـە، کـوڕی بنـداری کـوڕی عومـەرە، مەزهـەبی شافیعی بووە، دەوری ساڵی ٦٠٢ك – ١٢٠٥ز لە شاری (تەفلیس) هاتووتەدنیا، لەگەڵ مامۆستا ئیبن صەلاح دانیشتووە، دەرسی بە ئیمامی نەوەوی داوە، لە (دیمشق) کرایتە قازی لە دەوری (تەتەرەکان) لە لایەن هۆلاکۆ کرا قازی شام و جزیرە و موصـل، زۆر هـەوڵی ئەوەیدەدا خوێن نەڕژێ، زانایەکی دەست پاك بوو، ئەو هەموو سامانەی لەژێر دەست بـوو هەر بە هەژاری دەژیا، لە قوتابخانەی (عادلیة) دەرسی دەداوە، پاشان کرا قازی (حەلەب)، دوایی لە حـوکمڕانی مەلیکـەکانی میصـر لـە (قـاهیرە) دەسـت بەسـەر کـرا، خـەریکی دەرسدانەوە بوو، لە مانگی مەولودی ساڵی ٦٧٢ك – ١٢٧٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. البداية والنهاية ١٣/٢٧١.

٢. شذرات الذهب ٥/٣٣٧.

## عومەر ثابیت ثەمانینی (١١١١)

ناوی عومەرە، کوڕی ثابیتی خەڵکی (ثەمانین)ە، بن چیای (جودیّ)، پـاش تۆفـانی حەزرەتی نوح (د.خ)، یەکەم شوێنە ئاوەدان کرایتەوە، ئیبن خەلەکان دەڵیّ: {ئەوانەی لـە کەشتییەکە دابەزین ژمارەیان هەشتا کەس بوون، هەریەك لەوانە شوێنەکی لەو جێگایـە بـۆ خۆی دروست کرد، بۆیە ناویان لەو گوندە ناوە (ثەمانین)}، واتـە: هەشـتا کەسـی، وەك گوندی دوازدە هەوار، هەزارکانیان. مامۆستا لە نەحو شارەزا بووە، لە گەڕەکی کەرخ لە

(بەغدا) دەرسی داوە زۆربەی فەقێیەکانی دەست کـورت و هەژاربووینـە، لـە مـانگی ذي القعدة، ساڵی ٤٤٢ك – ١٠٥١ز کۆچی دوایی کرد.

دانراوەکانی: ئـەو کتێبانـەی دانـاون: (شـرح اللمـع لابـن جـني) و (الفوائـد) و (القواعد) و (شرح التصريف الملوكي).

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٧/٢٧٩.

٢. وفيات الأعيان ٣/١١٦ – ١١٧.

٣. البداية والنهاية ١٢/٦٢.

٤. كشف الظنون ٢/١٥٦٣.

٥. شذرات الذهب ٣/٢٦٩.

٦. إيضاح المكنون ٢/٢١١.

٧. بغية الوعاة ٢/٢١٧.

٨. الأعلام ٥/٢٠٠.

## عومەر حوسێن دیاربەکری (١١١٢)

مامۆستا سەید عومەر، کوڕی حوسـێنی (بـوزجی زادە)یـە، مـوفتی و (مـدرس)ی دیاربەکر بووە، لە زانستەکان بەتایبەت لـە بیرکـاری شـارەزا بـووە، سـاڵی ١٢٠٠ك – ١٧٨٥ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبانی: (شرح الوجيز في أصول الفقه) و (شرح الكافي) نەحوی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٧/٢٨٢.

٢. هدية العارفين ٥/٨٠٠.

٣. معجم أعلام الكورد ٥١٢.

## عومەر حوسێن سنجاوی (١١١٣)

ناوی عومەرە، کوڕی حوسێنی کوڕی ڕەسولە، عەشیرەتی (سنجاوی)یە، دەوری ساڵی ١٨٩٠ز لە گوندی (قوشتەپە) هاتە دنیا، لەلای مەلای گوندەکە دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغی سوختەیی تەواوکرد، لە قۆناغی (موستەعیدی) چووە (شەقڵاوە) لای مەلا طاها، ماوەکیش لە (بەحرکە) لای مەلا عوسمانی شەوەکی بوو، پاشان چووە (هەولێر) مزگەوتی حاجی عبدالقادر دەباغ، لای مەلا محەممەدئەمینی کونەفلوسە، ماوە لەوێ تا ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت، هەروەها تەریقەتی لە شێخ مصطەفای نەقشبەندی وەرگرت.

مەلایەتی: دەستی کرد بە مەلایەتی، دەرسدانەوەی فەقێیان، لەو گوندانەی خوارەوە: دووسەرە، گردمەلا، قەشقە، ئاڵتون کۆپری (پردێ)، حەساری گەورە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا سەید عبداللەی گردەسۆری، مەلا عەلی بیرەعارەبانی، مەلا عبدالصمدی ڕێدار، مەلا ئەحمەدی گەزنەی، مەلا محەممەدی کوڕی، مەلا ڕەشیدی کوڕی.

کۆچی دوایی: ساڵی ١٩٧١ز کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی: دوو کوڕی لە پاش بەجێما:

١. مەلا محەممەد: لە ١٩٢٨ز لە (دووسەرە) هاتەدنیا، لەلای مەلا سەعیدی باشتەپە و مەلا صەدیقی نۆغەرانی خوێند، لە ١٩٥٦ز ئیجازەی لە باوکی وەرگرت، مەلابوو لە (قادرباغر)، (تومار)، (زەرنگ)، دوایی لە (کەرکوك) کرا پێش نوێژ و وتارخوێن، پاشان هاتە (هەولێر) مزگەوتی خانەقای شێخ مەزهەر لە ٢٠٠٨ز کۆچی دوایی کرد.

٢. مەلا ڕەشید.

سەرچاوە: دەستووسی مەلا ئەنوەری سعاتچی.

## عومەر حەمزە هەولێری (١١١٤)

ناوی عومەرە، کوڕی حەمزەی کوڕی یونسی هەولێرییە، ساڵی ٦٩٦ك – ١٢٩٦ز لە (دیمشق) لە دایك بووە، زانایەکی شارەزا بووە لە زانیارییەکانی قورئانی پیرۆز، فەرموودەناس بووە، ناسراوە بە (القطان)، ساڵی ٧٨٢ك – ١٣٨٠ز لە شاری (صەفد) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: معجم أعلام الکورد ٥١٢.

## عومەر حەیدەر عەسکەری (١١١٥)

ناوی عومەرە، کوڕی حەیدەری کوڕی میرزا عەلی کوڕی وەستا محەممەدە، لە چەند شوێنان گەڕا تا خوێندنەکەی بردەسەر: ساڵی ١٢٢٧ك – ١٨١٢ز لە گوندی (کارێزە)ی ناوچەی شوان بوو، لەو کاتە شەرحی موغنی نووسییەوە، ساڵی ١٢٢٨ك لە (عەسکەر) لای مەلا مصطەفای مامی تەصریفی نووسییەوە، ساڵی ١٢٣٢ك لە (سلێمانی) (موصل الطلاب)ی نووسییەوە، ساڵی ١٢٣٤ك چووە (سابلاغ)، هەر لەوێ ساڵی ١٢٣٥ك کتێبانی (الرسالة الحنفیة)، (میر أبو الفتح)ی ئاداب، (عصام الدین)ی سەمەرقەندییە و حاشیەی محەممەد حوسێنی نووسییەوە، هەر لەو ساڵەدا چووە گوندی (وەلزێ)ی بالەکایەتی چەند فەتاوای نووسییەوە، ساڵی ١٢٣٦ك (عصام الدین)ی وەضعی نووسییەوە، ساڵی ١٢٣٨ك چووە (کەرکوك)، لەوێ کەمالی شەرحی شافییەی نووسییەوە، ساڵی ١٢٤٠ك چووە (مورتکە)ی نزیك (قوشتەپە) لای مەلا عبدالغفور، ساڵی ١٢٤٢ك (ایقاد الضرام)ی (ابن الحاج)ی نووسییەوە، ساڵی ١٢٤٧ك لە (خانەقا) دوو بەرگی (ئەنوار)ی نووسییەوە، ساڵی ١٢٥١ك هاتە (هەولێر)، لە ١٣ی مانگی مەولودی ساڵی ١٢٤٣ك – ١٨٢٧ز ئیجازەی لە شێخ مەعروفی نۆدەیی وەرگرت.

خۆشی ئیجازەی بە چەند کەسان داوە، لەوانە:

١. مەلا عبدالرحمان ئەفەندی کوڕی عبداللە حەنەفی قادری لە ١٢٦٥ك.

٢. مەلا عبدالرحمان ئەفەندی کوڕی مەلا مصطەفا، ساڵی ١٢٦٧ك.

ناوبراو ساڵی ١٢٧٤ك – ١٨٥٧ز لە (کەرکوك) مەدرەسەی فـەقێیانی هـەبوو. دوای ئەو بەروارە کۆچی دوایی کردووە، نازانم کەی؟

سەرچاوە: بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/٣٢٤ – ٣٣٠ /٤/٧٣.

## عومەر خضر کوردی (١١١٦)

ناوی عومەرە، کوڕی خضری کوڕی جەعفەری کوردییە، نازناوی (ئـەبو سـەعید جەمالەدینە) مەزهەبی شـافیعی بـووە، دەوری سـاڵی ٨٠٠ك – ١٣٩٧ز کۆچـی دوایـی کردووە، کتێبـی (الكنز المطلوب في الدوائر والضروب)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. الدرر الكامنة ٣/١٦٤.

٢. معجم المؤلفين ٧/٢٨٣.

٣. هدية العارفين ٥/٧٩١.

٤. كشف الظنون ١/١٥١٩.

٥. الأكراد في بهدينان ٢١٨.

٦. معجم أعلام الكورد.

## عومەر خەلیل کوردی (١١١٧)

ناوی عومەرە، کوڕی خەلیلی کوردییە، ساڵی ٨٠٠ك – ١٣٩٧ز لـە (قـاهیرە) هاتووتەدنیا، هەر لەوێش پەروەردە بوو، ناسراوە بە (ابن المشطوب) واتە کوڕی ناوچـەوان قۆر، باوکی لە کاتی خۆی سەری شـکاوە، جێگایەکـەی قـۆر بـووە، مامۆسـتا خـەریکی دەرسدانەوەی فەقێیان بوو، تا ساڵی ٨٨٨ك – ١٤٨٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. الضوء اللامع ٦/٧٧ – ٧٨.

٢. مشاهير الكورد ٢/٩٣.

٣. معجم أعلام الكورد ٥١٣.

## عومەر ڕەسول تەرجانی ( ١١١٨ )

ناوی عومەرە، کوڕی حاجی ڕەسولی کوڕی عەلی کوڕی حەمەدە، عەشیرەتی (شێخانە) ساڵی ١٩٠٠ز لە گوندی (کراوڕەش) هاتووتەدنیا.

لە گوندی (نۆغەران) لای مەلا محەممەدی دهێماتی دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغی سوختەیی بڕی، لە قۆناغی (موستەعیدی) چووە (دێمەکار) لای مەلا ئەحمەدی ڕەش، دوایی چووە (عەوێنە) لای مەلا عوسمانی خورمەلی، ماوەك چووە لای مەلا صالحی کۆزەپانکەی، ماوەك لەلای مەلا ئیسماعیل ماویلی و ماوەك لای مەلا ئیبراهیمی خەتێ و ماوەك لای مەلا عبداللەی تەرجانی، دوا سوڕانی چووە (هەولێر) مزگەوتی قەرات لای مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی، ماوە تا ساڵی ١٣٥٥ك – ١٩٣٦ز ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

بووە مەلا لە گوندی (کەور) ماوەکی زۆر لەوێ دەرسی داوە، پاشان هاتە (هەولێر) لە قوتابخانەی ئاینی (قەرات) کرا (مدرس) دوایی کرا بەڕێوەبەری قوتابخانەکە، دوایی کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن لە مزگەوتی حاجی عبداللە حەمامچی لە گەڕەکی (تەیراوە)، دوایی چووە خانەقای شێخ مەزهەر، پاشان هاتە مزگەوتی حاجی مەحمودی عەللاف، کرا ئەندامی ئەنجومەنی زانستی ئەوقاف.

مامۆستا تەمەنی صەد ساڵ بوو بەبێ (عەینەك) حاشیە وردەکانی کاتی گەنجی لەسەر توحفە و کتێبانی تری نووسیبوونەوە دەیخوێندنەوە، شوێنی بابەتەکانی دەناسین، پرسیارەك بکرابا، دەیگۆ: فلان کتێب فلان بەرگم بۆ بینن، خێزانەکەشی هەرچەند خوێندەوار نەبوو، فێری ناوی کتێبەکان ببوو، دەیناسین، زوو بۆی دەهینا.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا ڕەسولی شاوێسی، مەلا سەلیمی دیبەگەی، مەلا محەممەدی عەلیاوەی، مەلا عەلی قووچە برباسی، مەلا ئەنوەری شەمشولەی، مەلا ئیسماعیلی شێخ شەروانی، مەلا عبدالرحمانی کوڕی.

کوڕەکانی:

١. مەلا عبدالرحمان: ساڵی ١٩٣٣ز هاتەدنیا، لە خزمەت بابی خوێند، لە (بەغدا) تەواوی کرد، ماوەك پێش نوێژی سوپا بوو، پاشان کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی حاجی سەلام لە گەڕەکی ڕۆناکی لە (هەولێر)، لە ٢٠٠٦ز کۆچی دوایی کرد، چەند نامیلکەی داناون، لەوانە (حکم المیراث في الفقه الإسلامي).

٢. مەلا حەسەن: بەڕێوەبەری پەیمانگای پێش نوێژ و وتارخوێنانە لە هەولێر.

سەرچاوەکان:

١. خۆری ئیسلام، ژمارە ١١/٢٠٠١ز.

٢. ڕۆژنامەی پەیام ٢/١/٢٠٠٧ز (٣٦).

## عومەر سەردەشتی (١١١٩)

مامۆستا عومەر دەوری ساڵی ١٢٨٥ك - ١٨٦٨ز لە گوندی (واشمەزین) هاتووتەدنیا، لە ناوچەی خۆیان دەستی کرد بە خوێندن، دوایی چووە (بیارە) لای مەلا عبدالقادری کانی کبودی، پاشان گەڕاوە (واشمەزین) سەر بە (سەردەشت)، دەستی کرد بە مەلایەتی و دەرسدانەوەی فەقێیان، لەبەر ئەوەی گوندەکە ئی خۆیان بوو، توانی ئەرکی قوتابخانەکە بکێشی، خەرجی لە کەس وەرنەگرن، تەنیا ئەو خزمەت بکا، مامۆستا زۆر حەزی لەو بەیتە شیعرە دەکرد، کە مێژووی شێخ عبدالقادری گەیلانی یە:

ان باز الله سلطان الرجال جاء في الـ (عشق)، توفي في الـ (كمال)

ع ٧٠ + ش ٣٠٠ + ق ١٠٠ = ٤٧٠، واتە: لەو ساڵە هاتووتەدنیا.

ك ٢٠ + م ٤٠ + أ ١ + ل ٣٠ = ٩١، واتە: لە تەمەنی نۆهەت و یەك ساڵیدا کۆچی دوایی کرد کە دەکاتە ساڵی ٥٦١ك.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤١٤.

٢. شذرات الذهب ٤/١٩٨ - ٢٠٢. لە باسی شێخ عبدالقادر.

## عومەر سعداللە حەڕانی (١١٢٠)

ناوی عومەرە کوڕی سعداللەی کوڕی عبدالأحدی خەڵکی (حەڕان)ە، ساڵی ٦٨٥ك – ١٢٨٦ز هاتووتەدنیا، لە (دیمشق) و (قاهیرە)ی خوێندووە، ماوەك لە (بەغدا) بووە، زانایەکی شەرع زان و فەرائیز زان بووە، بەناوبانگ بووە لە زیرەکی و هێمنی و ڕووخۆشی و بەدینی، ساڵی ٧٤٩ك – ١٣٤٨ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. الذيل على طبقات الحنابلة ٤٤٣/٤.

٢. شذرات الذهب ١٦٢/٦.

٣. الدرر الكامنة ١٦٦/٣ – ١٦٧.

٤. معجم أعلام الكورد ٥١٣.

## عومەر سعداللە مەلا قەرەیی (١١٢١)

ناوی عومەرە، کوڕی سعداللەی کوڕی ئیسماعیلە، عەشیرەتی (ساڵەیی)یە، ساڵی ١٩٢٠ز لە گوندی (مەلا قەرە) هاتەدنیا، بۆ خوێندن چووە (ماجیداوە) قوتابخانەی مەلا یەحیا، دوایی چووە (کەندار) لای مەلا محەممەدئەمین ئاشوکانی مامم، پاشان چووە (دیبەگە) لای مەلا ئیسماعیلی جدیدەی، ماوە لەوێ تا ساڵی ١٩٥٠ز ئیجازەی وەرگرت، خەرجی بۆنەی ئیجازەنامەکە لەسەر ئەرکی سولەیمان ئاغا بوو، بووە مەلا لە (مەلا قەرە)، ساڵی ١٩٧٢ز هاتە (هەولێر) کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی قەڵات، دوایی کرا پێش نوێژ و وتارخوێن لە مزگەوتی حاجی عبداللە حەمامچی لە گەڕەکی (تەیراوە)، (مدرس) بوو لە پەیمانگای ئاینی سەر بە ئەوقاف لە ١٩٩١/٧/٨ز کۆچی دوایی کرد، چەند کوڕی ئایین پەروەری هەنە، لەوانە: مەلا (نەوازد) جێگریتی.

سەرچاوە: ژیاننامەی زانایە ئاینیە کۆچ کردووەکان ٣٧٧ – ٣٧٩.

## عومەر سەهل قەرمیسینی (١١٢٢)

ناوی عومەرە، نازناوی ئەبوبەکرە، کوڕی سەهلی کوڕی ئیسماعیلی کوڕی جەعدە، ناسراوە بە (کدو)، زانایەکی فەرمووودەناس و بڕواپێکراو ڕاست گۆ بووە، ساڵی ٣١٧ك – ٩٢٩ز سەفەری (هەمەدان)ی کرد، لە ٣٢٩ك – ٩٤٠ز گەڕاوە، دەرسی لەلایەن چەند زانایانی ئەو سەردەمی خوێند، چەند قوتابی پێگەیاندن، لە ٣٣٠ك – ٩٤١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم البلدان ٤/٣٣١.

٢. اللباب ٣/٢٨.

٣. الأنساب ٤/٤٥٨ – ٤٥٩.

٤. معجم المؤلفين ٧/٢٨٥.

٥. معجم أعلام الكورد ٥١٣.

٦. هدية العارفين ١/٧٨١.

## عومەر صالح ئۆمەرگومبەتی (١١٢٣)

ناوی عومەرە، کوڕی مەلا صاڵحی کوڕی مەلا عبداللە یە، لە دەوروبەری ساڵی ١٨٩٥ز لە گوندی (ئۆمەرگومبەت) هاتووتەدنیا، لە خزمەت باوکی دەستی کرد بە خوێندن، قۆناغی سوختەیی تەواوکرد، لە پلەی (موستەعیدی) چووە لای مەلا عبدالقادری سێگردکانی، دوایی چووە (گردەسۆر) لای مەلا طەیبی دووشیوانی، ماوەك چووە (سێکانی) لای مەلا محەممەدئەمین، هەروەها چووە (ترپەسپیان) لای مەلا شێخ جەلال پاشان چووە (پردێ) لای مەلا عەلی ڕواندزی، پاشان مەلا صەدیقی برای – بەڕێوەبەری خانەقای ئۆمەرگومبەت بوو – کۆچی دوایی کرد، مامۆستا عومەر بە ناچاری بووە جێگری برای وە پێش نوێژ و چاودێری خانەقاکە، بەڵام وازی لە خوێندن نەهێنا،

هاتووچووی مەلا ئەحمەدی فورقانی و مەلا ڕەزای واعیز و مەلا عەلی حیکمەت ئەفەندی دەکرد، پاشان چووە لای مەلا ناصیح ئەفەندی ئیجازەی وەرگرت.

لە ١٩٣٠/٥/١ز کرا (مدرس) لە قوتابخانەی مەحمود خال لە قەڵات، لە ١٩٤٩/١٠/٢٩ز هاتە مزگەوتی ئیمام قاسم، سێ ساڵان لەوێ دەرسی داوە، چەند کەسی پێگەیاندن، لەوانە بۆ نمونە: مەلا صالحی دەرماناوی، مەلا عبدالله حوسێن بەردەسپی، مەلا عبداللەی قولتەپەی، مەلا سەید حوسێنی سێگردکانی، مەلا عبداللەی سێگردکانی، مەلا عەلی ئۆمەرگومبەتی، مەلا محەممەدی ئۆمەرگومبەتی، مەلا عبداللەی یارەولی، مەلا حەبیبی دووبزی، مەلا طاهای حەساری.

خووڕەوشتی: زاتەکی بەڕێزبوو، سەخی بوو، ڕووخۆش و قسەخۆش بوو، زیرەك بوو، دیمەن ڕێك بوو، دەنگی خۆش بوو، ووتارخوێن و قورئان خوێنەکی چالاك بوو ماوەك ئەندامی کۆڕی زانیاری بوو لە (کەرکوك).

کۆچی دوایی: لە ١٩٦٩/٦/١٠ز کۆچی دوایی کرد، مەلا صالحی کوڕی جێگری بوو.

سەرچاوە: علماو ومدارس ف أربیل ٨٥.

## عومەر طاها بالیسانی (١١٢٤)

ناوی عومەرە، کوڕی مەلا شێخ طاهای کوڕی عەلی کوڕی عیسای کوڕی ئەحمەدی کوڕی مصطفای کوڕی عیسایە، ساڵی ١٩١٠ز لە گوندی (بالیسان) هاتەدنیا، لە خزمەت بابی دەستی کرد بە خوێندن، ساڵی ١٩٢٨ز بابی کۆچی دوایی کرد، پاشان هاتە (هەولێر) لە مزگەوتی قەڵات، لای مەلا ئەبوبەکر ئەفەندی ماوە تا ساڵی ١٩٣٢ز ئیجازەی وەرگرت، گەڕاوە (بالیسان) لە مەدرەسەی خۆیان دەستی کرد بە مەلایەتی و دەرسدانەوە و جێبەجێ کردنی ویردەکانی تەریقەتی نەقشبەندی، ساڵی ١٩٥٢ز هاتە (هەولێر) لە گەڕەکی (سێتاقان) مزگەوت و قوتابخانەی دروست کرد، ماوەك بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئاینی سەر بە ئەوقاف بوو لە مزگەوتەکە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا شێخ محەممەد بالیسانی برای، مەلا شێخ ئەبوبەکری برای، مەلا عومەری گۆڕەشێری، مەلا سەعید نـواوەی، مـەلا ئـەنوەر شەمشـولەی، مـەلا عبداللەی فەرهادی، مەلا عەلی خرابەدراوی، مەلا شێخ عبدالله گردەسـۆری، دوا عـەمری وازی لـە دەرسدانەوە هینا، تەنیا خـەریکی خواپەرسـتی و ئامۆژگـاری خـەڵکان بـوو، لـە ١٩/٤/١٩٨٩ز کۆچی دوایی کرد، شێخ عبدالباسطی نەوەی لە جێگای داندراوە.

شێخ عومەر کتێبـی (ڕێگای ڕاستی ژین بۆ دنیا و دین)ی داناوە، لە بەغدا چـاپ کرا، سەرەتایەکەی دەڵێ:

ئەی خـالـیقی مەننانی من ئەی راحیم و رەحمانی من

سەرچاوەکان:

١. إسهام علماء کوردستان العراق في الثقافة الإسلامية ٢٦٣.
٢. خۆری ئیسلام، ژمارە (١)، ١٩٩٨ز.

## عومەر طاهیر (الا الله) یی (١١٢٥)

ناوی عومەرە کوڕی طـاهـیری کـوڕی عـبداللەی کـوڕی محەمـەدە، نازنـاوی (مەعروفە) خەڵکی گوندی (الا الله)یە سەر بە (کۆیە)، ئەو گونـدە لـەناو دۆڕەکـی قـۆرە تەنیا ئاسمانی لێ دیارە، بۆیە ئەو ناوەیان لێ ناوە.

سـاڵی ١٣٥٩ك - ١٩٤٠ز لـەو گونـدە هاتـەدنیا، لـەلای مـەلا شـێخ عبدالغفوری مامی دەستی کرد بە خوێندن، دوایی لـەو شـوێنانە خوێندنەکـەی بردەسـەر: (کتکە)، (نەبیاوە)، (یارمجە)، (گەڵۆزی)، (عەمشـە)، (قـەرەدەرە)، (عەلـەغێر)، (دبـس)، (کۆیە).

مەلایەتی لەو شوێنانە، کرد: (هەمزەکۆر)، (ئازیانە)، (بەردەسپی)، (سـێکانی)، (بانـەمورد)، (گردەسـۆر)، (سەربەشـاخ)، (پەلکانـە)، (خرابـە)، سـاڵی ١٩٧٤ز هاتـە (هەولێر) تەکیەی لە گەڕەکی (مەنتکاوە) دروست کرد، پاشان تەکیەی تری لە گـەڕەکی

(باداوە) سەر جادەی سەد مەتری دروست کرد، شێخ مەعروف جگە لە مەلایەتی شاعیریش بوو، چەند شیعری هەیە، لەوانە یەك لەسەر سورەتی (قل هو الله )یە، دەڵێ:

ئەی خودا من بەندەکەی تۆم، دەتپەرستم تا ئەبەد

چاوی ڕەحمت بێ بە حالم، با نەجاتم بێ لە بەد

وا بە (بسم الله) ئومێدی دەرفەتم بۆ لوتفی تۆ

تا بە (الرحمن الرحيم) بێت بۆ قیام بمکەی بەلەد

من لە ساحەی میهرەبانیت چاوەڕێی لێبوردنم

بۆ سەرینی گەردی دڵ، بێ (قل هو الله أحد)

گەر دەرمکەی بێبەشمەکەی، کێ بەخۆم بگری خودا

هەر پەناهی بێ نەوایان، زاتی (الله الصمد)

بێ هەوار و تاك و تەنیای، خاوەنی مولك و مەلەك

(لم يلد) حاشا لە تونین، هیچ کەس پاکی ئەبەد

هەم (ولم يولد) کە نابێ توهەتبی باب و داك

هەر هەمووی موحتاجی تۆیە چاوە ڕێگەن بۆ مەدەد

کۆچی دوایی: لە بەرواری ٢٥/٤/١٩٩٤ز کۆچی دوایی کرد، ئێستا شێخ سەرداری کوڕی سەرپەرشتی تەکیەکە دەکات.

سەرچاوە: ژیاننامەی زانایە ئاینیە کۆچ کردووەکان ٢٥٤ – ٢٥٩.

## عومەر عبدالله ئۆمەرگومبەتی ( ١١٢٦ )

ناوی عومەرە، کوڕی مەلا عبداللەی کوڕی ئیبراهیمە، ساڵی ١٨٤٣ز لە گوندی (ئۆمەرگومبەت) هاتەدنیا، لای باوکی دەستی کرد بە خوێندن، دوای تەواوکردنی سوختایەتی چووە (کۆیە) لای مەلا ئەسعەد ئەفەندی جەلی زادە، ماوەکیش چووە (سارتکە) لای مەلا ئەبوبەکری میرڕۆستەمەی، پاشان چووە (بەغدا) لای موفتی زەهاوی، ماوەك لەوێ ماوە مۆڵەتی لە مامۆستای وەرگرت، گەڕاوە (کەرکوك) خانەقای دروست کرد،

خۆی خەلیفەی شێخ عوسمانی (تەوێڵە)ی بوو، لە لایێکەوە دەرسی دەدا، لەلایێ ئامۆژگاری دەکرد، تەریقەتی بەلاودەکردەوە، وەلەسەر ئەرکی خۆی چەند فەقیر و هەژاری بەخێودەکردن، لە ١٩٠٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: یادی مەردان ٢/٢٥.

### عومەر عبداللە عبدالأحد (١١٢٧)

ناوی عومەرە، کوڕی عبداللەی، کوڕی عبدالأحدی کوڕی عبداللەی کوڕی سەلامەی کوڕی خەلیفەیە، ساڵی ٦٦٦ك – ١٢٦٧ز هاتووتەدنیا، خەریکی خوێندنی فەرموودە بووە، بووە زانایەکی چاك و شەرع زان، لە ٧٤٤ك – ١٣٤٣ز کۆچی کرد.

سەرچاوە: الدرر الكامنة ٣/١٧٢ – ١٧٣.

### عومەر عبدالقادر ماردینی (١١٢٨)

ناوی عومەرە نازناوی وەجدییە، کوڕی عبدالقادرە، ساڵی ١٣١٩ك – ١٩٠١ز لە (ماردین) هاتەدنیا، مەزهەبی حەنەفی بووە، زانایەکی شەرع زان و بەدین بووە، لە (بڕوایی) دەستی باڵا بووە، چووە (میصر) لە زانکۆی ئەزهەر بڕوانامەی وەرگرت، دەرسی لەلای شێخ محەممەد زاهید کەوسەری خوێندووە، زمانی تورکی چاك زانیوە، کرایە مامۆستای بەشی تورکەکان و کوردەکان و بەغدایيەکان لە (ئەزهەر)، ساڵی ١٤١١ك – ١٩٩٠ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: عقد الجوهر ٢٠٠٣.

### عومەر عبدالطیف قەرەداغی (١١٢٩)

ناوی عومەرە کوڕی شێخ عبداللطیفي کوڕی شێخ مەعروفە، دەستی بە خوێندن کرد، لە خزمەت باوکی تەواوی کرد و ئیجازەی وەرگرت، دەستی کرد بە دەرسدانەوەی فەقێیان، یەك لەوانە مەولانا خالیدی شارەزووری بوو، هەر لەسەر ئاماژەی ئەو مامۆستایە مەولانا چووە (دلهی) ئیجازەی تەریقەتی نەقشبەندی لە شێخ عبداللەی دەهلەوی وەرگرت وە کە گەڕاوە کوردستان مامۆستاش بووە یەك لە مریدانی، مامۆستا

شێخ عومەر، کتێبـی (القواعد الرسمية)ی داناوە زانیاری و نووسینەوەی قورئانی پیرۆزە، بە زمانی فارسی، ساڵی ١٢٥٠ك – ١٨٣٤ز کۆچی دوایی کرد.

کوڕەکانی: پێنج کوڕی لە پاش بە جێما: شێخ حوسـێن، شـێخ عـەلی، شـێخ سولەیمان، شێخ عەزیز، شێخ مەعروف: ئەوە باپیری شێخ عومەری دووەمـە کـە حاشـیەی لەسەر تەصریفی مەلا عەلی هەیە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٠٨ – ٤٠٩.

٢. بوژاندنەوەی مێژووی زانایانی کورد ٢/١٩٩ – ٢٠١.

٣. بنەماڵەی زانیاران ١٤٩ – ١٥١.

## عومەر عبدالمحسن گۆرانی (١١٣٠)

ناوی عومەرە، کوڕی عبدالحسینی کـوڕی محەممـەدە، نازنـاوی (ئەبولفـەضـلە) مەزهەبی شافیعی بووە، لە کۆتایی صەدەی سێزدەی کۆچی لـە شـاری (مەدینـە)ی پـیرۆز هاتووتەدنیا، دەرسی لەلای شێخ جەعفەری بەرزنجی و چەند زانایانی تر خوێند، لە تەمـەنی بیست ساڵان لە مزگەوتی خۆشەویست (د.خ)، لەو شوێنە پیرۆزە، کرا (مدرس) و (پـێش نوێژ) و (ووتارخوێن)، پاشان کرا قازی (مەدینە)ی پیرۆز، ساڵی ١٣٤٤ز ڕەزامەنـدی لـە مەلیك عبدالعزیز ئال سعود وەرگرت گەڕاوە (بەغدا)، هەر لەوێ مانگی ڕەمەزانی سـاڵی ١٣٥١ك – ١٩٣٣ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: قضاة المدينة المنورة ١/٧٨.

## عومەر عبدالملك دینەوەری (١١٣١)

ناوی عومەرە، کوڕی عبدالمەلیکە، خەڵکی (دینەوەر)ە، لە کێوی (قاسیون)ی دیمشق دانیشتووە، زۆر بە دین بووە، دنیای لاداوە، لەسەر فەرموودەکانی پێغەمبـەر (د.خ) ڕۆیشتووە، خەڵکان بڕوایان پێ هـاتووە، بـە خـاوەن کەرامـەت ناسـراوە، لـە ٦٢٩ك – ١٢٣١ز کۆچی دوایی کردووە، جەمالەدینی کوڕی زانا و ووتارخوێن بووە.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٥/١٣٢.

## عومەر عثمان بیارەیی (١١٣٢)

ناوی عومەرە، نازناوی (ضیاءالدین)ە، کوڕی سیراجەدین شێخ عوسمانی تەوێڵەیە، لە شەوی دووشەمەی ٢٦ جیمادی یەکەم، ساڵی ١٢٥٥ك - ١٨٣٩ز هاتەدنیا، لە بنەماڵەکی دڵپاك و دەرون خاوێن و ئاین پەروەر و خزمەتگوزاری هەژاران پەروەردە بووە، دەستی کرد بە خوێندن، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، چەند کتێبانی ئاسایی فەقێیانی خوێند، پاشان لەسەر فەرموودەی باوکی چووە قوتابخانەی تەکیەی شێخ عبدالرحمانی طالەبانی لە (کەرکوك)، لەوێ لەگەڵ شێخ عەلی خالصی لای مەلا محەممەدی مەلای مزگەوتی (بلاغ)ی خوێند، لەبەرئەوەی شێخ عبدالرحمان ڕێز و حورمەتی شێخ عومەری دەگرت، لە تەکیەکە زۆر بە خۆشی و نیعمەت دەژیا، شێخ عوسمان ترسا لەبەر ئەو خزمەتە بێ ئەندازە، ئەو کوڕە گەنجە، هەوڵدانی فەقێیاتی کز بێ، بۆیە شێخ عومەری گەڕاندەوە (بیارە)، مەلا حامیدی کاتب و چەند مەلای تری دانان بۆ دەرسدانەوەی کوڕی.

ماوەك خەریکی خوێندن بوو لەلایەن ئەو مامۆستایانە، پاشان تەریقەتی نەقشبەندی لە باوکی وەرگرت، پاش سەرکەوتنی لە پلەکانی تەسەووف لەلایەن شێخی باوکی، کرا (خەلیفە) لەژێر چاودێری شێخ محەممەد بەهائەدینی براگەورەی.

ساڵی ١٢٨٣ك - ١٨٦٧ز باوکی کۆچی دوایی کرد، شێخ محەممەد بەهائەدین لە جێی دانیشت ساڵی ١٢٩٨ك - ١٨٨٠ز ئەویش کۆچی دوایی کرد، شێخ عومەر لە (تەوێڵە) باری کرد چووە (بیارە) لەوێ خانووبەرەی دروست کرد، ساڵی ١٣٠٠ك - ١٨٨٢ز تەواو نیشتەجێ بوو، لەو ماوەیە جەنابی شێخ چەند جار سەفەری بەغدای دەکرد، لە مزگەوتی شێخ عبدالقادری گەیلانی دادەبەزی، بۆ (نەجەف) و (کەربەلا)ش دەچوو، لە چوون و هاتنەوە لە (خانەقین) و (سەعدیە) لایدەدا، ساڵی ١٣٠٣ك لە هەردوو شوێنان خانەقای دروست کرد، ساڵی ١٣٠٦ك خانەقای لە

(کفری) دروست کرد، هەر لەو ساڵەدا خانەقای لە (کۆیێ) دروست کرد، گەڕاوە (بیارە) مەلا عبداللەی وەلزی و مەلا عومەری سەردەشتی بۆ ناوچەی (سنە) ڕەوانەکردن، نامەی پێدان بۆ مەلا عبدالقادری کانی کبۆدی لە گوندی (کۆچك چەرموو) بۆوەی بێتە (بیارە) بۆ دەرسدانەوە، ئەویش پرسی مەلا ئەحمەدی نودشەی کرد، پاش ڕەزامەندی هاتە (بیارە) دەستی کرد بە دەرسدانەوەی فەقێیان، قوتابخانەکە بایەخی پێدرا و پڕ ئاوەدان بوو، جاروابوو صەدو پەنجا فەقێی لێ دەبوو، ساڵی ١٣٠٧ك خانەقا و قوتابخانە و چەند هۆدەی نوێی لەسەرەوە دروست کرد، ساڵی ١٣١٤ك - ١٨٩٦ز لە (سەردەشت) خانەقای دروست کرد.

جەنابی شێخ لەلایێ چاودێری فەقێ و مەلا و قوتابخانەکەی دەکرد، لەلایێ تر چاودێری خانەقا و مرید و مێوانانی دەکرد، سوپاس بۆ خودا لە هەردوولاوە سەرکەوتوو بوو بۆ خزمەتی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، بە ماڵ و بە جان، بە ئەندام و بە زمان، بە کردەوەی چاکە شەوان و ڕۆژان، بە نهێنی و بە ئاشکرا.

جەنابی شێخ هەروەك مەلا و مورشید و صۆفی بوو، لە هەمان کات نووسەر و شاعیر و ڕۆشنبیر بوو، شیعری کوردی (هەورامی و سۆرانی) و فارسی هەیە، نازناوی شیعری (فەوزی)یە، بۆ نمونە دەڵێ:

کولاهی صیحەتم نابی کە عیللەت تاجی زیللەتمە
کەوای عیزەت لەبەر ناکەم کەقیللەت بەرگی ڕەحمەتمە
عەبادەت بۆ کەسێ چاکە گرفتاری طەبیعەت بێ
کە من مەفتوونی جانانم چ باکی دەرد و عیللەتمە
ئەگەر دولبەر بلاوێنێ، هەموو دەرد و بەلا خۆشە
لەگەڵ مەیل و ڕەزای جانان چ باکی سوقم و صیحەتمە

کە دیم خون جارییە ئەمڕۆ لە جەرگ و دل وەکو سەیلاب

وتم ئەم شاهیدە بەس بۆ حیسابـــاتی قیامەتمە

قەضای ئەو هەرچی بوبێ من ڕەزام گەر خۆشە یا تەلخە

لەگەڵ مەیل و ئیرادەی حەق جەهەننەم عەینی جەننەتمە

قسورم زۆرە کارم سەختە دەردم کارییە (فەوزی)

ئەوا تەنها ئومێد و مەخلەسم عیشق و مەحببەتمە

کولاە، فارسییە، واتە: خۆشی، تەلخ، فارسییە، واتە: تاڵی و ناخۆشی.

کۆچی دوایی: لە مانگی شەووالی ساڵی ١٣١٨ک – ١٩٠١ز کۆچی دوایی کرد، لە هۆدەکەی خۆی بە خاك سپێردرا.

کوڕەکانی:

١. شێخ نەجمەدین ١٢٨٠ – ١٣٣٧ك.

٢. شێخ عەلائەدین ١٢٨٠ – ١٣٧٣ك.

٣. محیەدین ١٢٧٨ – ١٣٤٢ك.

٤. سعدالدین ١٢٩٤ – ١٣١٥.

٥. نیظامەدین ١٢٩٩ – ١٣٥٠ك.

٦. شێخ ئەنوەر ١٣٠٠ – ١٣٦٠ك.

٧. شێخ جەمیل ١٣٠٨ك.

٨. شێخ کامیل ١٣١٥ – ١٣٩٦ك.

٩. شێخ نائیب ١٣١٦ – ١٣٨٣ك.

سەرچاوەکان:

١. تأریخ مشاهیر کورد ٢/٧٤ – ٧٥.

٢. نثر الجواهر والدرر ٩٣٧ – ٩٣٨.

٣. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤١٠ – ٤١٣.

٤. یادی مەردان ٢/١٤٩ – ٢٧٣.

٥. گولزاری کوردستان ٢٤٤.

٦. بنەماڵەی زانیاران ٤٠٧ – ٤١٠.

٧. تأريخ السليمانية ٢٣٠ – ٢٣١.

## عومەر عیسا درباس مارانی (١١٣٣)

ناوی عومەرە کوڕی عیسای کوڕی درباسی مارانی یە، نازناوی (ضیاءالدین)ە، زانایەکی ئوصول زان بووە، لە (هەولێر) شەریعەتی خوێندووە، پاشان چوویتە (دیمشق) دوایی چوویتە (میصر) لەوێ نیشتەجێ بووە، ساڵی ٦٠٢ك – ١٢٠٥ز لە تەمەنی نۆهەت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: معجم المؤلفين ٧/٣٠٣ – ٣٠٤.

## عومەر کەرەم دینەوەری (١١٣٤)

ناوی عومەرە، کوڕی کەرەمی دینەوەرییە، لە ٥٣٩ك – ١١٤٤ز هاتووتەدنیا، دەرسی لەلایەن چەند زانایان خوێندووە، ئیجازەی وەرگرتووە، زاتەکی بە دین بووە ساڵی ٦٢٩ك – ١٢٣٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: شذرات الذهب ٥/١٣٢.

## عومەر محەممەدئەمین قەرەداغی (١١٣٥)

ناوی عومەرە، کوڕی شێخ محەممەدئەمینی کوڕی شێخ مەعروف کوڕی شێخ عومەری، کوڕی شێخ عبداللطیفی کوڕی شێخ مەعروف غیفاری مەردۆخی یە، ساڵی ١٣٠٣ك – ١٨٨٥ز هاتووتەدنیا، لەلای موستەعیدەکانی قوتابخانەکەی خۆیان قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، چەند کتێبی سەرەتایی خوێندن، گەڕاوە خزمەت باوکی، دوایی چووە لای شێخ محەممەد نەجیبی مامی دەستی کرد بە شەرحی (جمع الجوامع)، پاشان چووە (سلێمانی) لای مەلا حوسێنی پسکەندی، پاشان چووە لای مەلا عبداللەی عیرفان ئەفەندی

فەلەکیاتی تەواوکرد، گەڕاوە لای شێخ نەجیبی مامی، ساڵی ١٣٢٦ك – ١٩٠٨ز ئیجازەی وەرگرت.

لەگەڵ مەلا مەعروفی برای دەستیان کرد بە دەرسدانەوە، لەلایێ دەرسی دەداوە، لەلایێ خەریکی نووسینی حاشیە و دانانی کتێبان بوو، شاری (سلێمانی) ئاوەدەن کردەوە بە دەرس و گفتوگۆی لەگەل زانایان، ژیانەکی نوێی دروست کرد بۆ خەڵکان، لە کەیفی ئەو مامۆستایە نازدارە خانەقای مەولانا خالیدیان نوێ کردەوە، ساڵی ١٣٣٨ك مامۆستایان لێ دانا بە (مدرس)، بە جارەك فەقێیان لێ کۆبوونەوە، دەنگ و باسی مەلا چاکی کوردستانی عێراق و ئێرانی داگرتەوە.

بەشێك لە فەقێیەکانی: مەلا عبدالقادری بانەیی، مەلا سەید حوسێنی طائیر بوغی، مەلا سەید عبدالکریمی ئالانی، مەلا سەعیدی ئاغجەلەری، مەلا محەمەد مەحمودی بانەیی، مەلا عبدالکریم (مدرس)، مەلا شێخ محەمەدی خاڵ مەلا محەمەدئەمینی ئەورامی، مەلا یەحیای بانەیی، مەلا عینایەت، مەلا سەعیدی ساوجی، مەلا محەمەدی ڕەئیس، مەلا عبدالرحیمی چورستانی، مەلا صاڵحی پرێس، مەلا سەید عارف، مەلا عبدالرحیم میرزا، مەلا مەعروفی خاوی، مەلا سەید ئەمینی مەولا ئابادی، مەلا شێخ عبدالوەهابی نێرگسەجاڕی.

کۆچی دوایی: لە مانگی سەفەری ساڵی ١٣٥٥ك، ١٣/٥/١٩٣٦ز کۆچی دوایی کرد، لە گۆڕستانی (سەیوان) لای باب و باپیری بە خاك سپێردرا.

کوڕەکانی: شێخ ئەنوەر: ساڵی ١٩٨٣ز کۆچی دوایی کرد. وە شێخ عبدالرحمان و شێخ کەمالەدین و شێخ بابا عەلی.

دانراوەکانی:

١. الفتح الوامض بالمنح الفائض في الفرائض: ساڵی ١٩٣٠ز تەواوی کردووە، لە ١٩٧٨ز لە (بەغدا) چاپ کرا.

٢. بدر العلات في كشف غوامض المقولات: لە ١٣٢٩ك تەواوی کردووە، لە ١٣٥٣ك لە (میصر) چاپ کرا.

٣. الدرة المنجية في شرح الفرائض القزلجية: لە ١٣٢٩ك تەواوی کردووە، دانەکی کۆپی دەستخەتی مامۆستا عبدالکریمی (مدرس)مان لەلایە، ساڵی ١٩٨٠ز لە (بەغدا) نووسیتیەوە.

٤. منحة الألباب (الأحباب) في شرح الأسطرلاب.

٥. تمهيد البيان في تجويد القرآن: شرح منظومة القزلجي.

٦. جلاء القلوب في عمل ربع المقنطرات والجيوب.

٧. المنهل النضاح في اختلاف الأشياخ: في الفقه.

٨. تحفة الكرام في عقائد الإسلام.

٩. وسيلة النجاة في الصلوات.

پەراوێزەکان:

١٠. حاشية على منظومة العروض: للشيخ معروف النودهي.

١١. حاشية على الرسالة اللزومية.

١٢. حاشية على أقصى الأماني في المعاني والبيان والبديع.

١٣. حاشية على الفتح الوامض.

١٤. حاشية على تقريب المرام: لە ١٣٣٢ك تەواوی کردووە، دانەکی کۆپی دەستخەتی مامۆستا عبدالکریمی (مدرس)مان لەلایە، ساڵی ١٣٤٢ك لە گوندی (قەلعە شیخان)ی ئێران نووسیتیەوە.

١٥. حاشية على شرح جمع الجوامع: دانەکی کۆپی دەستخەتی مامۆستا عبدالکریمی (مدرس)مان لەلایە، ساڵی ١٣٤٣ك لە خانەقای مەولانا خالید لە شاری (سلێمانی) نووسیتیەوە.

١٦. حاشية على تشريح الأفلاك.

١٧. حاشية على خلاصة الحساب.

١٨. حاشية على تحفة الرئيس شرح أشكال التأسيس.

١٩. حاشية على شرح رسالة الأسطرلاب.

٢٠. حاشية على برهان الگلنبوی: ساڵی ١٣٣٠ك تەواوی کردووە، ساڵی ١٣٤٧ك لە (میصر) چاپ کرا.

٢١. حاشية على عبدالله اليزدي.

٢٢. حاشية على شرح الگلنبوی على ايساغوجي.

٢٣. حاشية على فريدة السيوطي.

٢٤. حاشيـة علـى (تصـريف مـلا علـي) سـاڵی ١٣٤٩ك تـەواوی کـردووە، سـاڵی ١٣٥٤ك لە (میصر) چاپ کرا.

سەرچاوەکان:


١. أعلام كورد العراق ٥٣٨ – ٥٤٠.

٢. آداب البحث/ پێشەکی، محەممەد ڕەسول.

٣. فتح الوامض/ پێشەکی، محەممەد خاڵ ٣ – ٦.

٤. نثر الجواهر والدرر ١/٩٣٦.

٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤١٥ – ٤١٧.

٦. معجم المؤلفين ٧/٢٧٨.

٧. یادی مەردان ٢/٥٧٨ – ٥٨٣.

٨. بنەماڵەی زانیاران ١٥٢ – ١٥٦.

٩. الأعلام ٥/١٩٩.

١٠. تأريخ السليمانية ٢٧٦ – ٢٧٧.

١١. معجم أعلام الكورد ٥١٤.

## عومەر محەممەد بەدلیسی (١١٣٦)

ناوی عومەرە، کوڕی محەممەدی کوڕی عەممارە، خەڵکی (بەدلیس)ە، نازناوی (ضیاءالدین)ە، زانایەکی خواناس و دەروون پاك و تەسەووف دۆست بووە، کتێبی (صوم القلوب)ی داناوە، ساڵی ٥٩٠ك – ١١٩٤ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوە: معجم المؤلفین ٧/٣١٥.

## عومەر محەممەد جزیری (١١٣٧)

ناوی عومەرە، کوڕی محەممەدی کوڕی ئەحمەدی کوڕی عیکریمە یە، خەڵکی جزیرەیە ساڵی ٤٧١ك – ١٠٧٨ز هاتووتەدنیا، لە وڵاتی خۆی دەستی کرد بە خوێندن، پاشان چووە (بەغدا) لە خزمەت ئیمامی غەزالی و چەند زانایانی خوێند، دوایی گەڕاوە (جزیرة) کرا موفتی ناوچەکە، دەرسی دەدا، شەرحی کتێبی (المهذب)ی کردووە بەناوی (الأسامي والعلل من کتاب المهذب)، مامۆستا زاتێکی بە دین و لە خواترس بووە، لە مەزهەبی شافیعی زۆر شارەزا بووە، ساڵی ٥٦٠ك – ١١٦٤ز لە (جزیرە) کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفین ٧/٣٠٦ – ٣٠٧.
٢. وفیات الأعیان ٣/١١٧.
٣. کشف الظنون ٢/١٩١٣.
٤. علماؤنا في خدمة العلم والدین ٤٠٧.
٥. شذرات الذهب ٤/١٨٩.
٦. معجم البلدان ٢/١٣٨.
٧. طبقات الشافعیة الکبری ٤/١٦١.
٨. سیر أعلام النبلاء ١٢/١٩٤.
٩. معجم أعلام الکورد ٥١٥.

## عومەر محەممەد حەڕانی (١١٣٨)

ناوی عومەرە کوڕی محەممەدی کوڕی عومەری کوڕی محەممەدی کوڕی ئەبوبەکری (حەڕانی)یە، بۆ خوێندن چوویتە (دیمشق) لەوێ صەحیحی بوخاری بیستووە، دوایی لەو وانەیە دەرسی داوە، مەزهەبی حەنبەلی بووە، ساڵی ٧٦٤ك – ١٣٦٢ز لە (دیمشق) کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٦/٢٠٢.

٢. معجم أعلام الكورد ٥١٥.

## عومەر محەممەد ڕوهاوی (١١٣٩)

ناوی عومەرە کوڕی محەممەدە، خەڵکی شاری (ڕوها)یە، زانایەکی زمان ڕەوان بووە، ئامۆژگاری خەڵکانی کردووە، دەوری ساڵی ١١١٥ك – ١٧٠٣ز کۆچی دوایی کردووە، کتێبی (مقناطيس العلوم)ی داناوە.

سەرچاوەکان:

١. هدية العارفين ١/٧٩٨.

٢. معجم المؤلفين ٧/٣١٠.

## عومەر محەممەد شارەزوری (١١٤٠)

ناوی عومەرە کوڕی محەممەدە، خەڵکی شارەزورە، ساڵی ٥٣٩ك – ١١٤٤ز هاتەدنیا، نازناوی (شەهابەدینە)، چوویتە (بەغدا) لەوێ کرایتە وتارخوێن و واعیز، ئامۆژگاری خەڵکانی دەکرد، ساڵی ٦٣٠ك – ١٢٣٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: تأريخ مشاهير كورد ١/٦٩ – ٧٠.

## عومەر محەممەد ماردینی (١١٤١)

ناوی عومەرە کوڕی محەممەدە، نازناوی شەوقی یە، خەڵکی (ماردین)ە، شەرع زان و عەروز زان و شاعیر بووە، دیوانی بە سێ زمان هەیە.

وە شەرحی (الكافي في العروض والقوافي) و چەند (فەتاوا)ی هەیە، سالّی ١٢٦٨ك – ١٨٥١ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوەکان:

١. معجم المؤلفين ٧/٣١٧.

٢. معجم اعلام الكورد ٥١٦.

٣. هدية العارفين ١/٨٠٢.

## عومەر محەممەد نەصیبی (١١٤٢)

ناوی عومەرە نازناوی (ئەبوحەفصە) کوڕی محەممەدی کوڕی عومەری کوڕی ئەبوبەکرە، خەلّکی شاری (نوسەیبین)ە، لە (حەلەب) هاتەدنیا، لەوێ جێگری قازی بوو، دەرسی دەدا، سەفەری (قاهیرە)ی کرد، شەرع زان بوو، مەزهەبی شافیعی بوو، سالّی ٨٧٣ك – ١٤٦٨ز کۆچی دوایی کرد، دانراوی خۆی هەیە.

سەرچاوە: معجم المؤلفين ٧/٣١٥.

## عومەر محەممەد هەولێری (١١٤٣)

ناوی عومەرە، کوڕی محەممەدی کوڕی خدرە، ناسراوە بە (ابن الملا) نازناوی (معين الدين)ە، لە (هەولێر) هاتەدنیا، پاش مەلایەتی چووە (موصل) لەوێ سولّتان نورەدین شەهید ڕێزی لێنا، سالّی ٥٦٨ك بڕیاری دا مزگەوتی (موصل) تەواو بکرێ، بەماوەی سێ سالّ شێست هەزا دیناری لێ خەرج بکرێ، مامۆستا سەرپەرشتی کار بێ، دەفتەری بۆ بگری، کە تەواو بوو دەفتەرەکەی داوە دەست سولّتان ئەویش یەکسەر ئاویتیە ناو ئاوی دیجلە، مامۆستا گۆتی: سولّتانم خۆشبێ، ماوەی سێ سالّە ژمێریاری دەکەم بۆچ نەتخوێندەوە ؟ سولّتان وەلاّمی داوە: جەناب، بۆ خوامان کردیە لێکدانەوەی ناوێ ئەو خۆی دەیزانی، سالّی ٥٩٦ك – ١١٩٩ز کۆچی دوایی کرد، کتێبی (وسيلة المتعبدين الى متابعة المرسلين)ی داناوە.

سەرچاوەکان:
١. كشف الظنون ٢/٢٠١٠.
٢. هدية العارفين ٥/٧٨٤.
٣. إيضاح المكنون ٤/٧٠٨.
٤. معجم المؤلفين ٧/٣٠٩.
٥. معجم أعلام الكورد ٥١٥.

## عومەر مەولود دییەگەیی (١١٤٤)

ناوی عومەرە، کوڕی مەولودی کوڕی عومەرە، ساڵی ١٩١٩ز لە (دیبەگە) هاتەدنیا، هەر لەوێ دەستی کرد بە خوێندن، دوای قۆناغی سوختەیی چووە لای مەلا ئیسماعیلی جدیدەی، پاشان چووە لای مەلا صالّحی کۆزەپانکە لە مزگەوتی شێخ نورەدین لە (هەولێر)، ساڵی ١٩٤٩ز چووە (بەغدا)، لەلایەن شێخ ئەمجەد زەهاوی و مەلا محەممەد قزلجی کۆتایی بە خوێندن هینا، ئیجازەی مەلایەتی وەرگرت.

کرا پێش نوێژ لە مزگەوتی (بنات الحسن) لە (بەغدا) لە ١١/٥/١٩٥٠ز، پاشان لە ١٥/١٢/١٩٥١ز کرا (مدرس) لە مەدرەسەی نەعمان پاچەچی لە (بەغدا)، دوایی لە ١٩/٤/١٩٥٤ز کرا ووتارخوێنی مزگەوتی عەلی ئەفەندی لە (بەغدا)، لە ١/١١/١٩٦٣ گواستراوە مەردەسەی (نائیلەخاتوون)، لە ٢٥/٢/١٩٦٦ز کرا پێش نوێژی مزگەوتی (نەعمانیە)، لە ١٩/٧/١٩٧٠ز کرا پێش نوێژ و ووتارخوێن و دەرس بێژ لە مزگەوتی (الفضل) لە (بەغدا)، لە ٧/٤/١٩٧٣ز گواستراوە مزگەوتی فاروق لە گەڕەکی (ڕەصافە)، هەروەها دەرس بێژ بوو لە پەیمانگای ئیسلامی لە (بەغدا)، ماوەکی زۆر خەریکی وەعزدان بوو لە ڕادیۆی بەشی کوردی لە (بەغدا)، خەڵکێکی زۆر گوێی لێ دەگرت چونکە وەعزەکانی خۆش بوون، لە ١/٣/٢٠٠٢ز وەفاتی کرد، لە (بەغدا).

سەرچاوە: خۆری ئیسلام ٣١/ ٢٠٠٦ز، ٧٢ – ٧٤.

## عەمر مەیمون جزیری (١١٤٥)

ناوی عەمرە کوڕی مەیمونی کوڕی مەهرانی (جزیری)یە، زانایەکی فەرموودەناس و شەرع زان بووە، لە زانستەکانی عەرەبی شارەزا بووە، لە زانیاریەکانی قورئانی پیرۆز دەستی باڵا بووە، حەزی لە بەلاوکردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) کردووە، دەڵێن: فەرموویتی: {ئەگەر بزانم یەك وشەی فەرموودەی پێغەمبەرم (د.خ) لە (یەمەن) چەنگ دەکەوێ وە لای من نەبیت، ئامادەم بچم بۆ ئەوێ وەری بگرم، بەلاوی بکەمەوە}.

مامۆستا لەلایەن خەلیفە مەنصور ڕێزدار بووە، خزمەکان پێیان وت: داوا بکە خەلیفە پارچە زەوییەکت بداتێ، فەرمووی: خەلیفە خۆی چەندجار ئەوەی پێشنیار کردیە، من نەم ویستیە، ئێستا داواناکەم، ساڵی ١٤٥ك – ٧٦٢ز کۆچی دوایی کرد.

سەرچاوە: سير أعلام النبلاء ٥/١٩٦ – ١٩٧.

## عومەر نوح وانی (١١٤٦)

ناوی عومەرە، کوڕی نوحە، نازناوی (بەدرەدینە) خەڵکی (وان)ی کوردستانی ئێرانە ساڵی ١٦٦٣ز هاتووتەدنیا، مەزهەبی حەنەفی بووە، زانایەکی شەرع زان بووە، لە (وان) کرا موفتی حەنەفییەکان، لە ١١٢٦ك – ١٧١٤ز کۆچی دوایی کردووە.

دانراوەکانی: (أشرف الوسائل) و (أنيس الرمز) و (تواريخ الأئمة) و (القصيدة النونية) و (القصيدة الهائية).

سەرچاوەکان:

١. معجم أعلام الكورد ١٤٢.
٢. هدية العارفين ٥/٧٩٨.
٣. إيضاح المكنون ٣/٨٨.
٤. مشاهير الكورد ١/١٣٦.
٥. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤٠٨.

٦. معجم المؤلفين ٨/٥.

## عومەر یەعقوب هەولێری (١١٤٧)

ناوی عومەرە کوڕی یەعقوبی کوڕی عوسمانی هەولێرییە، نازناوی (تەقیەدینە)، زانایەکی ئەهلی تەسەووف بووە، بەشێکی زۆری لە فەرموودەکانی پێغەمبەر (د.خ) وەرگرتووە، ئیجازەی لە چەندان زانایانی سەردەمی خۆی وەرگرتووە، لە ڕۆژی جەژنی قوربانی ساڵی ٦٧٣ك – ١٢٧٥ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. شذرات الذهب ٥/٣٤١.

٢. الإكليل في محاسن أربيل ١٥٢.

٣. معجم أعلام الكورد ٥١٧.

## عیسا ئیبراهیم ماردینی (١١٤٨)

ناوی عیسایە کوڕی ئیبراهیمی کوڕی محەممەدی کوڕی ثەوبانی ماردینی یە، لە شەریعەت و ئوصول و نەحو شارەزا بووە، هەروەها شاعیر بووە (معالم السنن)ی ئیمامی بەیهەقی کورت کردیتەوە، ساڵی ٧٤٦ك – ١٣٤٥ز کۆچی دوایی کردووە.

سەرچاوەکان:

١. علماؤنا في خدمة العلم والدين ٤١٩.

٢. كشف الظنون ٢/١٧٢٦.

٣. هدية العارفين ٥/٨٠٩.

٤. معجم المؤلفين ٨/١٨.

## عیسا ئەبوبەکر ئەییوبی (١١٤٩)

ناوی عیسایە کوڕی ئەبوبەکری کوڕی ئەییوبە، ناسراوە بە (مەلیکی گەورە) برازای سوڵتان صەلاحەدینە، مەلیکی (دیمشق) و (شام) بووە، ساڵی ٥٧٦ك – ١١٨٠ز لە (قاهیرە) هاتەدنیا، لە (شام) پەروەردە بووە، قورئانی پیرۆزی خەتم کرد، شەریعەتی

